# بۆ ئەوەی باشتر لە قورئان تێبگەین

نوسینی

حەسەن علی بۆسکێنی

NOVEMBER 2, 2021



إِنَّا نَحۡنُ نَزَّلۡنَا ٱلذِّكۡرَ وَإِنَّا لَهُۥ لَحَٰفِظُونَ ٩

إِنَّ هَٰذَا ٱلۡقُرۡءَانَ يَهۡدِي لِلَّتِي هِيَ أَقۡوَمُ وَيُبَشِّرُ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ
ٱلَّذِينَ يَعۡمَلُونَ ٱلصَّٰلِحَٰتِ أَنَّ لَهُمۡ أَجۡرًا كَبِيرًا ٩





سوپاس و پێزانینم هەیە بۆ هەر برایەک کە هاوکارمان بوە
بە مادەو پێشنیار بۆ ئەوەی ئەم بەرهەمە بە دەستی
خوێنەری ئازیز بگا، بە تایبەت سوهەیبی کوڕم کە زۆر
لەگەڵی ماندو بوو





پێشکەشە :

بە هەموو ئەوانەی کە گرنگی بە قورئانی پیرۆز دەدەن لە ڕووی جوان خوێندنەوە، لەبەرکردن، کارپێکردن، گەیاندن، بەرگری لێکردن و جوان وێناکردن و قوڵبوونەوە لە ئامانجەکانی.





# پێشەکی

الحمد لله الواحد الاحد الصمد الذی لم یلد ولم یولد ولم یکن له کفوا أحد، والصلاة والسلام علیٰ نبیه أحمد وعلی آله وأصحابه الی الابد.

قورئانی پیرۆز تاکە پەیامی پەروەردگارە کە بەبێ دەسکاری کران ماوەتەوە و دەستی مرۆڤی پێ نەگەیشتووە بۆ ئەوەی لە مەرامی خۆی لابدرێ بەمەرەدی کتابەکانی تر بچێ، وە موعجیزەکانی ڕۆژانە زیاتر دەدرەوشێنەوە، وەکاریگەریەکانی لەسەر مرۆڤایەتی زیاتر دەردەکەوێ، وە قورئان ئەو کتابەیە کە زۆرترین ژمارەی لێ چاپ دەکرێ و پەخش دەکرێ، زیاتر لەهەر کتابێک دەخوێنرێتەوە، زیاتر لەهەر کتابێک فرمێسکی لەگەڵدەبارێ، زیاتر لەهەر کتابێک دراسە دەکرێ، هەتا لەلایەن نەیارەکانیشیەوە. وە زۆرترین دژایەتی دەکرێ و پارە و وزە سەرف دەکرێ بۆ ئەو مەبەستە، وە زۆرترین کاریگەری بووە بەسەر گۆڕینی مەساری مرۆڤایەتیدا، قورئان گەورەترین مرۆڤی پەروەردە کرد کە رەسول الله یە، وەگەورەترین شارستانیەتی دروست کرد لە ژیانی مرۆڤایەتی کە گۆڕانکاری لە هەموو بوارەکانی ژیانی مرۆڤایەتیدا بەدی هێنا، قورئانی پیرۆز کۆتا پەیامی پەروەردگارە بۆ مرۆڤایەتی، جا بۆ ئەوەی زیاترو باشتر لە ماناو مەبەستەکانی قورئانی پیرۆز تێبگەین بە پێویستم زانی نۆ تەوەری گرنگ باس بکەم:

تەوەری یەکەم: پێگەو گەورەیی قورئانی پیرۆز و قورئان خوێن.

تەوەری دووەم: چۆن لە خزمەت قورئان دابین و لە قورئان تێبگەین؟

تەوەری سێیەم: ئامانجەکانی قورئانی پیرۆز.

تەوەری چوارەم: کۆمەڵێک بنچینە بۆ ئەوەی پێی لە قورئانی پیرۆز تێ بگەین.

تەوەری پێنجەم: بابەتی (إعجاز) لە قورئانی پیرۆزدا.





تەوەری شەشەم: ڕوونکردنەوەیەک لەسەر(نسخ) لە قورئانی پیرۆزدا.

تەوەرەی حەوتەم: مانای وەحی و جۆرەکانی.

تەوەری هەشتەم: کۆکردنەوەی قورئان و ڕەواندنەوەی گومانەکان لەسەری.

تەوەرەی نۆیەم: جۆرەکانی تەفسیر و مەنهەجی ڕاڤەکاران.

وصلى الله وسلم على سيدنا محمد وعلى آله وسلم تسليما كثيرا





تەوەرەی یەکەم

## گەورەیی قورئان و قورئان خوێن

ئێمە گەورەیی قورئانی پیرۆز لە چەند رێگایەکەوە دەزانین:

١. لەرێی خاوەنی قورئانەوە کە خوای پەروەردگارە، وە پووختەی پەیامەکانی خوایی لە قورئاندا کۆکراوەتەوە.

٢. لە ڕێی پێغەمبەری ئازیز علیه الصـــلاة والســـلام، چونکە ئەو پەروەردەی قورئانی پیرۆزە، پێغەمبەر بە شـــایەتی دوژمنانیش بەهێزترین و کاریگەرترین مرۆڤ بووە، گەورەترین گۆرانکاری ڕیشـــەی لە ژیانی مرۆڤایەتیدا دروســـت کردووە.

٣. شاگردەکانی قورئان، لە هاوەڵان و شوێن کەوتوان و زانایان.

٤. ئەو پەرتوکانەن کە تایبەت لەسەر قوڕئان و گەورەیی قورئان نوسراون.





## پێناسەی قورئانی پیرۆز

قورئان چیە؟

قورئانی پیرۆز لەوە گەورەترە کە پێناسە بکرێ، بەڵام بۆ تێگەیشتن چەند پێناسەیەکیان کردووە، لە هەموویان گشتگیرتر ئەم پێناسەیەیە کە دەفەرموێ: القران "كلام الله، المُنــزّل على نبيه محمد ، المعجِز بلفظه، المُتعبَّد بتلاوته، المنقول إلينا بالتواتر، المكتوب في المصاحف المبدوء بسورة الفاتحة والمختوم بسورة الناس.

واتە:

- ❖ قورئان کەلامی خوایە
- ❖ دابەزیوە بۆ سەر نێردراوەکەی کە موحەمەدە عليه الصلاة والسلام
- ❖ دەستەوستان کەرە بە وشەکانی
- ❖ خوێندنەوەی پەرستشە و بەندایەتییە
- ❖ بە تەواتور بۆمان گوازراوەتەوە
- ❖ لە پەڕاوەکاندا نوسراوەتەوە
- ❖ بە سورەتی فاتیحە دەست پێدەکا، بە سورەتی ناس کۆتایی پێدێ

٢. قورئان خاوەنی چەندین ناو و سیفەتە کە ئێمە هەندێکیان باس دەکەین لەوانە:

- ✓ القرأن
- ✓ الذكر
- ✓ الكتاب
- ✓ التنزيل
- ✓ الفرقان

ئەوانە ناوەکانی قورئانی پیرۆزن.





هەروەها قورئانی پیرۆز بە چەندین سیفەت وەسف کراوە لەوانە:

پێی وتراوە:

- ✓ أيات
- ✓ بلاغ
- ✓ أحسن الحديث
- ✓ الحق
- ✓ صحف
- ✓ الصدق
- ✓ عربي
- ✓ عزيز
- ✓ عظيم
- ✓ علي
- ✓ القول
- ✓ قيم
- ✓ كلام الله
- ✓ كلمات الله
- ✓ متشابه
- ✓ مجيد
- ✓ مهيمن
- ✓ الوحي

کۆمەڵێک ناوی تر مانای بەیان و ئیرشاد دەگەیەنێ کە هەر وەسفی قورئانن:

- ✓ بشير
- ✓ بصائر
- ✓ محكم
- ✓ حكيم
- ✓ حكمة
- ✓ ذكرى





- ✓ تذكرة
- ✓ مفصل
- ✓ تفصيل
- ✓ موعظة
- ✓ نذير
- ✓ هدى
- ✓ خير
- ✓ رحمة
- ✓ شفاء
- ✓ عجبا
- ✓ كريم
- ✓ مبارک
- ✓ مثانی
- ✓ نور

ئەم وەسفانە ڕای ڕاست ئەوەیە کە بۆ قورئان بەکار هاتبن:

- ✓ روح
- ✓ شاهد
- ✓ العلم
- ✓ القصص
- ✓ مسطور
- ✓ نبأ عظیم

ئەمانەش لێک دراونەوە بە وەســـفی قورئان، بەڵام زۆر یەکلایی کەرەوە نیە وەك:

- ✓ إمام
- ✓ برهان
- ✓ حبل الله
- ✓ الزبور





- ✓ صراط مستقيم
- ✓ الطيب
- ✓ العروة الوثقى
- ✓ النجوم
- ✓ الميزان
- ✓ مناد
- ✓ الكوثر
- ✓ رحمة الله
- ✓ فضل الله
- ✓ الغيب

وەک وتمان ئەمانە زیاتر بە واتای غیری قورئان بەکارهاتوون واتە ڕای راجح ئەوەیە وەسفی قورئان نینە، هەر چەند هەندێك لە ڕاڤەکارانی قورئان وایان وتووە.

ئەو ناوانەش خلافیان لەسەرە کە وەسفی قورئان بن، بەڵام مانع نیە کە بەو واتایەش لێك بدرێنەوە وەك:

- ✓ الأثارة
- ✓ أمرالله
- ✓ تبصرة
- ✓ الحجة
- ✓ الرسالة
- ✓ شرعة ومنهاجا
- ✓ القسط
- ✓ النعمة

گوومان لەوە دا نیە کە هەموو ئەو ناو و سیفەتانە چ ئەوەی یەک دەنگی لەسەرە، چ ئەوەی ڕاجیایی لەسەرە، بە جوانترین شێوە لە قورئانی پیرۆزدا هاتوونە دی.





## ئەدەب لە خزمەت قورئانی پیرۆزدا

١. نیەتی خۆمـان لە خزمەت قورئـانی پیرۆز یەکلایی بکەینەوە، ئیخلاس بۆ خوا ڕوحی هەموو کارە باشەکانە، هۆکاری بەرز بوونەوەی کردەوەکانە.

٢. داوای پاداشت کردن لە خوا، واتە بۆ ئەوە بیخوێنین پاداشتی لای خوامان هەبێ، کە بەهەر حرفێک دە چاکەمان بۆ دەنوسرێ.

٣. بە دەست نوێژ و پاکیەوە قورئان بخوێنین.

٤. ڕوو لە قیبلە بکەین، واچاکترە دەنا واجب نیە.

٥. ئەگەر بکرێ بە دانیشتنەوە بیخوینین.

٦. پێشتر سیواك بکەین.

٧. بە تەجویدەوە قورئان بخوێنین.

٨. دەنگی خۆمان خۆشبکەین بە پێی توانا.

٩. لەگەڵ ئایەتەکانی قوڕئان دا کاریگەر بین.

١٠. گریان زۆر باشە و ئادابێکی گەورەیە لە خزمەت قورئان دا.

١١. ورد بوونەوە و تێڕامان لە سورەت و ئایەت و وشەکان و هەتا پیتەکانیش.

١٢. لە سەرەتا دا أعوذ باﷲ و بسم ﷲ کردن.

١٣. بە دەنگ بیخوێنین.

١٤. بەدڵێکی تەواو ئامادە قورئان بخوێنین.

١٥. زیـادەڕەوی نەکردن لە تجویـدی قوڕئـان بە حەدێـك هیچ خۆشـــی و نەغمەیەکی نەمێنێ.





١٦. له سێ ڕۆژ کەمتر قورئان خەتم نەکەین، مەگەر بۆ کەسانێك زۆر ماهیرو بە توانابن.

١٧. زوو زوو بەسەر کردنەوە و دووبارە کردنەوەی ئەوەی لە بەرمان کردووە.

١٨. کارکردن بە قورئان.

١٩. گەیاندن و خزمەت کردنی قورئان.

٢٠. فێربون و فێرکردنی قورئان.

٢١. بەرگری کردن بە هەمووشێوەیەک لە قورئان.

٢٢. داوا نەکردنی دونیا بە قورئان.

٢٣. ئەو کاتە قورئان بخوێنین کە دڵمان لەسەریەتی و بە ئاگایە.

٢٤. پارێزگاری کردن لەو ئایەت و سورەتانەی کە ویرد و سونەتن.

٢٥. ئەگەر بکرێ بە کۆمەڵ قورئان بخوێنین یان جار جار وابکەین باشە.

٢٦. لە مزگەوت دا باشترە.

٢٧. لەناو نوێژ دا قورئان خوێندن زۆر باشترە.

٢٨. بە گەورەگرتنی قورئان چونکە شیعاری دینە.

٢٩. بەرزبونەوە بە هۆی قورئانەوە.

٣٠. هەموو هۆکارەکانی تێنەگەیشتن لە ورد بوونەوەی قورئان لاببەین.

٣١. وابزانی کە قورئان تەنیا بۆ خۆت دابەزیوە.

٣٢. شەرم کردن لە خاوەنی قورئان.





٣٣. لەکاتی قورئان خوێندن خۆمەشــغوڵ نەکردن بە مۆبایل و تەلەفزیۆن و شتی تر.

٣٤. گوێگرتن لە قورئـان خوێنەکـان بۆ ئەوەی هەڵەکـانی خۆت ڕاســـت بکەیتەوە وسوودیش لەوان وەر بگری.

٣٥. ڕێز بگرین لە ئەهلی قورئان.

٣٦. هەڵس و کەوتمان قوڕئانی بێت.

٣٧. رێز لەوانە بگرین کە دێن بۆ قورئان خوێندن.

٣٨. خوێندنەوەی لانی کەم تەرجومەکانی قورئان.

٣٩. دوعاکردن بۆ ئەوەی ئەهلی قورئان بین، لە ژێر ئالاَی قورئـاندا حەشـــر بکرێن.

٤٠. گرینگی دان بە مەدرەسەو ناوەندەکانی قورئان خوێندن .

**ئەرکەکانمان بەرامبەر قورئانی پیرۆز:**

- جوان خوێندنەوە
- جوان تێگەیشتن
- جوان کارپێکردن
- جوان گەیاندن
- جوان بەرگری لێکردن و وێناکردن





## گەورەیی قورئان خوێندن

١. قورئان گەورەترین ڕەحمەت و بەخشـــشـــی خوایە بۆیە دەبێ دڵمان پێ خۆش بێ: قُلْ بِفَضْلِ اللَّهِ وَبِرَحْمَتِهِ فَبِذَٰلِكَ فَلْيَفْرَحُوا هُوَ خَيْرٌ مِمَّا يَجْمَعُونَ (یونس:٥٨)

٢. قورئان یەکێکە لە گەورەترین بازرگانیەکان: إِنَّ الَّذِينَ يَتْلُونَ كِتَابَ اللَّهِ وَأَقَامُوا الصَّـلَاةَ وَأَنْفَقُوا مِمَّـا رَزَقْنَـاهُمْ سِرًّا وَعَلَانِيَـةً يَرْجُونَ تِجَـارَةً لَنْ تَبُورَ(فـاطر:٢٩) واتە: بەراستی ئەوانەی کە کتێبی خوا دەخوێنەوە و بە چاکی، نوێژیان بەجێ هێناوە وە لەوەی کە پێمـان داون بە نهێنی و ئـاشـــکرا دەیبەخشـــن چـاوەڕوانی بازرگانیەکن هەرگیز زەرەر ناکەت.

٣. ئەهلی قورئان ئەهلی خوایە: قال رسـول الله صـلى الله عليه وسـلم: إنَّ للَّهِ أَهْلينَ منَ النَّاس قالوا : يا رسـولَ اللَّهِ ، مَن هُم ؟ قالَ : هُم أَهْلُ القرآنِ ، أَهْلُ اللَّهِ وخاصَّتُهُ. حكم الديث: صحيح. سنن ابن ماجه.

٤. قورئان خوێندن ناو و ناوبانگە لە ئاســـمان و زەوی: أن رجلا جاءه، فقال: أوصني. فقال: سألتني عما سألت عنه رسول الله – صلى الله عليه وسلم – من قبلك. أوصـيك بتقوى الله فإنه رأس كل شـيء ، وعليك بالجهاد فإنها رهبانية الإســلام، وعليك بذكر الله وتلاوة القرآن، فإنه روحك في الســماء وذكرك في الأرض. مسند أحمد.

٥. ئەو کەسەی قورئان فێردەبێ و خەڵکی فێردەکات باشترین کەسە: خيركم من تعلم القران و علمه. رواه البخاری.

٦. قورئان تکاکارە بۆ خاوەنەکەی: اقرءوا القرآن فإنه يأتي يوم القيامة شفيعا لأصـحابه اقرءوا الزهراوين البقرة وسـورة آل عمران فإنهما تأتيان يوم القيامة





كأنهما غمامتان أو كأنهما غيايتان أو كأنهما فرقان من طير صــواف تحاجان عن أصحابهما اقرءوا سورة البقرة فإن أخذها بركة وتركها حسرة ولا تستطيعها البطلة قال معاوية بلغني أن البطلة السحرة وحدثنا. رواه مسلم.

٧. سورەتی بەقەڕە و ئالی عمران لە شێوەی دووپەڵە هەور، یان سێبەر، دوو پۆلە تەیر، بەرگری دەکەن لە خاوەنەکانیان.

٨. مرۆڤی مســوڵمان بەهۆی قورئان بەرز دەبێتەوە: ان الله تعالى يرفع بهذا الكلام أقواما ويضع آخرين. سنن الدارمی.

٩. ئەو کەســەی قورئانی پیرۆزی لەبەرکردووە لە قیامەت دا هەر ئایەتێک بخوێنێ بەرزتر دەبێتەوە: يُقالُ لصـاحِبِ القرآنِ اقرأ وارتَقِ ورتِّل كما كنتَ ترتِّلُ في الدُّنيا فإنَّ منزلَكَ عندَ آخرِ آيةٍ تقرؤُها. حكم الحديث: حسن صحيح. سنن أبى داود.

١٠. ئەوکەسـەی لە قورئان ماهرو شـارەزایە لەگەڵ فریشـتە بەرزو بەریزەکان دایە: صحيح البخاري – كتاب التوحيد – باب قول النبي صلى الله عليه وسلم {الَّذِي يَقْرَأُ القُرْآنَ وَهُو ماهِرٌ بِهِ معَ السَّفَرةِ الكِرَامِ البَرَرَةِ.} رواه البخاري.

١١. ئەو کەسەش کە گرینگی بە دەنگی دەدات و دەیەوێ قورئان لای خەڵکی جوان بکات و خۆشـــەویســتی بکات، هەر لەهەمان پلە دایە: زيِّنوا القرآنَ بأصواتِكم. رواه البخاري.

١٢. بەرەکەتی قورئان ئەوەندە بەسە کە بە هەر پیتێک دە خێرت دەگاتێ: من قرأ حرفًا من كتابِ اللهِ فله به حسنةٌ، والحسنةُ بعشرِ أمثالِها لا أقولُ (الـــم) حرفٌ ولكنْ (ألفٌ) حرفٌ و(لامٌ) حرفٌ و(ميمٌ) حرفٌ. و رواه الترمذی.

١٣. هەرکەس حەز دەکات خواو پێغەمبەر خۆشــیانی بوێ با لە مصــحف قورئان بخوێنێ.





١٤. تەنانەت تەماشاکردنی قورئان عبادەتە.

١٥. ئەوەی کە منداڵەکەی قورئان خوێنە تاجی رێزو ویقاری لەسـەر دەکرێ و بە جۆرەها جلو بەرگی ئاوریشم و تایبەت دەڕازێندرێتەوە.

*ئەی پەروەردگارا بە ئەهلی قورئانمان حساب بفەرمووی*





## ئادابەکانی فێرخوازو فێرکاری قورئان

معلم: فێرکاری قورئان زۆر گەورەو بەرێزە، پێویســـتە و واچاکە خاوەنی ئەو ڕەوشت و ئاکارانە بێ:

- ✓ کارەکەی بۆ خوا بێت بۆ ئەوەی دووربێ لە ڕیاو ڕوپامایی.
- ✓ قورئان فێرکردن نەکرێ بە پیشەی خۆ پێ ژیاندن، ئەگەر کەسەکە هەموو ژیانی بۆ ئەوە تەرخان کرد دروستە هاوکاری بکرێ.
- ✓ خۆ ڕازانەوە بە ڕەوشتی بەرز.
- ✓ چاکەکردن لەگەڵ فێرخوازەکان.
- ✓ دەربڕینی دڵسۆزی بۆ فێرخوازەکان.
- ✓ بە گەورە گرتنی زانست و نەکردنی بە خزمەت کاری ستەم کاران.
- ✓ فراوان کردنی کۆڕی زانست بۆ فێر خوازەکان.





## ئادابەکانی فێرخواز

- ✓ یەکلابوونەوە بۆ خودا و بە گەورە گرتنی قورئان.
- ✓ دڵ پاککردنەوە لە حەسودی و کینەو بوغز.
- ✓ تەقواو پارێزکاری.
- ✓ سوربوون لەسەر فێربوون.
- ✓ خۆ ڕازاندنەوە بە ئەخلاقی قورئان.
- ✓ گەران بەدوای مامۆستای زانا و دڵسۆز.
- ✓ بە جوانترین شێوە لەخزمەت زانست و مامۆستا دابێ.
- ✓ هاوکات هەوڵبدات بە پێی توانا لەگەڵ فێربوون فێرکاریش بێ.
- ✓ بۆ ئامانجی بچوک و دونیاوی نەخوێنێ چونکە ئەگەر بۆ خوا بوو هەم دینەو هەم دونیایە.
- ✓ ڕەوشت بەرزی لەگەڵ هاوڕێکان.
- ✓ ڕەچاو کردنی ئادابەکانی قورئان.
- ✓ زوو ئامادەبوون لە کۆڕی زانست فێربوون.
- ✓ بێدەنگی و ویقار زۆر گرینگە، نەوەك هەڵەشەیی و زۆر بڵێیی.
- ✓ هەتا بکرێ ترسان لە خوا و گریان بە کاریگەربوون بە قورئان.
- ✓ شەو نوێژ و زیکر و نزای زۆر.
- ✓ زۆر خوێندنەوە و ئامادەکردنی دەرسەکان بە جوانی.
- ✓ بە ڕۆژو بوونی سونەت زۆر کاریگەرە بۆ زیاتر کاریگەر بوون بە قورئان.
- ✓ بە سەرکردنەوە و وتنەوەی قورئان.
- ✓ هەر لەسەرەتای تەمەنەوە گرنگی دان بە لەبەرکردنی قورئان.
- ✓ خوێندنەوەی چەند تەفسیرێکی خاوێن و ڕەوان دەربارەی قورئان. شتی تریش زۆرە بەڵام ئەم ئادابانە زۆر گرینگن.



## تەوەرەی دووەم

### چۆن لە خزمەت قورئان دابین و لە قورئان تێبگەین؟

١. دەبێ لەوە تێبگەین لە قورئان ڕاستر و ڕەوانتر و کاریگەرتر و پارێزراوتر لە زەوی دا نیە، بۆیە دەبێ شانازی بە قورئانەوە بکەین و زۆر دڵمان پێی خۆش بێ: يَا أَيُّهَا النَّاسُ قَدْ جَاءَتْكُمْ مَوْعِظَةٌ مِنْ رَبِّكُمْ وَشِفَاءٌ لِمَا فِي الصُّدُورِ وَهُدًى وَرَحْمَةٌ لِلْمُؤْمِنِينَ (يونس: ٥٧) قُلْ بِفَضْلِ اللَّهِ وَبِرَحْمَتِهِ فَبِذَلِكَ فَلْيَفْرَحُوا هُوَ خَيْرٌ مِمَّا يَجْمَعُونَ (يونس : ٥٨)

واتە: ئەی موحەممەد(صلى الله عليه وسلم) بڵێ هەر بەهۆی چاکەو میهرەبانی خواوەیە جا کەواتە با بەوە دڵخۆش بن ئەوە چاکترە (بۆیان) لەوەی کۆی دەکەنەوە لەشتی ئەم دنیایە.

٢. دەبێ دووربین لە هەجری قورئان، هەجری قورئان بەس بە نەخوێندن نیە بەڵکو نەخوێندن و تێنەگەیشتن و کارپێ نەکردن و حوکم پێ نەکردن و نەگەیاندن و بەرگری لێنەکردنیش دەگرێتەوە، هجر تاوانێکی گەورەیە وەك خوای گەورە دەفەرموێ: وَقَالَ الرَّسُولُ يَا رَبِّ إِنَّ قَوْمِي اتَّخَذُوا هَذَا الْقُرْآنَ مَهْجُورًا (الفرقان: ٣٠) واتە: وە پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) وتی ئەی پەروەردگارم بەڕاستی قەومەکەم (قورەیش) ئەم قورئانەیان واز لێهێناوەو گوێی پێ نادەن.

٣. دەبێ بزانین ئەم قورئانە لە سەرەتا کە هات حەزارەیەکی سەربەخۆ و گەورە و جوانی دروستکرد، دەبێ هەڵسوکەوتمان لە گەڵ قورئانی پیرۆز بەهەمان تێگەیشتن و ڕوحیەت بێ، چونکە ئەو قورئانە لە زەمەنی ئێستادا دەتوانێ بەخششی زیاتر لە ڕابردوو بە ئێمە ببەخشێ، بەهۆی ئەو هەموو ئامرازانەی کە لەبەردەستماندا هەن بۆ تێگەیشتن و گەیاندن، لە ڕابردوو هەمیشە دەسەڵات دارەکان کۆسپو لەمپەربوون لە ڕێی گەیاندنی دین، بەڵام



له ئێستادا دەکرێ لەگەڵ هەموو دونیادا قسەبکەی و پەیامی خۆت بگەیەنی، دەتوانی هەموو سنوورەکان بشکێنی وەک دەڵێن دونیا بۆتە شاشەیەکی بچوك نەوەك گوندێکی بچوك.

٤. پێویستە زۆر گرینگی بە زمانی عربی بدەین، چونکە زمانی عربی کلیلی تێگەیشتنی قورئانی پیرۆزە، بەڵام ئامانج لە فێربونی عربی خزمەتی قورئان بێ دەنا فەرقی کوردی و تورکی و عربی نیە ئەگەر بۆ خزمەتی قورئانی پیرۆز نەبێ، بە داخەوە لە ڕابردوو بەرهەمی بەشێک لەو کەم تەرخەمی و خەراپ تێگەیشتنەمان لە فێربوونی زمانی عربی بینی و باجیشمان دا، ئەگەر پیاوانێکی وەك مەلای گەورە و مامۆستای مدرس و زەڵمی نەبوونایە زیانی زۆر زیاترمان دەکرد.

٥. گرینگی دان بە زانستی قورئانی پیرۆز لەمڕۆدا، چونکە ئەم زانستە دەرگایە بۆ تێگەیشتن لە قورئانی پیرۆز، بەڵام دەکرێ وێڕای سود بینین لە پەرتوکەکانی وەك (الاتقان وە کتابی البرهان) سود لە پەرتوکە تازەکانیش وەربگرین وەك: مناهل العرفان ی الزرقانی، مباحث في علم القران، مناع القطان، علوم القران ی صبحی صالح و زۆری تریش کە لەمڕۆدا نوسراون دەربارەی زانستەکانی قورئان.

٦. گرینگی دان بە ڕەواندنەوەی گومانەکان لەسەر قورئانی پیرۆز، چ ئەو نوسین و لێکۆڵینەوانەی کە جولەکە و مەسیحیەکان پێیەوە هەستاون و نوسیویانن، یان ئەوانەی خزمەت کارەکانی ئەوان نوسیویانن لە ملحیدی کوردی و عربی و زمانەکانی تریش، چونکە بەشێک لە گەنجان بە هۆی ئەم گومانانە گومڕابوون و سەریان لێ شێواوە، لانی کەم ئەگەر نەبووبنە مولحیدیش گومانیان لا دروست بووە بەهۆی ئەم هێرشە چڕەی کە کراوەتە سەر قورئانی پیرۆز، لەڕاستیدا ئەمە پێویستی بە ناوەندی ئەکادیمی هەیە بۆ ئەوەی فریای ئەم کارانە بکەوێ و وەك پێویست ڕێگای لێ بگرێ.





٧. بواری میدیا، تۆڕە کۆمەڵایەتیەکان لەمڕۆدا بوونە سـوڵتەی یەکەم بەسـەر عەقڵ و ڕۆشـــنبیری تـاک و کۆمەڵگادا بۆیە نـابێ ئەم بابەتە فەرامۆش بکرێ ئەگەر بمانەوێ خزمەتی تەواو بە قورئانی پیرۆز بکەین.

٨. دەست خۆشـی کردن و هاندانی ئەوانەی بەهەر جۆرێک خزمەتی قورئانی پیرۆز دەکەن لە حزب و ڕێکخراو سەنتەر و گەنج و ما مۆستایان و نووسەران.

٩. هاندانی دەوڵەمەند و خوا پێداوەکان بۆ ئەوەی لەم بوارەدا خزمەت بکەن، وە پێویستە دەوڵەمەندی مسوڵمان ڕۆشـنبیر بکرێ کە ئەم خزمەتانە هیچیان لەدروست کردنی مزگەوت کەمتر نین.

١٠. سـەرنجمان تەنیا لەسـەر قورئان خوێندن نەبێ، بەڵکو دەبێ لەوەش زیاتر سـەرنجمان لەسـەر تێگەیشـتن لە قورئان بێ، وە لەوەش زیاتر سـەرنجمان لەسەر پەروەردەی قورئانی بێ، وە دەبێ کاربکەین بۆ دروست کردنی بانگخوازی بەتوانـا، چونکە ئێمە دەبێ ئەوە بزانین کە خزمەتی قورئـان بەتەنیـا بەئێمە ناکرێ، وە زۆر کەسیش هەن دەیانەوێ خزمەت بکەن بەڵام نازانن چۆن.

١١. دەبێ بزانین ئەو قورئانە پیرۆزەی ئێمە ناحەزی زۆری هەن لەدەرەوە و لە نـاوەوە، بۆیە دەبێ هەردوو سـەنگەرەکە بەهێز بکەین، وە زیـاتریش گرنگی بەسـەنگەری ناوەوە بدەین، چونکە ئەگەر ناحەز لەناو ماڵی خۆت دابێ ناتوانی بەســەر نـاحەزانی دەرەوە دا زاڵبی، خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ عَلَيْكُمْ أَنفُسَكُمْ لَا يَضُرُّكُم مَّن ضَلَّ إِذَا ٱهْتَدَيْتُمْ إِلَى ٱللَّهِ مَرْجِعُكُمْ جَمِيعًا فَيُنَبِّئُكُم بِمَا كُنتُمْ تَعْمَلُونَ﴾ (المائدة: ١٠٥) واتە: ئەی ئەوانەی بڕواتان هێناوە هۆشـــتان بە خۆتانەوە بێت زیانتان پێ ناگەیەنێ ئەوەی گومڕابووە ئەگەر ئێوە لەســەر ڕێی ڕاسـت بن (بەرگری کردن لەخراپە بەشـێکە لە ڕێنموونی وەرگرتن) هەر بۆ لای خوایە گەڕانـەوەی هـەمووتـان بە گشـــتی ئینجا هـەواڵتـان پێ ئـەدا بـە هـەر کردەوەیەك کە کردووتانە.





١٢. زۆر پێویستمان بەوەیە ئەوانەی خزمەتی قورئانی پیرۆز دەکەن وێنایەکی جوانی قورئان بکەن، ڕەوشـــت بەرزبن، ئارامگربن، لێبوردەبن، بەخزمەت بن، خۆ بەکەم گربن، بەوەفـابن، جـددی بن، تەمبەڵ نەبن، بـار نەبن بەســـەر کۆمەڵگاوە، سـەر ڕاسـت و ڕاسـت گۆ بن، لەگەڵ ئەندامانی خێزان زۆر بەڕێز و خۆشی بەخش بن، بەخشەرو دڵئاوابن، لە دراسەو وەزیفە و پیشەدا زیرەک و دەست پاک و دڵپاک بن... بۆ ئەوەی قورئان لای خەڵک خۆشەویست کەن.

١٣. زۆر ســـود وەربگرین لەمناڵەکان، وە تـازە پێگەیشـــتوان چونکە ئەوانە دەتوانن هیوای دوا ڕۆژ بن، لە کۆمەڵگای ئێمە منداڵ نزیکەی(٤٠٪)ی کۆمەڵگا پێـک دێنێ، چ کەســێـک بتوانێ بەســـەر منـداڵ ڕابگـا، ئەوە داهـاتوی ئەو کۆمەڵگایە بۆ ئەوە.

١٤. گرنگی دان بەلەبەر کردنی قورئان بۆ هەموو تەمەنەکان بەتایبەت گەنجان و منالان، وە سود وەربگیرێ لەم تەکنەلۆجیاو شێوازە تازانەی کە لەمڕۆد هەن.

١٥. دەبێ بزانین چۆن هەڵس و کەوت بکەین لەگەڵ ئەو مەدرەسانەی کە لە ڕابردودا هەن جا مدرەسەی تفسیر بێ، یان حەدیث بێ، یان فقە بێ، یان اصول بێ، یان کلام بێ، یان تصـــوف بێ، یان مەدرەســـەی زمانەوانی و ئەدەب بێ، هەموو ئەو مەدرەسانە ئیجابیات و هەندێک سەلبیاتیشیان تێ کەوتووە دەبێ زۆر بەوریای لەگەڵیان هەڵسوکەوتو مامەڵە بکەین بکەین.

١٦. گرفتێکی گەورە کە لە تەفســیردا هەیە خوڕافیاتی زۆری تێکەوتوە جاری وایە زانا گەورەکانیش بەبێ توانج و قســـە لەســـەر کردن لێی بێدەنگ بوون، دواتر وەچە لەدوای وەچە گوازراوەتەوە وە زۆرێک لەخەڵک وەک دین لەگەڵی هەڵسوکەوت دەکەن.





١٧. یەکێک لەگرفتەکان تەفسیر بە ئەثەرە، کە زۆر جار قورئان بەفەرمودەی لاواز ڕاڤەکراوە خوێنەر وادەزانێ ئەمە دوا واتاو ڕاسترین تەفسیری قورئانە، ئەمە بۆتە هۆی ئەوەی کە ئاسۆی فراونی قوڕئان تەسک بێتەوە.

١٨. یەکێک لەگرفتەکان ئەوەیە کە هەندێک خەڵک پێی وایە دەبێ بۆ ڕاڤەی قوڕئان حەتمەن بگەڕێینەوە بۆ بۆچوونی زانایانی پێشین، لەکاتێک دا بەشی هەرە زۆری قوڕئان باسی بونەروەر و سروشت و ئاسمان و زەمین و زیندەوەر و ڕوەک و شتەکانی تر دەکا، ئاخر چۆن دەکرێ بۆ ڕاڤەی ئەم بابەتانە بگەڕێینەوە سەر ڕای زانایانی پێشوو؟!

١٩. بۆ تێگەیشتن لە قوڕئان پێویستە ئەو تەفسیرە سەردەمیانە بخوێنینەوە کە تەفسیری زانستیان کردوە بۆ ئایەتەکان.

٢٠. دەبێ بۆ تەفسیری قوڕئان پشت بەو فەرمودانە ببەستین کە (صحیح)ن بۆ ئەوەی بێ بەش نەبین لەفراوانی و گشتگیری قوڕئان.

٢١. دەبێ لەکاتی ڕاڤەکردنی قوڕئان بەبابەتی زانستی وریا بین، زانستەکە گریمانەی و بیردۆزە نەبێ، ئەگەر بابەتە بەناو زانستیەکە، یان بیردۆزەکە پشت ڕاست نەکرابۆوە دەبێ وریایی بدەین.

٢٢. نابێ ملی ئایەتەکان بادەین بۆ ئەوەی لەگەڵ قسەی فلان و بیردۆزەی فلاّن بێتەوە.

٢٣. دەربارەی تەفسیری زانستی بۆ قوڕئان زانایان بوونە سێ بەشەوە

- یەك: بەشێک لە ڕاڤەکاران ئەو بوارەیان زۆر تەسک کردۆتەوە خۆیان بێ بەش کردووە لەو هەموو زانستە زۆر و زەوەندەی کە خزمەتی ڕاستەوخۆ بە قورئانی پیرۆز دەکات.





- ❖ دوو: بەشـــێک لە ڕاڤەکاران زۆر زیادە ڕەویان کردووە لە مامەڵە لەگەڵ زانسـتی سـەردەمدا، هەتا وایان لێهاتووە بەشـێک لە بیردۆزە و گریمانەو زانستی هەڵەیان کردووە بە ڕاڤەی قورئان.
- ❖ سێ: بەشێک لە زانایان مامەڵەی دروستیان لەگەڵ تەفسیری زانستیدا کردووە بەوەی کە نە هەمووشـــتێکیان بەناوی زانســـت وەرگرتوە، وە نە هەمووشیان ڕەتکردۆتەوە.

٢٤. زانستە ئیسلامیەکان تەواوکارین بۆ یەکتر، بۆیە ئەو کەسەی دەیەوێ لە قورئان بەهرەمەند بێ دەبێ لەزانستەکانی تریش شارەزایان هەبێ، وەک زمانی عربی، نحو، صرف، بلاغە، زانستی قورئان، زانستی فەرمودە و فەرمودە، ئوصولی فقە...

٢٥. دەبێ سـودمەند بین لە جۆرەکانی تفسـیر چ ڕیوائی بێ، یان بەیانی، یان فقهی، یان زانسـتی بێ، یان ئوسلوبی، یان فلسفی و کلامی بێ، یان مقاصدی بێ، یان تصـــوفی بێ، مەبەســـت ئەوە نیە کە هەمووکەس بتوانێ ســـود لە هەموویان وەربگرێ بەڵام بۆ تەواو بەهرەمەندبوون، دەبێ ســـود لە هەموویان وەربگرین.

٢٦. دەبێ کۆکردنەوە بکەین لە نێوان سـونەتە کەونی و شـەرعیەکان، چونکە هەردووکیان یەک ســەرچاوەیان هەیە و خاوەنی هەردووکیان خوای گەورەیە، هیچ نـاکۆکیـان لەنێوانـدا نیە، ڕەچـاو نەکردنی هەر کـامێکیـان بەجێمـانە لەکاروانی ژیان و لە پێش کەوتن.

٢٧. هەر ڕاڤەکارێک لایەنێک یان چەند لایەنێکی پێوە دیارە بەڵام دەبێ دڵنیا بین ئەمە ڕاڤەی تەواوی قورئان نیە، ئەمە گرنگی دانە بە لایەنیک یان چەند لایەنێکی  قورئان نەوەک هەموو لایەنەکانی قورئان.





٢٨. قورئـان بەرنـامە و کەلامی خوایە بۆ مرۆڤـایەتی، کەوابێ هەرچی مرۆڤ پێویستی پێ بێ باسی کردوە.

لایەنی بوون ناسی بەشی هەرە زۆری پانتایی قورئانی گرتووە بۆیە دەبێ زۆر گرنگی بەلایەنی بوون ناسی بدەین، سەربوردە و چیرۆک گرنگی خۆی هەیە لە قورئان دەبێ بزانین ئامانجی چیەو چ پەروەدەیەکی لەپشتە.

٢٩. دەبێ ســـود وەربگرین لە تەفســـیرە بابەتیەکان کە دەربارەی قورئـان نوسراون (التفسیر الموضوعی) چونکە ئەوانە توانیویانە ڕێگای دوور و درێژ بۆ ئێمە کورت بکەنەوە بە دراســـە کردنی هەموو لایەنە گرنگەکانی بابەتەکە یان زۆربەی لایەنەکانی بابەتەکە.

٣٠. دەبێ بەردەوام هۆکارەکان لەبەرچاو بگرین دەبێ ڕێزیان لێ بگرین، نابێ وەلایان بنێین، بەهۆی تێگەیشتنی هەڵە لە قەدرو لە هۆکارەکان، ڕۆژانێک بوو بڕوابوون بە قەدەر هۆکاری بەهێزی و پێشـــکەوتن بوو بۆ مســـوڵمانانان، وە ســـڵیان نەدەکردەوە و نەدەترســـاین لە ئیمپراتۆریەتە زەبەلاحەکان، ئەوپەری تێکۆشـانیان دەکرد، لەڕیزی پێشـەوەی مرۆڤایەتی بوون و داهێنانیان دەکرد، بەڵام ئێستا بەبیانوی بڕوابوون بەقەدەر هۆکارەکانمان وەلا ناوە، دوا کەوتوین، پشـــتمان لێکردۆتەوە، بۆیە کە خۆمان بەراورد دەکەین بەخەڵکانی تر دەبێ بۆ حاڵی خۆمان بگرین بەداخەوە.

٣١. تێگەیشـــتن لە ســـونەت و هۆکارەکان بەس نیە دەبێ لە زانینەوە بەرەو بەکارهێنان و تەسخیرکردنی ببەین، سودێکی نیە ئەگەر بزانین بەڵام نەتوانین بەکاری ببەین، بۆیە وەڵاتانی پێشـکەوتو گرنگی زۆر بە لێکۆڵینەوەی کردەیی و داهێنان دەدەن.

٣٢. ڕاست کردنەوەی مەنهەجی دراسەکردنی زانستە ئیسلامیەکان بەتایبەت و بەتایبەت تر ئەوەی کە پەیوەندی بە تێگەیشـتن بە قورئانی پیرۆزەوە هەیە،





بەش کردنی زانست بۆ ئیسلامی و غەیرە ئیسلامی زۆر راست نیە مەگەر بۆ تێگەیشتن نەبێ لە بابەتەکان بەو شێوەی باسم کرد، تەجویدی قورئان بەس نیە، زانستی قراءات بەس نیە، لەبەرکردی قورئان بەس نیە، دەبێ سەنتەری زۆر بکەینەوە بۆ تێگەیشتن و دراسە کردنی قورئان، بۆ تەتبیق کردن و گەیاندنی قورئان، بۆ جوان وێناکردن و خۆشەویست کردنی قورئان.

٣٣. دەبێ لەوە ئاگادار بین یەکێک لە دیارترین هۆکارەکانی بەهرەمەند نەبوون لە قورئان ئەو دەزگاو ناوەندانەن کە ئەم کارانەیان پێ سپێردراوە، لە زانکۆو پەیمانگاو مەداریسە ئیسلامیەکان نەیان توانیوە مەنهەجێکی ڕاستی هەستانەوە و پێشکەوتو دابنێن بۆقوتابییەکان، ئەوە مانای ئەوە نیە خزمەتیان نەکردووە، یان دڵسۆز نەبوون، بەڵام بە پێی پێویست نەبووە، لەو ئاستە نەبووە کەبتوانێ فریاد ڕەسی قۆناغەکە بێ.

٣٤. هەڵسوکەوت لەگەڵ دەقەکان بەپێی واقعی دواکەوتوانەی خۆمان یەکێکە لەگرفتەکان، بۆ نمونە ئەگەر باسی حدید دەکەین ئیستاش باسی شیر و رم و تیر دەکەین، بەڵام حدید لەمڕۆدا دەبابە و سەواریخ و سەیارە و کەشتییە، کە بۆتە بەردی بناغەی پێشکەوتن لەمڕۆدا، شەرت نییە بەس مەبەست ئاسن بێ بە دیاری کراوی هەر کان و ماددەیەک کە لەمڕۆدا سودی لێ دەبینرێ لە بواری پێشکەوتنی سەربازی، پیشەسازی، کشتوکاڵی هەر بوارێکی تر، هەتا لە بواری کشتوکاڵ ئەوروپا دەتوانێ لەهەمان مەساحەی ئێمە دەیان ئەوەندە بەرهەمی هەبێ، دەتوانی ئەو ئاژەڵەی بەخێوی دەکا گەورەتر و بەرهەم دارتر بێ، ئەو پەینەی کە بەرهەمی دێنێ بە بەرهەم تر بێ.

٣٥. لەکاتی دراسەکردنی قورئانی پیرۆز وەسائیل و ئامانجمان لێ تێکەڵ نەبێ، هەندێک تەفسیر، یان نوسین دەبینی دەیەوێ پێمان بڵێ قورئان تەنیا هاتووە موعجیزەی ڕەوانبێژی بێ و هیچی تر، یان نحوی یان صرفی، یان فلسفی، بۆیە دەبێ بزانین قورئانی پیرۆز ئامانجی سەرەکی چیە دەربارەی خوا،





ژیان، ژینگە، مرۆڤ، غەیب، دونیا، دواڕۆژ، پێشـکەوتن، پەروەردە، فەلسـەفەی بوون ...

٣٦. ئەولەویەت دان بەو ئـایەتـانەی کە بـاســـی فیقهن وە گرنگی پێدان و درێژکردنەوە هەتا چوون بۆ ناو فەرەزیاتی زۆر، واتە گریمانەی نا واقعی. ئەمانە خراپ نین بەڵام ئەدی بواری حەزاری، هۆکـاری پێشـــکەوتن، دواکەوتن، تەکنەلۆجیا، پەروەردە، ئابوری، ژینگە، سـەربازی، سیاسـی کێبەرکێی حەزاری، ئەمانە گرنگی پێ نەدراوە دەست نەخراوەتە سەر برینەکان لەکاتێک کە قوڕئان هات کۆمەڵگایەتی تایبەتی دروست کرد و کردیە خاوەنی حەزارە و سەربەخۆی و دەوڵەت و پەخشـــکردنی زانیاری و بەهێز و نمونەیی، لەکاتێک دەوری فقە ڕێک خستنە، بەڵام ئەوانەی کە باسمان کرد قورئان بۆ وەدیهێنانیان هاتووە کە ئەمانە لەپێشترو گرنگترن، بۆیە لە ئایەت و سورەتە مەکیەکان بابەتی ئەحکام زۆر کەمە لەچاو سورەتە مەدەنیەکان.

٣٧. یەکێـک لەگرفتە دیـارەکـان ئەوەیە کە فقە ی فروع کـاریگەر بووە بە دەســەلاتی ســیاســی وەخیتابی دینی بەگشــتی کاریگەر بووە بەو لایەنە، بۆیە فقەی ســـیاســـی و ئیقتصـــادی و پیوەندەیەکان زۆر بەرەو دوا گەراونەوە وە کەمیان لەســەر نوســراوە بە بەراورد لەچاو فقە ی عبادات چونکە دەســەڵاتی ســیاســی بەباشــی ئەوانەی قورخ کردبوو لەلایەک، لەلایەکی ترەوە ئەوەش کە نوسرا بەشی زۆر لە بەرژەوەندی دەسەلاتی سیاسی بوو، راستە سروشتی مرۆڤ وایە کاریگەرە بە ڕوداوو پێشهاتەکان، بەڵام دەی خۆ قوڕئان هاتووە گۆڕانکاری دروســـت بکا ژیان بگۆڕێ نابێ دەســـت لە ئەژنۆ وەربێنین و بێ هەڵوێســـت دابنیشین.

٣٩. گرفتێکی تر ئەوە بوو خەلەل لە دراســـاتی دینی پەیـدا بوو، وە هەر بەردەوامە بەشێک گرنگی بە دراساتی قوڕئان دەدا و سونەت پشت گوێ دەخا، یان گرنگی بە ســـونەت دەداو قوڕئان پشـــت گوێ دەخا، یان گرنگی بە فقە و





ئوسول دەداو بوارەکانی تر ئیهمال دەکا، بۆ بوارەکانی تریش هەر ڕاستن، بۆیە دەبێ هەوڵ بدەین هاوسەنگی ڕابگرین.

٣٩. فقه کە لەلای ئوسولیەکان بریتی یە لە(إستنباط الاحکام الشرعیة من أدلتها التفصیلیة) بەلاّم لەمەد لولی قورئانی بینای فقهی حەزارییە.

٤٠. چیرۆک و بەسەر هاتەکان دەبێ لە بابەتی ریوائی دەربچن بۆ پەند وەرگرتن و خۆبینا کردن و ڕەخنە لە خۆگرتن و بینای نوێی حەزاری، ئەگەر تەماشای وشەی(فقه) بکەی لە قورئانی پیرۆز سەرت دەسوڕمێ لەو فراوانیەی کە قورئانی پیرۆز بەکاری هێناوە.

٤١. لەناو قورئانی پیرۆزیش نابێ گرنگی بەلایەنێک بدەین لایەنەکانی تر ئیهمال کەین، ئەمە پێچەوانە نییە بۆ دراساتی بابەتی(الموضوعی) چونکە ئەوەی دراساتی بابەتی دەکا دەبێ گرنگی بەبوارەکانی تریش بدا، وە لەو دراسەوە فێری دراسەکردنی بوارەکانی تریش دەبێ، وە بەراستی قورئان خزمەتێکی زۆر جوان کراوە، بەلاّم مانای ئەوە نییە تەواو بوەو هیچی تری پێویست ناکا، دەبێ زۆر کار بکەین لەسەر بواری تفعیل کردن و بەگەڕخستن و کار پێکردن.

٤٢. قورئان خالیدە و هەر دەمێنێتەوە، ئایا گرفتەکانیش کە قورئان باسیکردون و چارەسەری کردوون هەر باقی دەمێنن و دوبارە دەبنەوە؟

هەندێک گرفت هەیە یان زۆربەیان لە ئەساسدا دەمێننەوە، بەلاّم ناو و شکلیان دەگۆڕێ، بۆ نمونە کوفر، نیفاق، بتپەرستی، زۆربەی سروشت و تەبیعەتی مرۆڤ، باسی دادگەری، ستەم، سیاسەت ...

گرنگ ئەوەیە ئێمە بتوانین دەقەکانی قورئان وەک پێویست دابەزێنین بۆ شوێنی خۆی و لەکاتی خۆی، پیاوێک هاتە لای ئیبن عەباس ڕەزای خوا





لەخۆی و لە باوکی بێ وتی من قورئانم لێ شـێواو و تێکەڵ بووە، وتی چۆن؟ وَقِفُوهُمْ إِنَّهُم مَّسْـُٔولُونَ (الصافات: ٢٤)

فَيَوْمَئِذٍ لَّا يُسْـَٔـلُ عَن ذَنۢبِهِۦٓ إِنسٌ وَلَا جَآنٌّ (الرحمن: ٣٩) وتی ئەم دوو ئایەتە چۆن تێ بگەم و تەفسـیر بکەم؟ ئیبن عەباس فەرمووی قیامەت قۆناغ قۆناغ و مەواقفی جیا جیایە، لە سەرەتا پرسیار لە هەموو شتێک دەکرێ بەڵام دواتر کە پرسـیار و وەڵام تەواو بوو پێویسـت بە پرسـیار و بیانوو وەرگرتن ناکا، ئەمە وەڵامێکی جوانە ئیشـکالەکان بەو شـێوازە لادەچن، دەبێ بزانی ئەم دەقە بۆ کوێ یە یان بۆ چ حاڵەتێکە.

٤٣. وە هەروەها بابەتی نەسـخی قورئان هەر لەبەر ئەوەی هۆکاری تایبەتی هەبوە و بەسـەر چوە ئایادەبێ دەقەکە ڕابگیرێ؟! لێرەدا دەبێ کار بەو قاعیدەیە بکەین کە دەفەرموێ( الاعتبار بعموم اللفظ لا بخصوص السبب، أو أن خصوص السبب لايمنع شمول المعنى)، لێرەدا توشی ئەو کێشەیە دەبین هەندێک لە زانایان پەنا بۆ ئەوە دەبەن کە گوایە بەشێکی زۆر لە قورئان نەسخ بۆتەوە، ئەمە ئەوەی لێ دەخوێنرێتەوە کە بەتەواو بوونی ڕووداوەکە دەقەکە کۆتـایی پێ هاتبێ، ئایا ناکرێ هەمان ڕووداو دووبارە بێتەوە؟ یان شـکڵ و شـێوازەکەی بگۆڕێ؟ بێگومان، بۆیە گومان لەوەدا نییە کە قورئـانی پیرۆز چ بەدەق بێ چ بەمانا و مەقاسـیدی دەقەکان و عیللەتی دەقەکان بێ، چ بەو بنچینانە بێ کە دایناوە دەتوانێ وەڵامگۆی هەموو پرسـیارەکان بێ بۆیە بەدرێژای مێژوو بۆ هەموو ڕووداوێک قسەی خۆی هەبووە، زانایان بەسود وەرگرتن لە مەقاسیدو بنچینەکانی شەریعەت وەڵامی پرس و پرسیارە گرنگەکانیان داوەتەوە، ئەگەر بە نمونە بڕوانین بۆ مجموع الفتاوای ئیبن تەیمیە ئەوە دەبینین کە ئەو کتابە هەمووی پرسیارە ئاراستەی کراوە و وەڵامی داونەوە، نمونەیەکی سادە کاتێک کە مسـوڵمانان هەژاربووبن و گۆشـت کەم بوو پێغەمبەری خوا علیه الصـلاة والسلام فەرمانی کردووە گۆشت لەماڵەکان زیاتر لە سێ ڕۆژ هەڵنەگیرێ، بەڵام





کاتێک وەزعەکە گۆڕا پێغەمبەری خوا فەرموی(کلوا وادخروا وتصدقوا)، باشە ئەگەر هەمان شت دووبارە بۆوە دەکرێ هەمان شت دووبارە بکرێتەوە؟ بێگومان بەڵێ، دەیان نمونە هەن لەسەر ئەم جیاوازی حوکم و فەتوایە لەکاتی گۆڕانی حاڵەت و ڕووداوەکان.

٤٤. جارێکی تر لەسەر نەسخ ڕابوەستین، تێدەگەین نسخ لای زانایانی(پێشین) جیاواز بووە لەوەی کە زانایانی پاشین(خلف) تێی گەیشتون، بۆیە بەو مانایەی کە زانایانی ئەهلی تحقیق باس دەکەن فعلەن ئایەتێکت دەست ناکەوێ لە هەموو ڕووێکەوە بەتاڵ بووبێتەوە، وە بەڕاستی کارەساتە ئایەتی خوا بێ مانا و مەغزا بێڵینەوە بڵێین تەنیا بۆبەرەکەت لە قورئاندا ماوەتەوە، بۆ نمونە ئایەتەکانی جەنگ و شەڕ کە دەکرێ لەهەر شوێنێک بەپێی زروفی خۆیان مسوڵمانان کار بە ئایەتەکان بکەن، چونکە مسوڵمان دەتوانێ بانگەوازی نهێنی بکا، یان بە ئاشکرا بیکا، یان بتوانێ بەرگری لە خۆی بکا لەڕووی چەکداریەوە، جاری وایە مسوڵمانان لەقۆناغی دەوڵەتداری دان، لە دەوڵەت داریدا جاری وایە دەوڵەت لە قۆناغی ساوایی دایە، جاری وایە لەوپەری بەهێزی دایە، جاری وایە(تحالف) هاوپەیمانی دەکات بۆیە پێویست نییە ئێمە پەنا بۆ نەسخ بەرین، چونکە دەکرێ هەموو ئایەتەکان لەشوێنی خۆیاندا بەکار بێنین.

٤٥. زۆر کەس وادەزانێ تعامل لەگەڵ بێ باوەڕان تەنیا سێ ڕێگای هەیە: یان دەبێ شەڕبکەین، یان دەبێ مسوڵمان بن، یان دەبێ سەرانە بدەن.

ئەم فەتوایە لە ڕووداوی تایبەت وەرگیراوە کە مسوڵمانان لەجەنگ دابوون لەگەڵ بێباوەڕان، تەنیا بۆ ئەوان یەکێک لەم سێ خیارە ماوەتەوە، بەڵام قورئان وا ناڵێ، بۆیە مەفهومی ڕوداوێکی سیڕەیان زاڵکردوە بەسەر هەموو قورئاندا ئیتر وادەزانن ئەمە تاکە هەڵوێستی دینە.





**ئەگەر پۆڵێنی کافرەکان بکەین دەکرێن بەم بەشانە:**

- ✓ الكافر الحربی: کافری ئەهلی حەرب کە ناچاری شەڕی لەگەڵدا بکەی.
- ✓ الكافر المعاهد: کافری هاوپەیمان.
- ✓ معاهدالمعاهد: ئەوەی هاوپەیمانی هاوپەیمانەکەتە.
- ✓ المسالم أو المحايد: ئەوەی بێ لایەنە نە لە شەڕدایە و نەهاوپەیمانتە.
- ✓ المرتد: هەڵگەڕاوە.
- ✓ المنافق: دوو ڕوو.
- ✓ الكافر المستأمن: ئەو کافرەی لەناو مسوڵمانان پەنادراوە و لجوئی پێدراوە.
- ✓ أهل الجزيه: ئەوانەی بوونە هاولاَتی لە دەوڵەتی ئیسلامیدا.

لە هەموو ئەو بەشـــانە تەنیا لەگەڵ کافری محارب شـــەڕ دەکرێ، لەگەڵ ئەوانیشدا خوای گەورە دەفەرموێ: وَإِن جَنَحُواْ لِلسَّلْمِ فَٱجْنَحْ لَهَا وَتَوَكَّلْ عَلَى ٱللَّهِ إِنَّهُۥ هُوَ ٱلسَّمِيعُ ٱلْعَلِيمُ (الأنفال: ٦١)

واتە: وە ئەگەر ئەوانە مەیلی ئاشـتیان هەبوو تۆش (ئەی موحەممەد(صـلى الله عليه وسـلم)) مەیلی ئەوە بکە وە پشـت بەخوا ببەسـتە بەڕاسـتی هەر ئەو زاتە بیسەری زانایە.

ئەگەر سەیری قوڕئانی پیرۆز بکەین باسی هەموو ئەوانە دەکا بۆ دەبێ ئێمە بەحوکمی هەڵە تێگەیشـــتن لەســـیرە خۆمان بێبەش کەین لە پۆڵێن کردنی قورئانی پیرۆز بەو فراوانییە.

٤٦. یەکێک لە گرفتە گەورەکان زاڵ کردنی ســونەتە بەســـەر قوڕئان، هەندێ وایان لێهاتوە ئەگەر ئایەتێک ماناکەی ڕوون بێ بەلاَم لەگەڵ ســونەتێک تێک بگیرێ پێیان وایە دەبێ واز لە قوڕئان بێنین و پەنا بۆ ســـونەت بەرین وەک بابەتی هەڵگەرانەوە، من دڵنیام قوڕئان لەگەڵ سونەتی صحیح و صریح تێک نـاگیرێن، بەلاَم ئەگەر شـــتێـک لەو بـابەتە هەبێ مـادام نەکرێ جەمع یـان





لەنێواندا بکەین ناچارین دەستبەرداری سونەت بین نەوەک قورئان، چونکە سونەت تفسیرو بەیانی قورئانی پیرۆز دەکا، وەک ئیبن تیمیە دەفەرموێ ڕەحمەتی خوای لێ بێ: فالسنة تفسرالقرآن وتبينه وتدل عليه وتعبر عنه.

وەک پێشتریش باسم کرد زۆرێک هەن بیانەوێ یان نا پشتیان لە قورئان کردوە و بەڵگەکانیان تەنیا بە سونەت دێننەوە کەچی لەهەمان بابەتدا ئایاتی زۆر و ڕوون هەن، هەق وایە سەرەتا ئایەتەکە باس بکرێ ئەدەبەن ئەوجار کە پێویست بوو سونەت باس بکرێ.

٤٧. ئێمە لە تەواوی قورئان تێ ناگەین بەبێ سونەت ئەمە نەوەک بێ ئەدەبیە بەڵکو بێ دینیە بمانەوێ واز لەسونەت بێنین، ئایا نوێژ چۆن بکەین،کوا کاتەکەی بەڕوونی لە قورئاندا؟ کوا ڕکاتەکان و ژمارەی ڕکاتەکان؟، کوا زیکرو دوعاکانی ناو نوێژ،؟ کوا تەحیات؟ کوا نوێژە سونەتەکان؟، ئایا زەکات لەچی دەدرێ؟، زەکاتی وشترو مانگاو مەڕ و بزن چەندە؟، گومان لەوەدا نیە کە سونەت ئەم ئەرکانەی بە ئەستۆوە گرتووە.

٤٨. قورئان هیچ ناڕێکی و ناکۆکی لەگەڵ ژیری نییە بەڵکو هانمان دەدا، تعقل، تفكر، تدبر، تذكر، تبصر بکەین، وە باسی ئەهلی عەقڵ، خاوەن لب، خاوەنی عبرەت، إعتبار، هەرەشەی زۆری کردووە لە وانەی بیر ناکەنەوە، پەندوەرناگرن، بەزەویدا ناڕۆن، لە ئاسمان ڕانامێنن، تەماشای دروستکراوەکان ناکەن، تەماشای خۆیان ناکەن، لە قورئان ورد نابنەوە،

بەڵام ئەمە مانای ئەوە نییە کە ژیری دەتوانێ هەموو شت بە تەنیا تەفسیر بکاو تێبگا، وە لەگەڵ ئەوەش دانین کە عەقڵ بەبێ هاتنی شەریعەت هیچ بەرپرسیاریەتێکی نیە و سزاو پاداشتی بۆ نییە، بە بەڵگەی ئەوەی خەڵک دەتوانێ دوور لە ڕەچاوکردنی دین دەستورو یاسا بۆ خۆی دادەنێ و خەڵکیشی پێ بەرێوە دەچێ تا ئەندازەیەکی باش سەرکەوتوش بوون لە دونیا، لە زۆربەی لایەنەکان لە ئێمەی مسوڵمان سەرکەوتوترن، ئێمە خەتای دینەکەمان نییە





که به جێماوین بەڵکو خەتای دینداریەکەمانە، لە دین بەشـێوە ڕاسـتەکە تێ نەگەیشـتوین، بەرپرس و کاربەدەسـتانی وەڵاتانی ئێمە نادڵسـۆزو نا ئەمین و قۆرخ کارو بازرگان و بە ئەجێندای دوژمنان کاردەکەن، وە نەشارەزان لە دین و لە دونیـا، دەی وەڵاتێک ئەوانە بەڕێوەی بەرن هەر ئەوەی لێ پەیدا دەبێ کە دەیبینین، ئیبن تیمیە وتەیەکی جوانی هەیە دەفەرموێ: هیچ کاتێک سونەی صحیح لەگەڵ عەقڵی سـەلیم تێک ناگیرێن ئەگەر بەڕواڵەت تێک گیران ئەوە بزانە یان عەقڵەکە سـەلیم نیە، یان سـونەکە صحیح نیە، یان سـونەکە صریح نیە لەو مـانـایەدا واتە دیـار نیە کە ئەمە مـانـاکەی بێ کە دژی عەقڵە، وە ئەو کتابێکی شـەش بەرگی بۆ ئەو بابەتە داناوە کە ئیبن قیم دەفەرموێ تائێسـتا کتابی وا چاوی بە دونیا هەڵنەهێناوە بەناوی(درء تعارض العقل والنقل)،

ئەبی عیززی حەنەفیش لە شـــەرحی عەقیـدەی تەحـاوی دەفەرموێ (إن الشريعة الاسلامية لاتأتى بما تحيله العقول، ولكن تأتى بما تحار فيه العقول) واتە شـــەریعەتی ئیســـلامی شـــتێک ناهێنێ ژیری بڵێ مەحاڵەو نابێ بەڵام شتانێک دێنێ ژیری تێیدا سەرگەردانە.

بۆ نمونە بـابەتە غەیبیەکـان کە عەقـڵ خۆی یەکێکە لەم بـابەتـانە کە هەتـا ئێســـتاش بە دیاری کراوی دیار نییە ژیری چیە، کە واتە چۆن دەکرێ لە ڕێی ژیریەوە هەمووشـــتەکان بزانرێن کە تا ئێســـتا خۆی دیار نیە بەس نیشـــانەو شوێنەوارەکانی هەست پێ دەکەین.

٤٩. تعامل لەگەڵ قورئانی پیرۆزدا تەنیا بە دڵ نابێ وەک هەندێک لە سۆفیە لادەرو کاریگەرەکان بە دینە شـــەرقیەکان دەڵێن، بەڵێ دڵ بە مانا قورئانیەکە گرنگە، وە زۆر بـاســـی کردوە وە ١٣٢ جار لە قورئانی پیرۆزدا هـاتوە بێجگە لە ناوەکانی تریشـی، کەواتە دەبێ بەتەواوی لای بە لادا بکەینەوە چونکە دڵ زۆر ماناو ناوی بۆ دانراوە و تەعبیر لە زۆر شـت دەکا، دڵ شـوێنی ئاوێتە بوونە، دڵ پاشـــایە، دڵ بڕیارڕ دەرە، دڵ ڕۆشـــن دەبێتەوە، جێگای مەعریفەیە، کوێر دەبێ،





ڕەق دەبێ زیاتر لە بەرد، هەڵدەگەڕێتەوە، ئازار دەچێژێ، ســالم وســەلامەت دەبێ، گەڕاوە و تۆبەکار دەبێ...

٥٠. نـابێ بەهرەمەنـد بوونی ئێمە لە قورئـانی پیرۆز کورت هەلبێ لەســەر ڕاڤەکردنی نەحوی و بەلاغی و فقهی، بۆیە کتـابی بێ حســـاب لەو بوارانە نوســراون کە زۆریـان هەر دووبـارەن بەداخەوە، بۆیە دەبێ لا بکەین بەلای بوارەکانی تری زانستی سیاسی، ئابوری، کۆمەڵایەتی، دەستوری، پەروەردەیی، پزیشکی، ریاضی، فلکی، نفسی ...

بەتایبەت لە ئێستادا زۆرتر پێویستمان بەو بوارانەیە کە لە ئەمڕۆ پێداویستی مرۆڤایەتیە.

٥١. ئاگامان لە(تدرج) واتا هەنگاو بە هەنگاو بێ لە قورئانی پیرۆزدا، زۆر لەو شتانەی کە ناویان لێناوە نەسخ لە ئەساسدا تدرج ە واتە دەبێ ئێمە پێ بە پێ لەگەڵ حوکمە شــەرعیەکـان بڕۆین وردە وردە جێ بە جێ یـان کەین ئەمە ســونەتی ژیانە نابێ فەرامۆشــی کەین هیچ کەســێک و هیچ کۆمەڵگایەک یەکســەر ناگۆڕێ بەڵکو پێویســتی بەکاتە، هەر بۆیە پێویســت بوو پێغەمبەری ئازیزمان علیە الصلاە والسلام ٢٣ ساڵ بە پێغەمبەرایەتی ژیان بکا لەگەڵ ئەو هەموو گەورەیی و ژیری و لێهاتویەی کە هەیبوو.

٥٢. دوو جۆر ئیختلافمان هەیە بەشــێکیان بۆ هەمە جۆریە (تنوع) ئەمەیان ژیانی پێ ڕازاوەتەوە و جوان بووە زۆر لە قورئاندا مەدحی کراوە.

جۆرەکەی تریش دووبەشــە بەشــی یەکەم نـاڕەوایە کە لە ئوســول و بنچینەکانی دین بێ، بەشی دووەم ڕەوایە کە لەو شتانە بن خلاف هەڵدەگرن.

٥٣. تێگەیشــتن لە ســونەتە خواییەکان لە دەرون و ئاســۆ(النفس والافاق)، هۆکاری دروستبوونی حەزارەت و ئامادە بوونی کردەییە لە ژیان، مەبەست لەو سونەتانەنن کە تحکم دەکەن بە جوڵەی مێژوو کۆمەڵایەتی و دەرونی، سونەتی





کەوتنی ئومەتان هەستانەوەیان، ئەمە بەزۆری لە سەربوردە قورئانیەکان ڕەنگی داوەتەوە، هەتا وەکو ئێمە لەم سونەت و یاسایانە تێنەگەین ناتوانین لە قورئان تێ بگەین، وەناتوانین هەڵبستینەوە، ئەو سونەت و یاسا خواییانە وەك: سنة التدرج، سنة الاجل، سنة التداوي ، سنة المدافعة، سنة التسخير، سونەتەکانی تر لە ژیان و بونەوەردا.

٥٤. خەڵکانێک هەن پێیان وایە بەشێک لە ئەحکامەکان تەنیا حاکم پێیەوە هەڵدەستێ تاکەکان هیچ بەرپرسیاریەتیەکیان نییە، ئەمە لەلایەکەوە ڕاستە کە دەبێ دەسەڵات ئەوە بکا بەڵام ئەی ئەگەر نەبوو؟ ئایا کاری تاکەکان نیە ئیشی بۆ بکەن؟ بێگومان ئەرکی هەرتاکێکە هەوڵبدا بەپێی توانا کار بکا بۆ بەدیهێنانی حوکمە خواییەکان.

٥٥. بابەتی ئیعجازی یەکێکە لەو بابەتانەی کە قسەی زۆر هەڵدەگرێ، وە زیادەڕەویشی تێدا دەکرێ، بەڵام بابەتەکە دەبێ بەوریایی لەگەڵی مامەڵە بکەین، وای لێ نێ بیە بە بیردۆزەی لاوازو نەسەلمێنراو قورئان تەفسیر بکەین و قورئان بخەینە ژێر پرسیارەوە، کە ئێمە گومانمان نییە قورئانی پیرۆز پڕیەتی لە زانیاری وردو ئاماژەی زانستی.

٥٦. وە دەبێ جیاوازی بکەین لە نێوان تەفسیری زانستی کە بۆ قورئان دەکرێ، وە لە نێوان ئیعجازی زانستی، تەفسیرە زانستیەکان ڕوونکردنەوەی دەقەکان دەکەن بە شێوەی زانستی، بەلام ئیعجاز پێشوەختە باسکردنی بابەتە زانسیەکانە پێش ڕوودانیان.

٥٧. ئەگەر پرسیار لە خۆمان بکەین بۆچی ئێمە خاوەنی قورئانین بەڵام دواکەوتوین لە زۆربەی بوارەکانی ژیان؟ دیارە هۆکار زۆرە بەڵام لەگرنگترین هۆکارەکانی دواکەوتنی ئوممەتی ئیسلامی گرنگی دان بە مەرویات لەسەر حسابی پێش کەوتن و گرنگی دان بەبوارەکانی تر، ئێمە بەخراپی نازانین، بەڵام سەدان و هەزاران مەدرەسە و پەیمانگای بۆ دامەزراوە بەڵام چەند





ســـەنتەرێـک دانەمەزراوە بـۆ گەڕان بەدوو دۆزینـەوەو پڕاکـتـیـک کردنـی زانیاریەکانی قورئان، هەر بۆیە مەلای گەورە وتویەتی:

**رواه الدار قطنی حدثنا الترمذی          هەمووی لەکیس ئێمەدا لە پاپۆر هەتا دەرزی**

چونکە گرینـگـی دانمـان بە ڕیوایەت لەســـەر حیســـابی هەموو بوارە زانستییەکانی تر و پێشکەوتنمان بووە.

وەیەکی تر لە هۆکارەکانی دواکەوتن ئەوەیە کە ئێمە وا دەزانین پێشکەوتن تەنیا هێزی قســـەکردنە و هیچی تر لە کاتێک دا لە دونیای ئەمڕۆدا پێوەری پێشــکەوتن پێشــەســازی و داهێنان و جوان ئیدارەدان و دابینکردنی ماف و هێزو دەســـەلات و توانـای ئـابووری و ڕیزبەنـدی زانکۆکـان و لێکۆڵینەوە زانستیەکانە، ئایا ئێمە لەوانە لەکوێین؟!

یەکی تر لە هۆکـارەکـان خراپی و دواکەوتوی و قۆرخکـاری و نـاســـەربەخۆ بوونی بەرپرســەکانە، کە بونەتە بەردە نەگبەتەکە نە بۆ خۆیان ئاو دەخۆنەوە وە نە دەرفەت بەخەڵک دەدن، دوژمنی داهێنانن، بازرگانی شـــەخســـین، پیاوی ئەمنین نەوەک ئیداری، ئاســتی زانیاریان لاوازە، نەبیســت، ســەقاڵی حزب و خزم و کەسو کار، ئەوجار دوژمنە زۆردار و زۆر زانەکانمانن.

٥٨. ئێمە مەنهەج و بەرنامەمان هەیە کە ئیســـلامە، بەڵام گرفتی فەهم و فیکرمان هەیە، چۆن لێی تێ بگەین؟ لە کوێوە دەست پێ بکەین؟.

٥٩. ئیستبدادی سیاسی لەمڕۆدا هێز و بڕستی لە ئوممەتی ئیسلامی بڕیوە، هەوڵی داوە هەموو شتێک ناشیرن و گەندەڵ بکا، کاتی خۆی قورئان کە هات کێشەی گەورە هەبوو دیکتاتۆری گەورە هەبوو چۆن چارە سەری کرد؟ دەبێ لە قورئان و لە واقعی خۆمان بەدوی ئەوەدا بگەڕێین.





٦٠. قورئان ڕێنماییمان دەکا دەبێ لە گۆڕینی فیکرو نەفسەوە دەست پێ بکەین، یەکەم جار بیرو باوەڕی ڕاست و ڕەوان، وە دەرونێکی خاوێن و پەروەردە کراو:

إِنَّ ٱللَّهَ لَا يُغَيِّرُ مَا بِقَوْمٍ حَتَّىٰ يُغَيِّرُواْ مَا بِأَنفُسِهِمْ وَإِذَآ أَرَادَ ٱللَّهُ بِقَوْمٍ سُوٓءًا فَلَا مَرَدَّ لَهُۥ وَمَا لَهُم مِّن دُونِهِۦ مِن وَالٍ (الرعد: ١١)

ذَٰلِكَ بِأَنَّ ٱللَّهَ لَمْ يَكُ مُغَيِّرًا نِّعْمَةً أَنْعَمَهَا عَلَىٰ قَوْمٍ حَتَّىٰ يُغَيِّرُواْ مَا بِأَنفُسِهِمْ وَأَنَّ ٱللَّهَ سَمِيعٌ عَلِيمٌ (الأنفال: ٥٣).

ئەمە یاسای خوایە نە نیعمەت لەخۆڕا دەگۆڕێ، نە بەڵا لەخۆڕا دادەبارێ، بۆیە قورئانی پیرۆزیش باسی خوێندنەوە و فێرکردن و پاککردنەوە دەکا:

لَقَدْ مَنَّ ٱللَّهُ عَلَى ٱلْمُؤْمِنِينَ إِذْ بَعَثَ فِيهِمْ رَسُولًا مِّنْ أَنفُسِهِمْ يَتْلُواْ عَلَيْهِمْ ءَايَٰتِهِۦ وَيُزَكِّيهِمْ وَيُعَلِّمُهُمُ ٱلْكِتَٰبَ وَٱلْحِكْمَةَ وَإِن كَانُواْ مِن قَبْلُ لَفِى ضَلَٰلٍ مُّبِينٍ (آل عمران: ١٦٤).

٦١. ئوممەت هەمووی گومڕاو سەرلێ شێواو نییە، بەڵێ لە مێژوودا ستەم و نادادی هەبووە بەڵام ئەمە هەرگیز جێگای ڕەزامەندی زۆربەی خەڵک نەبووە، وەکەمینەیەک نەبێ لە زانایان پێی ڕازی نەبوون، وە لەوانەیە ئەوانیش وایان پێ باشتر بووبێ لەگەڵیان هەڵکەن بۆ ئەوەی ئامۆژگاریان بکەن و لەکاریگەری خراپیان کەم کەنەوە، وەگومانیش نیە لەوەی کەبەشێک لەزانایان و دانایان و ڕۆشنبیران لە مەهامی خۆیان لایان داوەو بوونە داردەستی دەسەڵاتی گەندەڵ.

٦٢. قورئان بێ هیوای ناناسێ بەڵکو بەگومڕای و کوفری دەزانێ:

قَالَ وَمَن يَقْنَطُ مِن رَّحْمَةِ رَبِّهِۦٓ إِلَّا ٱلضَّآلُّونَ (الحجر: ٥٦).





يَٰبَنِيَّ ٱذۡهَبُواْ فَتَحَسَّسُواْ مِن يُوسُفَ وَأَخِيهِ وَلَا تَاْيۡـَٔسُواْ مِن رَّوۡحِ ٱللَّهِۖ إِنَّهُۥ لَا يَاْيۡـَٔسُ مِن رَّوۡحِ ٱللَّهِ إِلَّا ٱلۡقَوۡمُ ٱلۡكَٰفِرُونَ} (يوسف: ٨٧)

٦٣. گرنگی دان بەزانســـتی کۆمەڵایەتی، ئەمە خاڵی بەهێزی ئێمەیە هەموو بنچینەکـانی لە قورئـانی پیرۆزدا هەن، دروســـتکردنی تـاکی بەهێز، خێزانی ســـەرکەوتو، پەیوەندیە کۆمەڵایەتیەکان، پابەندبوون بە بەها باڵاکان، باســـی مافەکانی مرۆڤ، مێژوویەکی پڕ ســەروەری، دەوڵەمەند بەمرۆڤی ســەرکەوتوو، هەڵکەوتەیەکی جوگرافی بـاش، خـاڵی زۆر بەهێزە بۆ کۆبونەوە، بۆیە کـاری ئێمەیە مرۆڤ دابڕێژینەوە بەپێی دەســتورو ڕێنماکانی قورئانی پیرۆز، بەســود وەرگرتن لەپێش کەوتنی تەکنەلۆژیای ئەمڕۆ.

٦٤. قورئـان دەیەوێ وەحی بەکاربەرین و کاری پێ بکەین و پەند لە مێژوو وەربگرین، وەحی لای ئێمە کۆتا پەیامی خوایە بۆ مرۆڤایەتی، پوختەی هەموو دینەکانە، هەموو پێداویســـتیەکانی ژیـانی تێدا، بۆ هەموو ســـەردەمەکان دەگونجێ، مێژووکی پڕشنگداری تۆمار کردوە، لەئیستادا خێراترین دینە لەبڵاو بونەوەدا، تـاکە دینێکە کە دەقەکـانی دەڵێی بۆ ئێســـتـا دابەزیوە، هیچ پێویستیەکی مرۆڤی تێدا پشتگوێ نەخراوە، لە هیچ دەقێکدا دژایەتی زانستی نەکردووە، مرۆڤی زۆر داناو زانای پێشـــکەشـــی مرۆڤایەتیکردوە، قائیدی زۆر جوامێرو ئازایی پەروەردە کردووە، لەمڕۆدا ڕاســـتیەکانی لەهەر کاتێک باشـــتر دەرکەوتوە، گەورەترین نوێنەری هەیە کە رســـول الله بە دانپێـدا هێنـانی نەیـارەکـانی، جۆریترین گۆڕانکـاری کردوە، ڕیشـــەیترین بووە، ئەمـانە هەموو ڕاستین.

٦٥. چۆن لەگەڵ مێژوو تعامل بکەین بەپێی قورئانی پیرۆز؟ مێژووی قورئان بۆ ئێمە دینە دەبێ بروامـان پێی بێ و وەک ڕاســـترین ســـەرچاوەی مێژوو





وەرییبگرین دەبێ لێی ڕامێنین و بیری لێ بکەینەوە: وَلَوْ شِئْنَا لَرَفَعْنَٰهُ بِهَا وَلَٰكِنَّهُۥٓ أَخْلَدَ إِلَى ٱلْأَرْضِ وَٱتَّبَعَ هَوَىٰهُ فَٱقْصُصِ ٱلْقَصَصَ لَعَلَّهُمْ يَتَفَكَّرُون (الأعراف: ١٧٦)

بۆ پەند وەرگرتن: لَقَدْ كَانَ فِى قَصَصِهِمْ عِبْرَةٌ لِّأُو۟لِى ٱلْأَلْبَٰبِ مَا كَانَ حَدِيثًا يُفْتَرَىٰ وَلَٰكِن تَصْدِيقَ ٱلَّذِى بَيْنَ يَدَيْهِ وَتَفْصِيلَ كُلِّ شَىْءٍ وَهُدًى وَرَحْمَةً لِّقَوْمٍ يُؤْمِنُونَ (يوسف: ١١١)

بۆ بە هێز بونی دڵ و ئیمان: وَكُلًّا نَّقُصُّ عَلَيْكَ مِنْ أَنۢبَآءِ ٱلرُّسُلِ مَا نُثَبِّتُ بِهِۦ فُؤَادَكَ وَجَآءَكَ فِى هَٰذِهِ ٱلْحَقُّ وَمَوْعِظَةٌ وَذِكْرَىٰ لِلْمُؤْمِنِينَ (هود: ١٢٠)

بۆ شوێن پێ هەڵگرتن و بەرگری لێ کردنیان: أُو۟لَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ هَدَى ٱللَّهُ فَبِهُدَىٰهُمُ ٱقْتَدِهْ قُل لَّآ أَسْـَٔلُكُمْ عَلَيْهِ أَجْرًا إِنْ هُوَ إِلَّا ذِكْرَىٰ لِلْعَٰلَمِينَ} (الأنعام: ٩٠)

٦٦. قورئـان موڵکی کەس نییە بەڵکو کەلامی خوایە: ٱللَّهُ أَعْلَمُ حَيْثُ يَجْعَلُ رِسَالَتَهُۥ سَيُصِيبُ ٱلَّذِينَ أَجْرَمُوا۟ صَغَارٌ عِندَ ٱللَّهِ وَعَذَابٌ شَدِيدٌۢ بِمَا كَانُوا۟ يَمْكُرُونَ (الأنعام: ١٢٤)

چ کەسێک و چ نەتەوەیەک خزمەتی قورئان بکا قورئان لەو شوێنەیە، قورئان لەم بوارەدا زمان و ڕەنگ و ژینگەی تایبەت ناناسێ.

٦٧. مافی هەموو کەسێکە لە قورئان تێبگا: وَمَآ أَرْسَلْنَا مِن رَّسُولٍ إِلَّا بِلِسَانِ قَوْمِهِۦ لِيُبَيِّنَ لَهُمْ فَيُضِلُّ ٱللَّهُ مَن يَشَآءُ وَيَهْدِى مَن يَشَآءُ وَهُوَ ٱلْعَزِيزُ ٱلْحَكِيمُ (إبراهيم: ٤)

بۆیە زانایان گوناهبار دەبن ئەوانەی توانایان هەیە کە قورئان بە هەموو نەتەوەکانی سەرزەوی نەگەیەنن و بۆیان تەرجومەنەکەن.





٦٨. زانایانی مێژووزان یەک دەنگنو دەڵێن هەر گەشە سەندنێکی سیاسی ئابووری سەربازی مێژووی گەورە، دەبێ لە پشتیەوە ئایدیا و فەلسەفە هەبێ، کاتی خۆی تەتەرەکان مەغۆلەکان زەویەکی زۆریان داگیر کرد بەلاّم هزرو شوێنەواریان نەما چونکە وەحشی گەری بوو، بەلاّم شۆرشی فەرەنسی کتابەکانی جان جاك ڕۆسۆ و منتسکیو نوسەرەکانی تری لەپشت بو دەبینی مایەوە، وە هەروەها شۆرشی شیوعی بەگشتی ئاو دەدرا بە فەلسەفەی مارکسی و لینینی...

ئیسلام کەهات فراوانترین فەلسەفە و ئایدیای لەپشت بوو، بۆیە زۆرترین دەرهاویشتەو تەمەنی هەبوو، ئەمە راستیەکی مێژوییە دەبێ لێی تێبگەین بۆیە دەبینین بەسەرهات لە قورئاندا پانتایەکی زۆری گرتووە.

٦٩. لەکاتی قورئان خوێندندا تەواوی ئادابەکان ڕەچاو بکەین بۆ ئەوەی بەتەواوی لە قورئانی پیرۆزبەهرەمەند بین.

٧٠. دەبێ قورئان خوێندنەکەمان رێک و پێک و دیارو بە گەردن کەچیەوە بێ.

٧١. دەبێ لە سورەتەکان و بابەتەکانی و ئامانجەکانی ورد بینەوە، وە ئەو وەدبوونەوە دابەزێنین بۆ ناو ئایەتەکان و وشەکان و پیتەکانیش، چونکە هەموو ئەوانە ئامانجدارن.

٧٢. هەوڵ دەین وردەکاری لە ئایەتەکاندا بکەین زۆر لایەنی لەبەرچاو بگرین بۆ ئەوەی بۆخۆمان بەهرەمەند بین.

٧٣. بزانین لەگەڵ کام واقیعە ئەم ئایەتە قسە دەکا واتە دتوانین کام گرفتە بەم دەقە یان ئەو چەند دەقە چارەسەر بکەین.

٧٤. خۆمان بەهرەدار بکەین لەو ڕاڤە جوانانەی کە نوسراون لە زوو، وە لەتازەدا.





٧٥. بەکاربردنی کۆمەڵێک تەفسـیری خاوێن و پوخت، وە بەردەوام سـودیان لێ وەر بگرین.

٧٦. دەتوانین بە ســێ جۆر قورئـان بخوێنین، یەك بۆخوێنـدن، دوو بۆ لەبەرکردن، سێ بۆ تێڕامان.

٧٧. قورئان بە شـێوەی گشـتی تەماشـا بکەین و وەک مەنهەجی ژیان بۆی بڕوانین، وە دەبێ بزانین موهیممەی قورئـان گوڕینی واقیعی نـالەبـارە، ڕزگـار کردنی مرۆڤە...

٧٨. سوربوون لەسەر شارەزا بوون لە ئامانجە گشتیەکانی قورئان.

٧٩. بۆ ئەوەی لە قورئان بەهرەمەند بین پێویستە حەرەکی و کردەیی بین.

٨٠. خۆ دور بگـریـن لەو درێـژکردنەوانەی کە لە جەوی قـورئـان دورمـان دەخەنەوە، وەک هەنـدێـک زانیـاری نـا پێویســـت و دور لە جەوی بـابەتە قورئانیەکە.

٨١. قورئان بپارێزین لە ئیسرائیلیات.

٨٢. قورئان بپارێزین لە خورافیات.

٨٣. سەرنجمان لەسەر ئەو بابەتانە بێ کە بۆ ئەمڕۆ گرنگە.

٨٤. بەبێ بڕیارێ پێش وەخت بچینە ناو قورئانی پیرۆز.

٨٥. خوێندنەوە و لێکدانەوەی قورئان بۆ پشتیوانی لە قەناعەتی خۆت نەبێ، بەڵکو دەبێ قەناعەتی خۆت شوێنی قورئان بخەی.

٨٦. دڵنیا بوونی تەواو لە وەعدو بەڵێنەکانی قورئان، وەمل کەچ کردنی واقع بۆ قورئان.

٨٧. ژیانکردن لەگەڵ روح و جەوی قورئان دا.





٨٨. دڵنیابین لەوەی دەقەکانی قورئان مانای زۆر هەڵدەگرن ئەوەی وتراوە لەسەری هێشتا زۆری ماوە.

٨٩. ژیانی ئەوانەی کە لە خزمەت قورئاندا ژیاون لەسەروی هەموو کەسەوە سەروەرمان رەسول الله علیه الصلاة والسلام، وە هاوەڵان وە پێشەواو پیاو چاکان.

٩٠. قورئان رزگار کەین لە کۆت و پێوەندی زەمان ومەکان و هەتا میللەتانیش.

٩١. بەرەو ڕووبەرووبونەوەی مادیەت و نەفامی سەردەم بە تێگەیشتن لە ئامانجەکانی قورئان.

٩٢. ڕێگە بە خۆمانبدەین لە قورئان بەهرەمەند بین وڕاڤەی بکەین بە شێوەیەکی دروست و بەمەرجەکانی خۆی.

٩٣. تەفسیر فراون بکەین بۆ ئەوەی سیرەو ژیانی هاوەڵانیش بگریتەوە.

٩٤. وابزانین ئایەتەکە بۆ ئێمە دابەزیوە و تایبەتە بە ئێمەوە.

٩٥. نوسینی ئەو لەتیفەو مانا جوانانەی کەلە میانەی خوێندنی قورئان بۆمان دروست دەبن.

٩٦. ئاگادار بین لە بنچینەکانی تەفسیر کە بەجیا هەندێکیان باس دەکەین.

٩٧. سود وەرگرین لە زانیاری و ڕۆشنبیری سەردەم .

٩٨. دوبارە کردنەوەی ئایەت یان بابەتێک کە پێویست بوو.

٩٩. لەبیرمان نەچێ سودی تایبەت لە و کتابانە وەرگرین کە لەسەر وشەکانی قورئان نوسراون(غریب القرآن).





١٠٠. گرنگی دان بە تەفســـیرە کورتەکان، زۆر جار پێویســـتمان پێ دەبێ و لێکدانەوەی جوانمان دەست دەکەوێ.

١٠١. هەر سورەتێک تایبەت مەندی و جەوی خۆی هەیە دەبێ لێی تێبگەین.

١٠٢. پەیوەندی بەینی ئایەتەکان دەرك بکەین.

١٠٣. گرنگی دان بەپەیوەندی نێوان سورەتەکان.

١٠٤. گرنگی دان بەو وشـانەی کە بەچەندین مانا هاتوە کە زۆربەی وشـەکان وان.

١٠٥. هەتـا بکرێ تەجـاوز کردنی ڕاجیـایی موفەســـیرەکـان و گەڕانەوە بۆ سەرچاوەی زولاڵی قوڕئان.

١٠٦. قوڕئان پێوەر بێ بۆ ناسینی خەڵک نەوەک بە پێچەوانەوە.

١٠٧. بزانین سودی کردەییمان چ کردوە لە قوڕئان.

١٠٨. چاوەدێری زیادبون و تام و لەززەتی خۆمان لە قوڕئان بکەین بزانین لە زیاد بوندایە یان نا،

لەکۆتـاییـدا ئەم خـاڵانەم بۆ ئەوە نوســـیوە بۆ ئەوەی زیـاتر بەهرەمەنـد بین لەقوڕئانی پیرۆز لەکوێدا هەڵەمکردوە داوای لێبوردن لە خوای گەورە دەکەم وە داوا لە ئێوەش دەکەم بەدڵسۆزانە بۆمان ڕاست بکەنەوە.





**تەوەرەی سێیەم**

## مقاصد القرآن الكريم: ئامانجەکانی قورئانی پیرۆز

گومان لەوەدا نیە کە ئێمە لە دروســت کراوەکانی خوادا هیچ شــتێکی، بێ حیکمەت نابینین، ئەمەڕاســتیەکی زانســتیە، لەوانەیە مولحید هەبێ نکولی لەوە بکا بەڵام لێرەدا قســەی زانایان پشــتی پێ دەبەســترێ نەوەک قســەی مولحیدێک کە ئەو فەلسـەفەی بوونی خۆشـی نازانێ، لەناو دروست کراوەکانا دروســت کراوێکی تایبەت و ناوازەو هەڵبژاردە هەیە کە مرۆڤە، وە خوای گەورە ڕێزی لێگرتوەو پەیتا پەیتا بەرنامەی بۆ ڕەوان کردوە، تا کۆتا پێغەمبەر علیه الصلاة والسلام کە محمدی کوڕی عبد الله بوو، بوو بە کۆتا ڕەوانە کراوی خوای گەورەی بە بەزەیی، وە کۆتا پەیامی پێ سپارد کە قورئانی پیرۆزە،

کە پوختەی شــەریعەتەکانی تری تێدایە، ڕاســتیەکانیان پشــت ڕاســت دەکاتەوە و لادان و گۆڕین و دەسکاریەکانی شوێن کەوتوەکانیان ڕەتدەکاتەوە، هەموو پێویســتیەکانی ژیانی ئێمەی بۆ دین و دونیا، وە دونیاو دواڕۆژ لە خۆ گرتوە، بۆ ئەوە هـاتوە بیخوێنینەوە و لێی تێبگەین و کـاری پێ بکەین و بیگەیەنین، وەگومانیش لەوەدا نیە کە ئەم شــەریعەتە ئامانج دارە، دەیەوێ لەســەر زەوی ئـامـانجەکـانی بەدی بێنێ، وە خەڵکی ئەمڕۆ زیـاتر لەجـاران دەیانەوێ حیکمەت وئامانجی شــتەکان تێ بگەن بەتایبەت ئامانجەکانی شەریعەتی ئیسلام کە لە قورئاندا خۆی دەبینێتەوە، چونکە سونەتیش هاتوە بەیانی قورئان بکا، بۆیە پیم باش بوو لەم پێشــەکیە کەمێک تیشــک بخەمە ســەر ئامانجەکانی قورئانی پیرۆز (مقاصــد القرآن الكريم) بەخاڵ و تۆزێک بەچڕی.





## پێناسەی ئامانجەکانی قورئانی پیرۆز

- ✓ مقاصــد القرآن: هەموو ئەو ئامانج و مەبەســت و حیکمەتانەن کە قورئان دەیەوێ بیهێنێتەدی لە میانەی دەقەکانی و کۆی بابەتەکانی، کە ئەوەندە فراوانە کۆ ناکریتەوەو حصــر ناکرێ، (هی الغایات التی أنزل القرآن لأجلها تحقیقا لمصالح العباد) .
- ✓ معظم مقاصــد القرآن الامر بإکتســاب المصــالح وأســبابها، والزجر عن إکتساب المفاسد وأسبابها.
- ✓ هی المقاصــد اللتی دارت علیها ســور القرآن الکریم وآیاته تعریفا برســالة الاسلام ،وتحقیقا لمنهجه فی هدایة البشر.

لەم سـێ پێناسـەوە دەردەکەوێ کەقورئانی پیرۆز بەسـورەت و ئایەتەکانەوە هـاتـوە بـۆ ڕێـنـمـایـی مـرۆڤ و بەخـتەوەر کـردنـی و جـێ بەجـێ کـردنـی بەرژەوەندیەکانی و لێدور خسـتنەوەی مەفسـەدەو خراپەکان لەدونیاو دوا ڕۆژ دا، کەواتە مەقاصدی قورئانیش هەر ئەو ئامانجانەن کە لەپێناسەی مەقاصدی شـــەریعەت دا هـاتوە، بەڵام دەبێ بزانین مەقـاســـدی قورئـان فروانترە لە مەقاسـدی شـەریعە، وەبێ چەندو چونە، وەسـەرچاوەکە بێ گرفتە، بەڵام کە باسی شەریعە بکەین سەرچاوەکانی تریش دێنە ناو، کە ڕوونە زانایان لەسەر هەموویان کۆک نین.

١. معرفة الله وعبادته وتوحیده: گەورەترین ئامانجی قورئان ئەوەیە کە ئێمە خاوەنی خۆمان بناســین، بیپەرســتین، ڕەزامەندی ئەو بەدەســت بێنین، خۆشـمان بوێ، لێی بترسـین، بزانین مافی چیە بەسـەرمانەوە، ئەرکمان چیە بەرامبەری، بەکام ڕێگایە پێی بگەین، چ کەسێک بەئەومان شاددەکات، چۆن بۆی بژین، چۆن لەدەســتی نەدەین، چۆن تـامەزرۆی لیقـای بین، چۆن بەختەوەریمان لەناســینیدا بدۆزینەوە؟... وَمَا خَلَقْتُ ٱلْجِنَّ وَٱلْإِنسَ إِلَّا لِيَعْبُدُونِ (الذاریات: ٥٦)





٢. تزكيـة النفس وتربيته: دووەم ئـامـانجی قورئـان پەروەردەکردنی مرۆڤە، ئەوەیە کە ئەم مرۆڤە پێگەو پایەیی خۆی بزانێ، ئەرکی خۆی بزانێ، چۆن ببێتە رەحمەت بۆ دروســـت کراوەکانی تر، نەبیتە زەحمەت و مەینەت و ئازار، چۆن دەوری خۆی ببینێ، چونکە ئەگەر مرۆڤ پەروەردە بێ ژیـان خۆش و ئـارام دەبێ، ســـتەم و بێدادی نابێ مرۆڤەکان تام لەبونیان دەکەن، تەمەننای مردن ناکەن وەک ئەمڕۆ کەدەبینین و دەبیستین: قَدْ أَفْلَحَ مَن زَكَّىٰهَا (الشمس: ٩).

٣. تعمير الارض: ئاوەدان کردنەوەی زەوی و خۆش کردنی ژیان و ژینگە: هُوَ أَنشَأَكُم مِّنَ ٱلْأَرْضِ وَٱسْتَعْمَرَكُمْ فِيهَا فَٱسْتَغْفِرُوهُ ثُمَّ تُوبُوٓاْ إِلَيْهِ إِنَّ رَبِّى قَرِيبٌ مُّجِيبٌ (هود: ٦١)

٤. مقصد إبتلاء الانسان: ئامانجی تاقیکردنەوەی مرۆڤ، بەداخەوە زۆر کەس بەهەڵە لەمە تێدەگا بەڵام بەڕاســـتی تاقیکردنەوەی مرۆڤ و دەرفەت پێدان و ئازادی پێدانی گەورەترین ڕێزە بۆ مرۆڤ چۆن؟

چونکە هەموو مرۆڤایەتی تاقیکردنەوە بۆ گەیشتن بەئامانجەکان بەشانازی دەزانێ، ئەگەر کەســـێک بێ تاقیکردنەوە پلەیەک پۆســـتێک شـــەهادەیەک بەدەست بێنێ خەڵک متمانەی پێ ناکەن و گاڵتەی پێ دەکەن، تاقیکردنەوەکە لە توانـای مرۆڤ دایە، پرســـیـارەکـان بەهەموو کەس وەڵام دەدرێنەو ئەوەی کەژیری هەبێ ومکلف بێ، پرســـیـارەکـان خوات کێ یە؟پیغەمبەرت کێ یە؟دینت چیە؟ کەلە ســـەر ئەم زەویە پرســـیاری ئەوا ئاســـان نیە، بەمەرجێ پرســـیارەکان وەڵامیش دراونەوە بەس بیان پارێزە، هەموو ئەو کەســـانەش کەدەرفەتی پێگەیشتن و تێگەیشتنی ئەو پرسیارانەی نەبو خوای گەورە سزای نادا، وەک ئەوانەی پێغەمبەریان بۆ نەهاتووە، یان دینیان بە شـــێوێندراوی پێگەیشـتوە و دەرفەتی لێ حاڵی بوونیان بۆ نەرەخسـاوە، یان ئەوانەی بەهۆی نەبیسـتنی زگماکیەوە دینیان نەبیسـتوە، یان بەهۆی پیری و خەڵەفان نەیان





توانیوه تێی بگەن، یان ئەوانەی ژیریان نەبووە و یان لە دەســـتیان داوە، یان ئەوانەی کە منداڵن: وَمَا كُنَّا مُعَذِّبِينَ حَتَّىٰ نَبْعَثَ رَسُــولًا (الإسراء: ١٥) بەڵگەکانی ئامانجی تاقیکردنەوە زۆرن لەوانە: ٱلَّذِى خَلَقَ ٱلْمَوْتَ وَٱلْحَيَوٰةَ لِيَبْلُوَكُمْ أَيُّكُمْ أَحْسَــنُ عَمَلًا وَهُوَ ٱلْعَزِيزُ ٱلْغَفُورُ (الملك: ٢)

٥. مقصـــد تحقيق العدالة: ئامانجی پیادەکردنی دادگەری لەهەموو بوارەکان یەکێکە لە ئا مانج و مەبایدیئە بنچینەییەکان: لَقَدْ أَرْسَـلْنَا رُسُـلَنَا بِٱلْبَيِّنَـٰتِ وَأَنزَلْنَا مَعَهُمُ ٱلْكِتَـٰبَ وَٱلْمِيزَانَ لِيَقُومَ ٱلنَّاسُ بِٱلْقِسْـــطِ وَأَنزَلْنَا ٱلْحَدِيدَ فِيهِ بَأْسٌ شَـــدِيدٌ وَمَنَـٰفِعُ لِلنَّاسِ وَلِيَعْلَمَ ٱللَّهُ مَن يَنصُرُهُۥ وَرُسُـلَهُۥ بِٱلْغَيْبِ إِنَّ ٱللَّهَ قَوِىٌّ عَزِيزٌ (الحديد: ٢٥) بينات بەڵگەکان بۆ قەناعەت پێهێنانی ژیری و دڵ، کتاب بەرنامەی ژیانە، تەرازو بەدادگەری بەڕێوە بردنە، حەدید بۆ بەرگری لێکردن و پێشکەوتنە.

٦. مقصـــدكرامة ا لانســـان: ئەم کەرامەتە بۆ هەموو مرۆڤێکە: وَلَقَدْ كَرَّمْنَا بَنِىٓ ءَادَمَ وَحَمَلْنَـٰهُمْ فِى ٱلْبَرِّ وَٱلْبَحْرِ وَرَزَقْنَـٰهُم مِّنَ ٱلطَّيِّبَـٰتِ وَفَضَّــلْنَـٰهُمْ عَلَىٰ كَثِيرٍ مِّمَّنْ خَلَقْنَا تَفْضِيلًا (الإسراء: ٧٠)

٧. مقصـــد التعارف فی جعل الناس شـــعوبا وقبائل ومختلفا: خەڵک بۆیە جیاواز نیە دژو ناکۆک بن، بەڵکۆ بۆ ئەوەیە گفتوو گۆ بکەن، کار لەیەک بکەن، بەرژەوەندیەکانیان جێ بەجێ بکەن،

ئـاویتەی یەکتر بن و بەتەواوی لەخزمەتی یەکتر دابن: يَـٰٓأَيُّهَـا ٱلنَّـاسُ إِنَّـا خَلَقْنَـٰكُم مِّن ذَكَرٍ وَأُنثَىٰ وَجَعَلْنَـٰكُمْ شُــعُوبًا وَقَبَآئِلَ لِتَعَارَفُوٓا۟ إِنَّ أَكْرَمَكُمْ عِندَ ٱللَّهِ أَتْقَىٰكُمْ إِنَّ ٱللَّهَ عَلِيمٌ خَبِيرٌ (الحجرات: ١٣)





٨. مقصـــد التعاون بين الناس وإن كانوا مختلفين فى العقائد والمصـــالح: وَتَعَاوَنُواْ عَلَى ٱلْبِرِّ وَٱلتَّقْوَىٰ وَلَا تَعَاوَنُواْ عَلَى ٱلْإِثْمِ وَٱلْعُدْوَٰنِ وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ إِنَّ ٱللَّهَ شَدِيدُ ٱلْعِقَابِ (المائدة: ٢)

مرۆڤەکان ناتوانن بەبێ یەک بژین، وە پێویســتیان بەیەک دەبێ، با لە بیرو باوەڕ و بیرووڕاش جیاواز بن.

٩. مقصد الحرية: ئازادی چ لەبیروباوەڕ بێ یان لە بیروڕا بێ شەریعەت هاتوە دابینی بکا، بوونی مرۆڤ بەبیرو باوەڕیەتی ئەگەر نەتوانێ مومارەسـەی بیروڕاو بیروباوەڕی بکا بوونی هیچ واتایەکی نیە: لَآ إِكْرَاهَ فِى ٱلدِّينِ قَد تَّبَيَّنَ ٱلرُّشْدُ مِنَ ٱلْغَىِّ فَمَن يَكْفُرْ بِٱلطَّٰغُوتِ وَيُؤْمِنۢ بِٱللَّهِ فَقَدِ ٱسْتَمْسَكَ بِٱلْعُرْوَةِ ٱلْوُثْقَىٰ لَا ٱنفِصَامَ لَهَا وَٱللَّهُ سَمِيعٌ عَلِيمٌ (البقرة: ٢٥٦) وَلَوْلَا دَفْعُ ٱللَّهِ ٱلنَّاسَ بَعْضَهُم بِبَعْضٍ لَّهُدِّمَتْ صَوَٰمِعُ وَبِيَعٌ وَصَلَوَٰتٌ وَمَسَٰجِدُ يُذْكَرُ فِيهَا ٱسْمُ ٱللَّهِ كَثِيرًا وَلَيَنصُرَنَّ ٱللَّهُ مَن يَنصُرُهُۥٓ إِنَّ ٱللَّهَ لَقَوِىٌّ عَزِيزٌ (الحج: ٤٠)

ئەم ئایەتە پیرۆزە و ئایەتەکانی پێشـتر بێ پێچوپەنا باسی ئازادی بیرو باوەڕ دەکەن، وە یەکێک لە ئامانجەکانی ئیســلام بەرگری کردنە لە پیرۆزیەکانی خەڵک جا شـوێنی جولەکە بێ وەک بیع، یان مەسـیحیەکان صوامع، یان هی مسـوڵمانەکان بێ وەک مسـجد، یان هی هەموو دینەکان بێ وەک صلوات، هەرچەند موفەسـیرەکان ڕاڤەی جۆراو جۆریان بۆ ئەم وشـەیە کردوە بەڵام من پێم وایە باشــترین ڕاڤە ئەوەیە کەمەبەســت لەپیرۆزیەکانی دینەکانی هەوو دونیا بێ نەوەک دینێک بەتەنیا چونکە هەرکەس دینی هەبو هەر دینە با ڕاســتیش نەبێ مادام بە لایەوە پیرۆزە، خوای گەورە دەفەرموێ: لَكُمْ دِينُكُمْ وَلِىَ دِينِ (الكافرون: ٦) ٱلَّذِينَ أُخْرِجُواْ مِن دِيَٰرِهِم بِغَيْرِ حَقٍّ إِلَّآ أَن يَقُولُواْ رَبُّنَا ٱللَّهُ وَلَوْلَا





دَفۡعُ ٱللَّهِ ٱلنَّاسَ بَعۡضَهُم بِبَعۡضٖ لَّهُدِّمَتۡ صَوَٰمِعُ وَبِيَعٞ وَصَلَوَٰتٞ وَمَسَٰجِدُ يُذۡكَرُ فِيهَا ٱسۡمُ ٱللَّهِ كَثِيرٗاۗ وَلَيَنصُرَنَّ ٱللَّهُ مَن يَنصُرُهُۥٓۚ إِنَّ ٱللَّهَ لَقَوِيٌّ عَزِيزٌ ﴿٤٠﴾ الحج

١٠. مقصد حفظ الدين: دیارە ئەوەیان جیاوازە لە خاڵەکەی پێشتر، ئەوەی پێشتر بۆ ئازادییە، بەڵام ئەوەیان بۆ پاراستنە، پاراستن بە دوو شێوە دەبێ، شێوەی یەکەم بۆ دامەزراندن و بڵاو کردنەوە و ڕوونکردنەوە، شێوەی دووەم بۆ بەرگری لێکردن و پاراستنیەتی: وَقَٰتِلُوهُمۡ حَتَّىٰ لَا تَكُونَ فِتۡنَةٞ وَيَكُونَ ٱلدِّينُ لِلَّهِۖ فَإِنِ ٱنتَهَوۡاْ فَلَا عُدۡوَٰنَ إِلَّا عَلَى ٱلظَّٰلِمِينَ (البقرة: ﴿١٩٣﴾)

١١. مقصد حفظ النفس: پاراستنی گیانی مرۆڤ جا هەر بیروو باوەڕێکی هەبێ لە ئامانجە گەورەکانی شەریعەتە، بۆیە خوای گەورە سزای قورسی داناوە بۆ ئەو کەسانەی دەست درێژی دەکەنە سەرگیانی مرۆڤ یان ئەندامێکی یان مافێکی: يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ كُتِبَ عَلَيۡكُمُ ٱلۡقِصَاصُ فِي ٱلۡقَتۡلَىۖ ٱلۡحُرُّ بِٱلۡحُرِّ وَٱلۡعَبۡدُ بِٱلۡعَبۡدِ وَٱلۡأُنثَىٰ بِٱلۡأُنثَىٰۚ فَمَنۡ عُفِيَ لَهُۥ مِنۡ أَخِيهِ شَيۡءٞ فَٱتِّبَاعُۢ بِٱلۡمَعۡرُوفِ وَأَدَآءٌ إِلَيۡهِ بِإِحۡسَٰنٖۗ ذَٰلِكَ تَخۡفِيفٞ مِّن رَّبِّكُمۡ وَرَحۡمَةٞۗ فَمَنِ ٱعۡتَدَىٰ بَعۡدَ ذَٰلِكَ فَلَهُۥ عَذَابٌ أَلِيمٞ (البقرة: ﴿١٧٨﴾) وَلَكُمۡ فِي ٱلۡقِصَاصِ حَيَوٰةٞ يَٰٓأُوْلِي ٱلۡأَلۡبَٰبِ لَعَلَّكُمۡ تَتَّقُونَ (البقرة: ﴿١٧٩﴾)

وە ئەوە بەس بۆ بڕوادار نیە خوای گەورە دەفەرموێ: القتلى وە دەفەرموێ: وَلَا تَقۡتُلُواْ ٱلنَّفۡسَ ٱلَّتِي حَرَّمَ ٱللَّهُ إِلَّا بِٱلۡحَقِّۗ وَمَن قُتِلَ مَظۡلُومٗا فَقَدۡ جَعَلۡنَا لِوَلِيِّهِۦ سُلۡطَٰنٗا فَلَا يُسۡرِف فِّي ٱلۡقَتۡلِۖ إِنَّهُۥ كَانَ مَنصُورٗا (الإسراء: ﴿٣٣﴾).

١٢. مقصد حفظ العقل: پاراستنی ژیری مرۆڤ لەیەکێک لە ئامانجە گەورەکانی دینە، چونکە مرۆڤ بەهۆی ژیریەکەی بەرپرسیارە لە دونیا و دواڕۆژ، بۆیە هەرشتێک زیانی بە ژیری مرۆڤ بگەیەنێ شەریعەت قەدەغەی کردووە وەک مەی خواردنەوە، تریاک، حەشیش، هەموو ئەو دەرمانانەی بێ





پێویستی مرۆڤ بەکاریان دەهێنێ: يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِنَّمَا ٱلْخَمْرُ وَٱلْمَيْسِرُ وَٱلْأَنصَابُ وَٱلْأَزْلَٰمُ رِجْسٌ مِّنْ عَمَلِ ٱلشَّيْطَٰنِ فَٱجْتَنِبُوهُ لَعَلَّكُمْ تُفْلِحُونَ (المائدة: ٩٠) إِنَّمَا يُرِيدُ ٱلشَّيْطَٰنُ أَن يُوقِعَ بَيْنَكُمُ ٱلْعَدَٰوَةَ وَٱلْبَغْضَآءَ فِى ٱلْخَمْرِ وَٱلْمَيْسِرِ وَيَصُدَّكُمْ عَن ذِكْرِ ٱللَّهِ وَعَنِ ٱلصَّلَوٰةِ فَهَلْ أَنتُم مُّنتَهُونَ (المائدة: ٩١).

١٣. مقصد حفظ المال: ژیان بەماڵەوە بەردەوامەو ڕاوەستاوە و پێش دەکەوێ: وَلَا تُؤْتُواْ ٱلسُّفَهَآءَ أَمْوَٰلَكُمُ ٱلَّتِى جَعَلَ ٱللَّهُ لَكُمْ قِيَٰمًا ....... (النساء: ٥)

بۆیە گرنگە هەم ڕێگای بەدەست خستنی شەرعی بێ، وە هەم ڕێگای سەرف کردنی، وە هەموو جۆرەکانی دەست درێژی بۆ سەر ماڵی خەڵک قەدەغە کراوەو سزای بۆ داندراوە: وَٱلسَّارِقُ وَٱلسَّارِقَةُ فَٱقْطَعُوٓاْ أَيْدِيَهُمَا جَزَآءًۢ بِمَا كَسَبَا نَكَٰلًا مِّنَ ٱللَّهِ وَٱللَّهُ عَزِيزٌ حَكِيمٌ (المائدة: ٣٨) داگیر کردن بێ، بەگەندەڵی بێ، یان بەهەر شێوەیەک بێ.

١٤. مقصد حفظ النسل: پاراستنی وەچەی مرۆڤ لە ئامانجەکانی شەریعەتە، بۆ ئەوەی جۆری ئینسانی بە شێوەی تەندروست بمێنێتەوە خوای گەورە هەموو جۆرەکانی لادانی جنسی قەدەغە کردووە، خوای گەورە زینای حەرام کردوە و سزای بۆ دانەوە کە جەڵدە لێدانە: ٱلزَّانِيَةُ وَٱلزَّانِى فَٱجْلِدُواْ كُلَّ وَٰحِدٍ مِّنْهُمَا مِاْئَةَ جَلْدَةٍ وَلَا تَأْخُذْكُم بِهِمَا رَأْفَةٌ فِى دِينِ ٱللَّهِ إِن كُنتُمْ تُؤْمِنُونَ بِٱللَّهِ وَٱلْيَوْمِ ٱلْءَاخِرِ وَلْيَشْهَدْ عَذَابَهُمَا طَآئِفَةٌ مِّنَ ٱلْمُؤْمِنِينَ (النور: ٢).

وە هەتا بوختان کردنی قەدەغە کردوە و سزای بۆ داناوە: وَٱلَّذِينَ يَرْمُونَ ٱلْمُحْصَنَٰتِ ثُمَّ لَمْ يَأْتُواْ بِأَرْبَعَةِ شُهَدَآءَ فَٱجْلِدُوهُمْ ثَمَٰنِينَ جَلْدَةً وَلَا تَقْبَلُواْ لَهُمْ شَهَٰدَةً أَبَدًا وَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْفَٰسِقُونَ (النور: ٤) وە ئافرەتی داوێن پیسی قەدەغە کردوە لە پیاوی





داوێن پاک، وە بەپێچەوانەوە: ٱلزَّانِى لَا يَنكِحُ إِلَّا زَانِيَةً أَوْ مُشْرِكَةً وَٱلزَّانِيَةُ لَا يَنكِحُهَآ إِلَّا زَانٍ أَوْ مُشْرِكٌ وَحُرِّمَ ذَٰلِكَ عَلَى ٱلْمُؤْمِنِينَ (النور: ٣) واتە: پیاوی زیناکەر مارەی ناکات تەنها ئافرەتی زیناکەر و ئافرەتی موشـــریك نەبێ وە ئافرەتی زیناکەر مارەی ناکات پیاوی زیناکەر یا پیاوی موشـــریك نەبێ ئەو مارەکردن و شووکردن بە زیناکەرە یا ساغ کراوە لەسەر ئیمانداران.

وە دەفەرموێ: ٱلْخَبِيثَٰتُ لِلْخَبِيثِينَ وَٱلْخَبِيثُونَ لِلْخَبِيثَٰتِ وَٱلطَّيِّبَٰتُ لِلطَّيِّبِينَ وَٱلطَّيِّبُونَ لِلطَّيِّبَٰتِ أُوْلَٰٓئِكَ مُبَرَّءُونَ مِمَّا يَقُولُونَ لَهُم مَّغْفِرَةٌ وَرِزْقٌ كَرِيمٌ (النور: ٢٦) واتە: واڕاســـتە ئافرەتانی ناپاك بۆ پیاوانی ناپاك وە پیاوە پیســـەکان بۆ ئافرەتە پیســـەکان وە ئافرەتە پاکەکان بۆ پیاوە پاکەکان وە پیاوە پاکەکان بۆ ئافرەتە پاکەکان ئەو پاکانە بەری کراون لەو (تۆمەتانە) ی ناپاکان دەیڵێن بۆ ئەو پاك و چاکانەیە لێبووردن و ڕۆزی چاك و پیرۆز واتە بەهەشت.

وەخوای گەورە دابین کردنی پرۆســـەی زەواجی پێویســـت کردووە لەســـەر دەسەڵات و کۆمەڵگاو دەست ڕۆیشتوەکان: وَأَنكِحُواْ ٱلْأَيَٰمَىٰ مِنكُمْ وَٱلصَّٰلِحِينَ مِنْ عِبَادِكُمْ وَإِمَآئِكُمْ إِن يَكُونُواْ فُقَرَآءَ يُغْنِهِمُ ٱللَّهُ مِن فَضْلِهِۦ وَٱللَّهُ وَٰسِعٌ عَلِيمٌ (النور: ٣٢) واتە: ژن مـارە ببڕن بۆ پیـاوانی بێژن و ژنـانی بێ مێردیش بـدەن بەشوو(مێرد) هەروەها ئەوانەی گونجاون بۆ هاوسەرگیری لە کۆیلەکان (ژنیان بۆ بێنن) و کەنیزەکەکان (یش بدەن بەشوو) ئەگەر ئەوان هەژارو کەم دەست بن خوا لە بەخشندەی و بەهرەی خۆی دەوڵەمەندو بێ نیازیان دەکات وە خوا (بەهرە) فراوان و زانا و دانایە.

وە پێویســتی کردووە ئەوانەی ناتوانن زەواج بکەن خۆ بپارێزن: وَلْيَسْتَعْفِفِ ٱلَّذِينَ لَا يَجِدُونَ نِكَاحًا حَتَّىٰ يُغْنِيَهُمُ ٱللَّهُ مِن فَضْلِهِۦ وَٱلَّذِينَ يَبْتَغُونَ ٱلْكِتَٰبَ مِمَّا مَلَكَتْ أَيْمَٰنُكُمْ فَكَاتِبُوهُمْ إِنْ عَلِمْتُمْ فِيهِمْ خَيْرًا وَءَاتُوهُم مِّن مَّالِ ٱللَّهِ ٱلَّذِىٓ ءَاتَىٰكُمْ وَلَا تُكْرِهُواْ





فَتَيَـٰتِكُمْ عَلَى ٱلْبِغَآءِ إِنْ أَرَدْنَ تَحَصُّـنًا لِّتَبْتَغُواْ عَرَضَ ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا وَمَن يُكْرِههُّنَّ فَإِنَّ ٱللَّهَ مِنۢ بَعْـدِ إِكْرَٰهِهِنَّ غَفُورٌ رَّحِيمٌ (النور: ٣٣) واته: وه دەبێ ئـەوانـەی کـە توانـای (ئەرکی) ژن هێنانیان نیە پاکژ خۆیان ڕاگرن هەتا خوا بە بەهرە (و ڕۆزی) خۆی بێ نیازیان دەکات وە ئەوانەی داوای نوســراو دەکەن (بۆ کڕینـەوەی خۆیان) لە بەندەو کەنیزەکەکانتان ئەوە نوسراویان لەگەڵدا بنوسن (بۆ کڕینەوەو ئازاد بوونی خۆیان) ئەگەر خێرتان لەواندا بەدی دەکرد (کە بریتی یە لە توانای دانی ئەو پارەی ئەبێ بیدات بە خاوەنەکەی بۆ ئازاد بوونی) وە لەو ماڵەی کە خوا بە ئێوەی داوە پێیان بدەن وە کەنیزەکەکانتان زۆر لێ مەکەن (ناچاریان مەکەن) لەسـەر زینا کردن ئەگەر ئەیانویسـت داوێن پاك بن تا ماڵ و سـامانی ژیانی دنیاتان دەسـت کەوێت جا هەرکەس ناچاریان بکات (زۆریان لێ بکات) ئینجا بەڕاســتی خوا دوا ئـەو زۆر لێ کردنـەیان لێبووردەی میهرەبانـە (بەو کەنیزەکانە کە بە زۆر زینایان پێ کرا)وە پێشەکیەکانی زینای پێش پێ گرتوە.

وَلَا تَقْرَبُواْ ٱلزِّنَىٰٓ إِنَّهُۥ كَانَ فَـٰحِشَـةً وَسَـآءَ سَـبِيلًا (الإسراء: ٣٢) واتە: و نزیکی زیناش مەکەونەوە بەڕاستی ئەوە کردەوەیەکی زۆر ناشرین و ڕێگەیەکی پیس و خراپە. فەرمویەتی توخنی زینا مەکەون .

١٥. مقصـــد الهدایة: یەکێک لە ئامانجە پیرۆز و ســـەرەکیەکانی قورئـان هیـدایەتە: إِنَّ هَـٰـذَا ٱلْقُرْءَانَ يَهْـدِى لِلَّتِى هِىَ أَقْوَمُ وَيُبَشِّرُ ٱلْمُؤْمِنِينَ ٱلَّذِينَ يَعْمَلُونَ ٱلصَّـٰلِحَـٰتِ أَنَّ لَهُمْ أَجْرًا كَبِيرًا (الإسراء: ٩) واتە: بەڕاسـتی ئەم قورئانە ڕێنموونی دەکات بۆ ڕێباز و بەرنامەیەك کە ڕاسترینە و موژدەش دەدات بەو باوەڕدارانەی کە کردەوە چاکەکان دەکەن کە بە ڕاستی پاداشتی گەورەیان بۆ هەیە.

ئەم هیدایەتە گشت گیرە بۆ هەموو بوارەکانی ژیان .





١٦. مقصد الشفاء: له وەسفی قورئان ئەوەیە کە شیفاو چارەسەر بۆ روح و بۆ لاشــە، فعلەن قورئان شــیفایە بۆ نەخۆشــی بیرو باوەر، دەردی بەدرەوشــتی، کۆمەلاّیەتی، خێزانی، تاکی: وَنُنَزِّلُ مِنَ ٱلْقُرْءَانِ مَا هُوَ شِفَآءٌ وَرَحْمَةٌ لِّلْمُؤْمِنِينَ وَلَا يَزِيدُ ٱلظَّٰلِمِينَ إِلَّا خَسَارًا (الإسراء: ﴿٨٢﴾) واتە: وە لەم قورئانەدا دەنێرینە خوارەوە ئەوەی کە هۆی شــیفاو میهرەبانی یە بۆ بڕواداران بەلاّم (هاتنی ئەم قورئانە) بۆ ستەمکاران هیچ زیاد ناکات بێجگە لە خەسارەت مەندی.

وَلَوْ جَعَلْنَٰهُ قُرْءَانًا أَعْجَمِيًّا لَّقَالُوا۟ لَوْلَا فُصِّلَتْ ءَايَٰتُهُۥٓ ءَا۬عْجَمِيٌّ وَعَرَبِيٌّ قُلْ هُوَ لِلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ هُدًى وَشِفَآءٌ وَٱلَّذِينَ لَا يُؤْمِنُونَ فِىٓ ءَاذَانِهِمْ وَقْرٌ وَهُوَ عَلَيْهِمْ عَمًى أُو۟لَٰٓئِكَ يُنَادَوْنَ مِن مَّكَانٍۭ بَعِيدٍ ﴿٤٤﴾ فصــلت واتە: ئەگەر ئەم قورئانەمان بە زمانێ جگە لە عەرەبی بناردایە بێ باوەڕان دەیان وت بۆچی ئایەتەکانی بەڕوونی شــی نەکراونەتەوە (چۆن دەبێ) قورئانی عەجەمی و پێغەمبەری عەرەبی (ئەی موحەممەد(صــلی الله علیە وســلم)) بلێ: قورئـان بۆ کـەســانێ بـاوەڕیـان پێ ی هێنـاوە ڕێبـەرو چارەســەری گومانە وە ئەوانەی باوەڕی پێ نایەنن لە گوێیاندا گرانی و کەڕی هەیە (لە بیســتنی حەق) هەروەها لە ئاســت ئەو قورئانەدا کوێرن ئەوانە لە شوێنێکی زۆر دوورەوە بانگ دەکرێن.

١٧. مقصــد الرحمة والتراحم: قورئان وەســفێکی ئەوەیە کە رەحمەت بێ بۆ کۆمەڵگا، وە دەیەوێ ئەم رەحمەتە رەنگ بداتەوە لە دەیان دەقدا ئەمە هاتووە: يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ قَدْ جَآءَتْكُم مَّوْعِظَةٌ مِّن رَّبِّكُمْ وَشِفَآءٌ لِّمَا فِى ٱلصُّدُورِ وَهُدًى وَرَحْمَةٌ لِّلْمُؤْمِنِينَ (یونس: ﴿٥٧﴾) واتە: ئـەی خـەڵکینـە بێگومـان بۆتـان هـاتووە ئـامۆژگـاری (قورئان) لە لایەن پەروەردگارتانەوە وە شــیفا و چارەیە بۆ ئەوەی لە ناو دڵ و دەروونتان دایە وە ڕێنموونیی و میهرەبانیە بۆ بڕواداران.





١٨. مقصـــد إقامة الحجة على الانس والجان: قورئان هاتووه بۆ ئەوەی ڕێنمایی بێ بۆ مرۆڤایەتی و بەرچاو ڕوونیان بکا لە هەموو پێداویســـتیەکانی ژیان بۆ دین و دونیا، بۆ دونیاو دوا ڕۆژ: رُّسُلًا مُّبَشِّرِينَ وَمُنذِرِينَ لِئَلَّا يَكُونَ لِلنَّاسِ عَلَى ٱللَّهِ حُجَّةٌۢ بَعْدَ ٱلرُّسُلِ وَكَانَ ٱللَّهُ عَزِيزًا حَكِيمًا (النساء: ١٦٥) واتە: پێغەمبەران(مان ناردووە) کە موژدە دەرن و ترسێنەرن بۆ ئەوەی بۆ خەڵکی نەبێت بەڵگە بەسەر خواوە دوای(ناردنی) پێغەمبەران وە خوا هەمیشە زاڵی کار دروستە.

١٩. مقصــد تعليم وتعلم الجدال باللتی هی أحســن: لەوانەیە هەندێ کەس ئینکاری ئەو ئامانجە بکا بەڵام بەراســـتی زۆر ئامانجێکی گەورەیە، چونکە گەورەترین جۆری هیدایەت لەڕێی بەیان و گفتو گۆ وە دەبێ چۆن نابێ ئەوە ئامانج بێ: ٱدْعُ إِلَىٰ سَبِيلِ رَبِّكَ بِٱلْحِكْمَةِ وَٱلْمَوْعِظَةِ ٱلْحَسَنَةِ وَجَٰدِلْهُم بِٱلَّتِى هِىَ أَحْسَنُ إِنَّ رَبَّكَ هُوَ أَعْلَمُ بِمَن ضَلَّ عَن سَبِيلِهِۦ وَهُوَ أَعْلَمُ بِٱلْمُهْتَدِينَ (النحل: ١٢٥) واتە: خەڵکی بانگ بکە بۆ ڕێگەی پەروەردگارت بە لێزانی و دانایی و ئامۆژگاری چاك و شیرین وە لە گەڵیان بدوێ (موجادەلە بکە) بدوێ بەچاکترین شێوە بێگومان پەروەردگارت خۆی چاك دەزانێ بەوانەی گومڕابوون و لایاندا وە لە ڕێگاکەی وە هەر خۆشی زانایە بەوانەی لەسەر ڕێگای ڕاستن.

لەم ئایەتە پیرۆزە جوانترین شـێوازەکانی جیدالمان فێردەکا، وتەی جوان و ســەرنج ڕاکێش، لێزانی و لێهاتوی و هەڵبژاردنی کات و شــوێن و ئەندازە و جۆری حیوارەکە، ئەوجار لە جوانترین شــێواز و بەرزترین ئاســتی ئەخلاقی دابێ، وە ئامانج تێیدا گەیشـــتن بە هەق و ڕاســتی بێ، وە خوای گەورە بۆ گەیشتن بەراستی دوو ڕێگامان نیشان دەدا کە سێ یەمی نیە: قُلْ إِنَّمَآ أَعِظُكُم بِوَٰحِدَةٍ أَن تَقُومُوا۟ لِلَّهِ مَثْنَىٰ وَفُرَٰدَىٰ ثُمَّ تَتَفَكَّرُوا۟ مَا بِصَاحِبِكُم مِّن جِنَّةٍ إِنْ هُوَ إِلَّا نَذِيرٌ لَّكُم بَيْنَ يَدَىْ عَذَابٍ شَدِيدٍ (سبأ: ٤٦) واتە: بڵێ من تەنیا بەیەك شــت ئامۆژگاریتان دەکەم کە دوو دوو یەك یەك لەبەر خوا هەڵســن پاشــان





بیربکەنەوە هاوڕێکەتان (پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم)) شێت نی یە ئەو (پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم)) تەنیا ترسێنەرە بۆ ئێوە لە پێش هاتنی سزای سەختی قیامەت.

چونکە هەریەکێ بیەوێ بگا بەراستی یان دەبێ لەگەڵ یەکێکی دانا و زانا گفتوو گۆ بکا، یان دەبێ بەتەنیا دابنیشێ و بیربکاتەوە و خۆی لە بڕیار و قەناعەتی پێش وەختە دابڕنێ، ئەگەر وای کرد حەتمەن دەگا بەراستی.

٢٠. مقصد الانصاف مع الموافق والمخالف: قورئان زۆر پێگیری دەکا لەسەر دادگەری و ئینساف هەتا لەگەڵ ناحەزەکانیش، قورئان دەفەرموێ: قُل لَّا تُسْـَٔلُونَ عَمَّآ أَجْرَمْنَا وَلَا نُسْـَٔلُ عَمَّا تَعْمَلُونَ (سبأ: ٢٥) واتە: بڵێ: پرسیارتان لێ ناکرێ لە تاوانێ کە ئێمە کردوومانە ئێمەش پرسیارمان لێ ناکرێ لەوەی ئێوە دەیکەن.

ئەوەی خۆت ناو بنێ تاوان بەڵام مەرج نیە ئەوەی بەرامبەر هەمان ناو بنێی، چونکە کەسی نەیار و ڕاجیا لەگەڵ تۆ هەتالەگەڵی بەرەحم و بەویژدانتر بی زیاتر کاریگەر دەبێ بەقسەو هەڵویستەکانت.

٢١. مقصد تحقيق الاعجاز: چونکە هەرکات ئیعجازی قورئان ئیسپات کراو سەلمێنرا ئەوە کەسی بەرامبەر یان دانی پێدا دێنێ، یان بێ دەنگ دەبێ و ناتوانێ قسەبکا، بۆیە دەبێ کار بکرێ لەسەر ئەم ئامانجە گەورەیە قورئانی پیرۆزیش چەندین جار ئەم راستیەی دوو پات کردۆتەوە لەوانە: قُل لَّئِنِ ٱجْتَمَعَتِ ٱلْإِنسُ وَٱلْجِنُّ عَلَىٰٓ أَن يَأْتُواْ بِمِثْلِ هَٰذَا ٱلْقُرْءَانِ لَا يَأْتُونَ بِمِثْلِهِۦ وَلَوْ كَانَ بَعْضُهُمْ لِبَعْضٍ ظَهِيرًا (الإسراء: ٨٨) واتە: ئەی (موحەممەد(صلى الله عليه وسلم)) بڵێ سوێند بەخوا ئەگەر ئادەمی و پەری هەموو کۆببنەوە بۆ ئەوەی وێنەی ئەم قورئانە بێنن ناتوانن وێنەی ئەو بێنن هەرچەندە پشتیوانی یەکتریش بن.





أَمْ يَقُولُونَ ٱفْتَرَىٰهُ قُلْ فَأْتُوا۟ بِعَشْرِ سُوَرٍ مِّثْلِهِۦ مُفْتَرَيَٰتٍ وَٱدْعُوا۟ مَنِ ٱسْتَطَعْتُم مِّن دُونِ ٱللَّهِ إِن كُنتُمْ صَٰدِقِينَ (هود: ١٣) واته: یان ئەوانە دەڵێن پێغەمبەر(صـــلی الله علیه وسلم) ئەو (قورئانە) ی هەڵبەستووە بڵێ دەی ئێوەش دە سورەتی وەکو ئەو (قورئانە) بێنن هەڵبەســـتراوبن وە بانگ بکەن (بۆ پشـــتیوانیتان) هەرکەس دەتوانن بێجگە لە خوا ئەگەر ئێوە ڕاست دەکەن.

أَمْ يَقُولُونَ ٱفْتَرَىٰهُ قُلْ فَأْتُوا۟ بِسُـــورَةٍ مِّثْلِهِۦ وَٱدْعُوا۟ مَنِ ٱسْـــتَطَعْتُم مِّن دُونِ ٱللَّهِ إِن كُنتُمْ صَٰدِقِينَ (یونس: ٣٨) واته: یان دەڵێن (موحەممەد(صلی الله علیه وسلم)) خۆی ئەم قورئانەی هەڵبەستووە بەدەم خواوە بەوانە بڵێ سورەتێك بهێنن وەك ئەو و هەرکەسێك کە دەتوانن بانگی بکەن بێجگە لەخوا ئەگەر ئێوە ڕاست دەکەن.

جاری یەکەم تەحەدا بەهەموو قوڕئانە، جاری دووە بە دە ســـورەتە، جاری سێ یەم بەیەک سورەتە، هەتا ئیستاش ئەم تەحەدایە وەڵام نەدراوەتەوە.

٢٢. مقصـــد الفقه والفهم: ئەم قوڕئانە بۆیە هاتووە تا ئێمە لە شـــتەکان تێ بگەین بەوردی چونکە(فقه) واتـــا دەبێ بەوردی و بەجوانی لێی تێبگەین حوکمی لەســـەر بدەین، بۆیە پێویســـت دەکا خەڵکانێک تایبەت کەین و هاوکاریان بین لە تێگەیشتنی ورد لە قوڕئان وەک دەفەرموێ: وَمَا كَانَ ٱلْمُؤْمِنُونَ لِيَنفِرُوا۟ كَآفَّةً فَلَوْلَا نَفَرَ مِن كُلِّ فِرْقَةٍ مِّنْهُمْ طَآئِفَةٌ لِّيَتَفَقَّهُوا۟ فِى ٱلدِّينِ وَلِيُنذِرُوا۟ قَوْمَهُمْ إِذَا رَجَعُوٓا۟ إِلَيْهِمْ لَعَلَّهُمْ يَحْذَرُونَ (التوبة: ١٢٢) واته: وە نەدەبوو باوەڕداران تێکڕا هەموو دەرچن و بڕۆن (بۆ جیهاد) دەی با بڕۆن لە هەموو کۆمەڵێکیان چەند کەسـێك بۆ ئەوەی لە ئاینەکەیان تێ بگەن و شـــارەزابن بۆ ئەوەی هۆزەکەیان (شـــارەزا بکەن و) بترسێنن کاتێ گەڕانەوە (لە جیهاد) بۆ لایان بۆ ئەوەی ئەوان (شارەزا ببن) بێدار ببنەوە.





وە دەربارەی فەهم و بریاری دروست دەفەرموێ: وَدَاوُۥدَ وَسُلَيۡمَٰنَ إِذۡ يَحۡكُمَانِ فِي ٱلۡحَرۡثِ إِذۡ نَفَشَتۡ فِيهِ غَنَمُ ٱلۡقَوۡمِ وَكُنَّا لِحُكۡمِهِمۡ شَٰهِدِينَ (الأنبياء: ٧٨) واتە: باسی داوودو سولەیمان بکە کاتێ بڕیاریان دەرکرد دەربارەی ئەو کشتوکاڵەی کە بەشەو ئاژەڵی کەسانێك تێیدا لەوەڕابوون (زیانیان لێ دابوو) وە ئێمە بۆ دادوەری بڕیارەکەیان ئامادە(ئاگادار) بووین.

فَفَهَّمۡنَٰهَا سُلَيۡمَٰنَۚ وَكُلًّا ءَاتَيۡنَا حُكۡمًا وَعِلۡمًاۚ وَسَخَّرۡنَا مَعَ دَاوُۥدَ ٱلۡجِبَالَ يُسَبِّحۡنَ وَٱلطَّيۡرَۚ وَكُنَّا فَٰعِلِينَ (الأنبياء: ٧٩) واتە: ئەوسا ئێمە ئەوە (دادوەری چاکتر) مان فێری سولەیمان کرد(سولەیمان وتی: ئاژەڵە زیان خۆرەکە بدرێتە دەست خاوەن کشتوکاڵەکە کەڵك لە شیرو بەرهەمیان وەربگرێ وە کشتوکاڵەکەش بدرێتە دەست خاوەن ئاژەڵەکە بەروبوومەکەی بخۆن و خزمەتی بکەن تا وەك پێش زیان لێکەوتنەکەی لێ دێتەوە لەو کاتەدا ئاژەڵەکە بگەڕێتەوە بۆ خاوەنەکەی و کشتوکاڵەکەش بۆ خاوەنەکەی) وە بەر هەر یەك لەو دووانە (داوود و سولەیمان) پێغەمبەرێتی (دادوەری) و زانستمان پێدان وە ڕاممان هێنا لەگەڵ داوودا چیاکان و باڵندەکە تەسبیحاتی خوایان دەکرد وە هەر ئێمە ئەوەمان کرد بۆ داوود.

ئەمە فەهمی وردە کە چاکترین چارەسەرە بدۆزینەوە بۆ کێشەکان نەوەک چاک بەتەنیا، لێرەدا با ئەوەی داود هەڵەش نەبوبێ، بەڵام بڕیارەکەی سولەیمان وردترو لەجێ تر بو.

٢٣. مقصد إحقاق الحق وإبطال الباطل: خوای گەورە ڕووداو گەلێک دێنێتە پێش بۆ ئەو ئامانجە چ لەسەر ئاستی تاک چ لەسەر ئاستی کۆمەڵگا، یان لەنێوان دوو گروپی ناکۆک و دژ بەیەک: وَإِذۡ يَعِدُكُمُ ٱللَّهُ إِحۡدَى ٱلطَّآئِفَتَيۡنِ أَنَّهَا لَكُمۡ وَتَوَدُّونَ أَنَّ غَيۡرَ ذَاتِ ٱلشَّوۡكَةِ تَكُونُ لَكُمۡ وَيُرِيدُ ٱللَّهُ أَن يُحِقَّ ٱلۡحَقَّ بِكَلِمَٰتِهِۦ





وَيَقْطَعَ دَابِرَ ٱلْكَٰفِرِينَ (الأنفال: ٧) واتە: بیری ئەو کاتە بکەنەوە کە خوا بەڵێنی بە ئێوەدا دەســـت کەوتی یەکێك لەو دوو کۆمەڵە(کاروانە بازرگانی یەکە یان سـەرکەوتن بە سـەریاندا) بەڕاسـتی دەبێتە هی ئێوە وە ئێوە پێتان خۆشـە کە ئـەو دەســـتکەوتـە بێ چـەکـە،(کـاروانـە بـازرگـانـی یـە) بۆ ئێوە بێت بـەڵام خوا دەیەوێت وتەکانی خۆی بەڕاسـت دەرچێ(حەق سـەرکەوێ) و ڕەگ و ڕیشـەی بێ باوەڕان لە بن بێنێ.

لِيُحِقَّ ٱلْحَقَّ وَيُبْطِـلَ ٱلْبَٰطِـلَ وَلَوْ كَرِهَ ٱلْمُجْرِمُونَ (الأنفـال: ٨) واتە: تـا هـەق جێگیر بکات و ناحەقیش لە ناو بەرێ و پوچەڵ بکاتەوە با تاوانبارانیش پێیان ناخۆش بێت.

٢٤. مقصد البيان التام ليهلك من هلك عن بينة، ويحى من حى عن بينة: ئەمەیان تەواوکاری ئەوی پێشترە بە شێوازێکی جیاواز، خوای گەورە دەفەرموێ ڕوودوای بەدر هاتە پێش و یارمەتی خوا بە شێوە سەر سوڕمانە هات بۆ ئەو ئامانجە پیرۆزە: إِذْ أَنتُم بِٱلْعُدْوَةِ ٱلدُّنْيَا وَهُم بِٱلْعُدْوَةِ ٱلْقُصْوَىٰ وَٱلرَّكْبُ أَسْفَلَ مِنكُمْ وَلَوْ تَوَاعَدتُّمْ لَٱخْتَلَفْتُمْ فِى ٱلْمِيعَٰدِ وَلَٰكِن لِّيَقْضِىَ ٱللَّهُ أَمْرًا كَانَ مَفْعُولًا لِّيَهْلِكَ مَنْ هَلَكَ عَنۢ بَيِّنَةٍ وَيَحْيَىٰ مَنْ حَىَّ عَنۢ بَيِّنَةٍ وَإِنَّ ٱللَّهَ لَسَمِيعٌ عَلِيمٌ (الأنفال: ٤٢) واتە: وەختێ ئێوە لای خواری (شیوەکەی) نزیك( مەدینە) دا بوون و ئەوانیش لە لای سەرووی (شیوەکەی) دوورتر(لە مەدینە) دا بوون کاروانەکەش لە خوارتری ئێوە بوو وە ئەگەر بەڵێنتان بەیەکتر بدایە بێگومان جیاواز دەبوون لە بەڵێنەکەدا(جەنگتان نەدەکرد) بەڵام(کۆی کردونەتەوە) بۆ ئەوەی خوا کارێك بەدی بێنێت هەر بەدی دێت بۆ ئەوەی لە ناو بچێ ئەو کەسەی (بەلای خواوە) لەناو چووە لە ڕووی بەڵگەوە وە بۆ ئەوەی بژی ئەوەی (بەلای خواوە) دەژی لە ڕووی بەڵگەوە وە بەڕاستی خوا بیسەری زانایە.





٢٥. مقصد إزالة الشبهات: قورئانی پیرۆز بەشێوەیەکی گشتی کار لەسەر دوو تەوەرە دەکا:

یەك: سەلماندن و چەسپاندنی حەق.

دوو: پوکاندنەوە و پوچەڵ کردنەوەی ناحەق.

بۆیە زۆر بەرچاومان دەکەوێ کە خوای گەورەی گومانەکان پوچەڵ دەکاتەوە، یان لەڕێی پێغەمبەرەکانیەوە، یان لەسەر زمانی پیاوە داناو زاناکانەوە.

بۆ نمونە، خوای گەورە دەفەرموێ: قُلْ مَن رَّبُّ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ قُلِ ٱللَّهُ قُلْ أَفَٱتَّخَذْتُم مِّن دُونِهِۦٓ أَوْلِيَآءَ لَا يَمْلِكُونَ لِأَنفُسِهِمْ نَفْعًا وَلَا ضَرًّا قُلْ هَلْ يَسْتَوِى ٱلْأَعْمَىٰ وَٱلْبَصِيرُ أَمْ هَلْ تَسْتَوِى ٱلظُّلُمَٰتُ وَٱلنُّورُ أَمْ جَعَلُوا۟ لِلَّهِ شُرَكَآءَ خَلَقُوا۟ كَخَلْقِهِۦ فَتَشَٰبَهَ ٱلْخَلْقُ عَلَيْهِمْ قُلِ ٱللَّهُ خَٰلِقُ كُلِّ شَىْءٍ وَهُوَ ٱلْوَٰحِدُ ٱلْقَهَّٰرُ (الرعد: ١٦) واتە: ئەی (موحەممەد(صلى الله عليه وسلم)) بڵێ کێ پەروەردگاری ئاسمانەکان و زەوی یە بڵێ خوا جا بڵێ دەی ئێوە بێجگە لەو (خوا) پشتیوانێکتان هەڵبژاردووە (بۆ خۆتان) کە خاوەنی هیچ سوود و زیانێك نین بۆ خۆشیان بڵێ ئایا کوێر و چاو ساغ یەکسانن؟ یان ئایا تاریکیەکان و ڕووناکی وەك یەك وان؟ نەخێر ئەی ئەوانە چەند هاوبەشێکیان بۆ خوا داناوە؟ (گوایە) وەك دروستکراوانی خوایان دروست کردبێ؟ ئەوسا دروست کراوەکەیان لێ شێواوە ! بڵێ خوا دروست کاری هەموو شتێکە و هەر ئەویشە تاك و تەنیای زاڵە بەسەر هەموو شتێکدا.

لیرەدا بەڵگە هێنانەوەیە بۆ پوچی بت و پەرستراوەکان، یان دەفەرموی: وَٱتَّخَذُوا۟ مِن دُونِهِۦٓ ءَالِهَةً لَّا يَخْلُقُونَ شَيْـًٔا وَهُمْ يُخْلَقُونَ وَلَا يَمْلِكُونَ لِأَنفُسِهِمْ ضَرًّا وَلَا نَفْعًا وَلَا يَمْلِكُونَ مَوْتًا وَلَا حَيَوٰةً وَلَا نُشُورًا (الفرقان: ٣) واتە: بێجگە لە خوا چەند پەرستراوێکیان بۆ خۆیان بڕیار داوە کە هیچ شتێك دروست ناکەن بەڵکو





خۆشیان دروست کراون دەسەڵاتیان نی یە بۆ خۆیان نەزیان نەسوود و قازانج (بگەیەنن) هەروەها مردن و ژیان و زیندوو بوونەوەی خۆیان بەدەس نییە.

یان لەسەر زمانی پێغەمبەرەکان دەفەرموێ: قَالَ فِرْعَوْنُ وَمَا رَبُّ ٱلْعَٰلَمِينَ (الشعراء: ﴿٢٣﴾) ئینجا فیرعەون وتی پەروەردگاری جیهانیان کێ یە.

قَالَ رَبُّ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ وَمَا بَيْنَهُمَآ إِن كُنتُم مُّوقِنِينَ (الشعراء: ﴿٢٤﴾) مووسا وتی پەوەردگاری ئاسمانەکان و زەوی و هەرچی لە نێونیان دایە ئەگەر دڵنیان. ئەوە وەلامی موسا بوو سەلامی خوای لێبێ.

فرعەون دەیەوێ چەواشە کاری بکا: قَالَ لِمَنْ حَوْلَهُۥٓ أَلَا تَسْتَمِعُونَ (الشعراء: ﴿٢٥﴾) فیرعەون وتی بەوانەی بەدەوری دا بوون (لە شوێنکەوتوانی) ئایا گوێتان لێیە چی دەڵێ؟

قَالَ رَبُّكُمْ وَرَبُّ ءَابَآئِكُمُ ٱلْأَوَّلِينَ (الشعراء: ﴿٢٦﴾) مووسا وتی پەروەردگاری ئێوەو پەوەردگاری باوك و باپیرە پێشووەکانتانە.

بەڵگەیەکی تری بۆ هێنایەوە کە تێیدا خوایەتی فرعەونی پوچ کردەوە: قَالَ إِنَّ رَسُولَكُمُ ٱلَّذِىٓ أُرْسِلَ إِلَيْكُمْ لَمَجْنُونٌ (الشعراء: ﴿٢٧﴾) فیرعەون بە دەوروبەرەکانی وت دەبینن کە پێغەمبەرەکەتان ژیری لەدەست داوە.

مووسا وتی پەوەردگاری ڕۆژهەڵات و ڕۆژ ئاوایە و ئەوەی لە نێوانیاندایە ئەگەر ئێوە بیر بکەنەوەو ژیر بن.

فیرعەون چۆن وەلاّم دەداتەوەو ؟ : قَالَ لَئِنِ ٱتَّخَذْتَ إِلَٰهًا غَيْرِى لَأَجْعَلَنَّكَ مِنَ ٱلْمَسْجُونِينَ (الشعراء: ﴿٢٩﴾) فیرعەون وتی سوێند بێ ئەگەر پەرستراوێ تر جگە لەمن دابنێیت بێگومان دەتخەمە ڕیزی بەند کراوەکانەوەو زیندانت دەکەم.





فیرعەون لە مەیدانی بەڵگەدا بەزیوە پەنا بۆ هەرەشە دەبا، بەڵام موسا بەوریای ڕێگەی ئەمەشی لێ دەگرێ و دەڵێ ئەگەر بەڵگەشت بۆ بێنم هەر دەمگری؟ فیرعەون نایەوێ تاوانبار و بەزیو دیار بێ، بۆیە دەڵێ دەی بەڵگەکەت بێنە،

ئەگەر بەنمونە موئمینی ئالی فیرعەون بێنینەوە لە چەندین ئایەتدا واتە لە ئایەتی ٢٨_٤٥ ئەم گفتوو گۆیە بەردەوامە دەبینی لەم کات و ئاهەنگە گەورەدا چۆن ژیرانە دیفاع لە موسا دەکا و چۆن حیوارەکە دەباتەوە، کەواتە ئەمە ئامانجێکی قورئانییە کە ئێمە گومانەکان بڕەوێنینەوە.

٢٦. مقصـد إثبات العقيدة بإيراد الحجج وإزالة الشـبه: بیرو باوەڕ لە هەموو شـتێک گرنگترە، وە بەردی بناغەی شـەریعەت و پابەندیە بۆیە قورئان پریەتی لە گفتوگۆی عقدی بیرو باوەڕ، بۆ نمونە باسـی ئیسـپاتی ربوبیەت و ئولوهیەت بەچەندین شێوە بەڵگە دێنێتەوە:

قُلِ ٱلْحَمْدُ لِلَّهِ وَسَلَٰمٌ عَلَىٰ عِبَادِهِ ٱلَّذِينَ ٱصْطَفَىٰٓ ءَآللَّهُ خَيْرٌ أَمَّا يُشْرِكُونَ (النمل: ٥٩) أَمَّنْ خَلَقَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ وَأَنزَلَ لَكُم مِّنَ ٱلسَّمَآءِ مَآءً فَأَنۢبَتْنَا بِهِۦ حَدَآئِقَ ذَاتَ بَهْجَةٍ مَّا كَانَ لَكُمْ أَن تُنۢبِتُوا۟ شَجَرَهَآ أَءِلَٰهٌ مَّعَ ٱللَّهِ بَلْ هُمْ قَوْمٌ يَعْدِلُونَ (النمل: ٦٠) أَمَّن جَعَلَ ٱلْأَرْضَ قَرَارًا وَجَعَلَ خِلَٰلَهَآ أَنْهَٰرًا وَجَعَلَ لَهَا رَوَٰسِىَ وَجَعَلَ بَيْنَ ٱلْبَحْرَيْنِ حَاجِزًا أَءِلَٰهٌ مَّعَ ٱللَّهِ بَلْ أَكْثَرُهُمْ لَا يَعْلَمُونَ (النمل: ٦١) أَمَّن يُجِيبُ ٱلْمُضْطَرَّ إِذَا دَعَاهُ وَيَكْشِفُ ٱلسُّوٓءَ وَيَجْعَلُكُمْ خُلَفَآءَ ٱلْأَرْضِ أَءِلَٰهٌ مَّعَ ٱللَّهِ قَلِيلًا مَّا تَذَكَّرُونَ (النمل: ٦٢). أَمَّن يَهْدِيكُمْ فِى ظُلُمَٰتِ ٱلْبَرِّ وَٱلْبَحْرِ وَمَن يُرْسِلُ ٱلرِّيَٰحَ بُشْرًۢا بَيْنَ يَدَىْ رَحْمَتِهِۦٓ أَءِلَٰهٌ مَّعَ ٱللَّهِ تَعَٰلَى ٱللَّهُ عَمَّا يُشْرِكُونَ (النمل: ٦٣) أَمَّن يَبْدَؤُا۟ ٱلْخَلْقَ ثُمَّ يُعِيدُهُۥ وَمَن يَرْزُقُكُم مِّنَ ٱلسَّمَآءِ وَٱلْأَرْضِ أَءِلَٰهٌ مَّعَ ٱللَّهِ قُلْ هَاتُوا۟ بُرْهَٰنَكُمْ إِن كُنتُمْ صَٰدِقِينَ (النمل: ٦٤)





٢٧. مقصـــد التجاوب مع الفطرة الســـليمة: قورئان ئامانجی ئەوەیە مرۆڤ بگێڕێتەوە بۆ سـەر فیترەت و سروشـتی پاکی خۆی، چونکە دینەکەی موافقی ئەم سروشـتەیە: فَأَقِمْ وَجْهَكَ لِلدِّينِ حَنِيفًا فِطْرَتَ ٱللَّهِ ٱلَّتِي فَطَرَ ٱلنَّاسَ عَلَيْهَا لَا تَبْدِيلَ لِخَلْقِ ٱللَّهِ ذَٰلِكَ ٱلدِّينُ ٱلْقَيِّمُ وَلَٰكِنَّ أَكْثَرَ ٱلنَّاسِ لَا يَعْلَمُونَ (الروم: ٣٠) واتە: کەواتە ڕووی خۆت ڕێك بکەرە ئاینی ئیســـلام پاك و ڕاســـت بۆ خوا(شـــوێن ئاینی) داهێنراوی خوا بکەوە کە خەڵکی لەسـەر دروست کردووە داهێنراوی خوا هیچ جۆر گۆڕانی بۆ نییە ئەو (ئاییینەی باسکرا) هەر ئەوە ئاییینی ڕێك و ڕاست بەڵام زۆربەی ئادەمی نازانن.

٢٨. مقصـــد تعلیل الاحکام والاحداث: قورئـان زۆر هانمـان دەدا بۆ ئەوەی حیکمەتی شـــتەکان بزانین و پشـــتی ڕوداوەکان بخوێنینەوە، هەم بۆ ئەوەی بزانین بۆ ڕویدا؟ هەمم بۆ ئەوەی بزانین نەتیجەکەی چ بوو، هەم بۆ چارەسـەر کردن و دەست خستنە سەر برین، بۆ حوکمەکانیش هەر راستە هیچ حوکمێک نیە لە قورئانی پیرۆزدا یان بە وردی یان بەگشتی حیکمەت و فەلسەفەی دیار نەبێ جا بەندایەتی بێ، ئەخلاق بێ، عەقیدە بێ، تەشریع بێ یان ڕووداو.

٢٩. مقصـد تجاوز ا لزمان والمکان والاشـخاص فی سـرد القصـص والأمثال: گرنگە لەوە تێ بگەین سـەربردە و ڕوداوەکان تەنیا مێژوپەکی ڕووت و تایبەت بەکات و شوێن و خەڵکانێک نین کە ڕویانداوە، بەڵکو بۆ ئەوەیە هەمیشە ئەم شـتانە زیندو بمێنن و بیان کەین بە پێوەر و مەحەک بۆ ڕووداوەکان: فَٱعْتَبِرُواْ يَٰٓأُوْلِي ٱلْأَبْصَٰرِ (الحشر: ٢)

30. مقصـــد التوازن فی العمل والمواقف: هاوســـەنگی زۆر گرنگە هەتا لە بەخشینیشدا هەر پێویستە خوای گەورە دەفەرموێ:





وَٱلَّذِينَ إِذَآ أَنفَقُواْ لَمۡ يُسۡرِفُواْ وَلَمۡ يَقۡتُرُواْ وَكَانَ بَيۡنَ ذَٰلِكَ قَوَامًا (الفرقان: ٦٧) واته: وه کەسانێکن کاتێ ماڵ و سامان خەرج دەکەن (بۆ خۆیان و خێزانیان) نە زیادە ڕەوی و نە ڕەزیلی و دەست نوقاوی (تێدا) ناکەن (بەڵکو) مام ناوەندیە لەو نێوانەدا.

هەموو بونەوەر بە هاوسەنگی ڕاوەستاوە: وَٱلسَّمَآءَ رَفَعَهَا وَوَضَعَ ٱلۡمِيزَانَ (الرحمن: ٧) واتە: وە ئاسمانی بڵندو بەرز کردۆتەوە وە تەرازو (ی عەدالەتی) داناوە. میزان بریتی یە لە هاوسەنگی.

٣١. مقصد تقرير حقوق الانسان : لەو خاوەن مافانە:

- ✓ مافی باب و دایک
- ✓ مافی خێزان
- ✓ مافی مێرد
- ✓ مافی هاوبەشی هەردووکیان
- ✓ مافی مناڵ
- ✓ مافی بەساڵاچوان
- ✓ مافی نەخۆشەکان
- ✓ کەم ئەندامان
- ✓ مافی کرێکار
- ✓ مافی ژێر دەستەکان
- ✓ مافی پەنابەر
- ✓ مافی ڕێبوار
- ✓ مافی گیراو ئەسیر
- ✓ مافی زیندانی
- ✓ مافی گەورەی وەڵات





- مافی هاوڕێ
- مافی جیران
- مافی غەیرە مسوڵمان
- مافی تۆمەت بار
- مافی تاوانبار
- مافی مردو
- مافی ئەوانەی نەخۆشی دەرونیان هەیە
- مافی بێوەژنەکان
- مافی قەیرەکان
- مافی سەفیرو نوێنەرەکان
- مافی کارمەند

جا ئەو مافانە هە موو جۆرە مافەکان دەگریتەوە .

٣٢. مقصــــد حق الدفاع: قورئان لە چەندین دەقدا ئەم مافەی باس کردوەو یەکێکە لەئامانجەکان: وَمَا لَكُمْ لَا تُقَاتِلُونَ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ وَٱلْمُسْتَضْعَفِينَ مِنَ ٱلرِّجَالِ وَٱلنِّسَآءِ وَٱلْوِلْدَانِ ٱلَّذِينَ يَقُولُونَ رَبَّنَآ أَخْرِجْنَا مِنْ هَٰذِهِ ٱلْقَرْيَةِ ٱلظَّالِمِ أَهْلُهَا وَٱجْعَل لَّنَا مِن لَّدُنكَ وَلِيًّا وَٱجْعَل لَّنَا مِن لَّدُنكَ نَصِيرًا (النســـاء: ٧٥) واتە: ئەوە چیتانە (بەچ بیانوویەك) جەنگ ناکەن لە پێناوی خوادا و لە پێناوی چەوســـاوەکان لە پیاوان و ئافرەتان و مندالان ئەوانەی کە دەڵێن ئەی پەروەردگارمان ڕزگارمان کەی لەم شارە کە خەڵکەکەی ستەمکارن وە لەلایەن خۆتەوە دڵسۆزێکمان بۆ بەدی بهێنە وە لەلایەن خۆتەوە بەدی بهێنە بۆمان یارمەتی دەرێك.

وە دەفەرموێ: ٱلشَّهْرُ ٱلْحَرَامُ بِٱلشَّهْرِ ٱلْحَرَامِ وَٱلْحُرُمَٰتُ قِصَاصٌ فَمَنِ ٱعْتَدَىٰ عَلَيْكُمْ فَٱعْتَدُواْ عَلَيْهِ بِمِثْلِ مَا ٱعْتَدَىٰ عَلَيْكُمْ وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ وَٱعْلَمُوٓاْ أَنَّ ٱللَّهَ مَعَ ٱلْمُتَّقِينَ (البقرة: ١٩٤) واتە: مانگی ئاگربەســـت بەرانبەر بە مانگی ئاگربەســـت شـــکاندنی هەر





ڕێزێکیش تۆڵەی هەیە جا هەر کەسێک دەست درێژی کردە سەرتان ئێوەش دەست درێژی بکەنە سەری بەوێنەی دەست درێژ کردنەکەی ئەو بۆ ئێوە وە لەخوا بترسن وە بزانن کەخوا لەگەڵ پارێزکارانە.

٣٣. مقصد تقرير مصير ا لشعوب: گەلێک مادام خوای گەورە دروستی کردووە مافی ئەوەشی هەیە کە سەرەوەری و وەڵات و ماف و ئاڵا و سیادەی هەبێ، خوای گەورە دەفەرموێ: يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ إِنَّا خَلَقْنَٰكُم مِّن ذَكَرٍ وَأُنثَىٰ وَجَعَلْنَٰكُمْ شُعُوبًا وَقَبَآئِلَ لِتَعَارَفُوٓاْ إِنَّ أَكْرَمَكُمْ عِندَ ٱللَّهِ أَتْقَىٰكُمْ إِنَّ ٱللَّهَ عَلِيمٌ خَبِيرٌ (الحجرات: ١٣) واتە: ئەی خەڵکینە بێگومان ئێمە دروستمان کردوون لە نێرو مێ یەك وە کردومانن بە چەند گەل و هۆزەوە تا یەکتری بناسن بەڕاستی بەڕێز ترینتان لای خوا پارێزگار ترینتانە بێگومان خوا زانای ئاگادارە.

مادام گەل هەبێ پێویستی بەخاکە، پێویستی بەدەسەڵات و بەرێوە بردن و ئازادی هەیە.

٣٤. مقصد تحقيق الأمن: ئەمن و ئاسایش یەکێکە لە نیعمەتە گەورەکان نەوەک بۆ ئینسان بەڵکو بۆ زیندەوەران، بەڵکو بۆ ژیان و ژینگە: ٱلَّذِيٓ أَطْعَمَهُم مِّن جُوعٍ وَءَامَنَهُم مِّنْ خَوْفٍ (قريش: ٤) واتە: ئەو زاتەی کە لە برسێتی دا(ڕزگاری کردن و) خواردەمەنی بۆ ناردن وە لە ترس و بیم(پاراستنی و) دڵنیای کردن.

٣٥. مقصد التعلم والتعليم: قورئانی پیرۆز لە یەکەم ئایەتێک کە دابەزیوە باسی خوێندنەوە و خوێندەواری کردوە: ٱقْرَأْ بِٱسْمِ رَبِّكَ ٱلَّذِى خَلَقَ (العلق: ١) واتە: ئەی موحەممەد(صلى الله عليه وسلم) بخوێنە بە ناوی پەروەردگارتەوە کە هەموو شتێکی دروست کردووە.

٣٦. مقصد أكل الحلال والطيبات: پێکهاتەی لاشەی مرۆڤ ئەوشتانەیە کە دەیخوا، بۆیە پێویستە مرۆڤ شتی پاک و خاوێن بخوا: ٱلَّذِينَ يَتَّبِعُونَ ٱلرَّسُولَ





ٱلنَّبِيَّ ٱلۡأُمِّيَّ ٱلَّذِي يَجِدُونَهُۥ مَكۡتُوبًا عِندَهُمۡ فِي ٱلتَّوۡرَىٰةِ وَٱلۡإِنجِيلِ يَأۡمُرُهُم بِٱلۡمَعۡرُوفِ وَيَنۡهَىٰهُمۡ عَنِ ٱلۡمُنكَرِ وَيُحِلُّ لَهُمُ ٱلطَّيِّبَٰتِ وَيُحَرِّمُ عَلَيۡهِمُ ٱلۡخَبَٰٓئِثَ وَيَضَعُ عَنۡهُمۡ إِصۡرَهُمۡ وَٱلۡأَغۡلَٰلَ ٱلَّتِي كَانَتۡ عَلَيۡهِمۡۚ فَٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ بِهِۦ وَعَزَّرُوهُ وَنَصَرُوهُ وَٱتَّبَعُواْ ٱلنُّورَ ٱلَّذِيٓ أُنزِلَ مَعَهُۥٓ أُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡمُفۡلِحُونَ (الأعراف: ١٥٧) واتە: ئەوانەی کە شـــوێن پێغەمبەر و نێردراوی نەخوێندەوار دەکەون(کە لە لایەن پەروەردگارەوە هاتووە) ئەو کەسەی کە(نامە دارەکان) دەیبینن بە نووســـراویی لایانە لە تەورات و ئینجیل دا کە فەرمانیان پێ دەکات بە چاکە و ڕێگرییان لێ دەکات لە خراپە شــتەخاوێن و پاکەکانیان بۆ حەڵاڵ دەکات وە شتە پیسەکانیان لێ حەرام(قەدەغە) دەکات و بارە قورس و گرانەکانیان و ئەو کۆت و زنجیرانەش کە بەســەریانەوە بوون لا دەبات ئەنجا ئەو کەســـانەی کە باوەڕیان بەو(پێغەمبەرە) هێنابێت و ڕێز و قەدریان بۆ دانابێت یارمەتیان دابێت و پشـــتیوانیان لێ کردبێت و پەیڕەوی ئەو نوورەیان کردبێت(کە قورئانە) کە لەگەڵیدا نێرراوەتە خوارەوە ئەوان هەموو(کە باسکران) لەڕزگار بووانن.

لە موهیمەی پێغەمبەری ئازیز ئەوەیە پاک حەڵاڵ بکا و پیس قەدەغە بکا.

٣٧. مقصـد تكوين الاسـرة: خوای گەورە دەفەرموێ: وَأَنكِحُواْ ٱلۡأَيَٰمَىٰ مِنكُمۡ وَٱلصَّٰلِحِينَ مِنۡ عِبَادِكُمۡ وَإِمَآئِكُمۡۚ إِن يَكُونُواْ فُقَرَآءَ يُغۡنِهِمُ ٱللَّهُ مِن فَضۡلِهِۦۗ وَٱللَّهُ وَٰسِعٌ عَلِيمٌ (النور: ٣٢) واتە: ژن مـارە ببڕن بۆ پیـاوانی بێ ژن و ژنـانی بێ مێردیش بدەن بەشـــوو (مێرد) هەروەها ئەوانەی ئیمان دارو چاکن لە کۆیلەکان (ژنیان بۆ بێنن) و کەنیزەکەکان (یش بدەن بەشـوو) ئەگەر ئەوان هەژارو کەم دەست بن خوا لە بەخشـندەی و بەهرەی خۆی دەوڵەمەندو بێ نیازیان دەکات وە خوا (بەهرە) فراوان و زانا و دانایە.





بەپێی ئەم دەقە پیرۆزە هەموو کەس مافی زواجی هەیە، جا ژن بێ، یان پیاو، کچ بێ یان کوڕ، ئازاد بێ یان نا، خوای گەورە بەڵێنی دەوڵەمەندی بەهەموان داوە.

**زەواج چەندین ئامانجی گەورەی تێدایە، لەوانە:**

- ✓ جێ بەجێ هێنانی فەرمانی خوا.
- ✓ سونەتی پێغەمبەران.
- ✓ تەواو بوونی دینداری.
- ✓ فراوانبوونی بازنەی بەرپرسیاریەتی.
- ✓ پەیوەندیە کۆمەڵایەتیەکان.
- ✓ بەردەوام بوونی جۆری مرۆی بەشێوە هەرە جوانەکەی.
- ✓ دەرگای ڕزق و ڕۆزی.
- ✓ ئارامی.
- ✓ خۆشەویستی .
- ✓ بەزەیی و میهرەبانی.
- ✓ تەندروستی.
- ✓ کەم کردنەوەی تاوان، بەتایبەت تاوانە جنسیەکان.
- ✓ دیاربوونی نەسەب و کەس و کارو بنەماڵە.
- ✓ پارێزران لە نەخۆشیە جنسیەکان.
- ✓ هەروەها نەبوونی جێگرەوی ڕاستەقینە بۆ زواج.

٣٨. مقصد إنصاف المرءة: پێش کەوتنی هەر کۆمەڵگایەک بە ئافرەت پێوانە دەکرێ، هەر کۆمەڵگایەک ڕێزی ئافرەتی گرت و مافی پێداو لە شوێنی شایەنی خۆی دانا پێشکەوتوە، ئەگینا بە بانگەشەو قسەی گەورە گەورە نییە: فَٱسْتَجَابَ لَهُمْ رَبُّهُمْ أَنِّي لَآ أُضِيعُ عَمَلَ عَٰمِلٍ مِّنكُم مِّن ذَكَرٍ أَوْ أُنثَىٰ بَعْضُكُم مِّنۢ بَعْضٍ فَٱلَّذِينَ هَاجَرُواْ وَأُخْرِجُواْ مِن دِيَٰرِهِمْ وَأُوذُواْ فِي سَبِيلِي وَقَٰتَلُواْ





وَقُتِلُواْ لَأُكَفِّرَنَّ عَنۡهُمۡ سَيِّـَٔـاتِهِمۡ وَلَأُدۡخِلَنَّهُمۡ جَنَّٰتٖ تَجۡرِي مِن تَحۡتِهَا ٱلۡأَنۡهَٰرُ ثَوَابٗا مِّنۡ عِندِ ٱللَّهِۚ وَٱللَّهُ عِندَهُۥ حُسۡنُ ٱلثَّوَابِ (آل عمران: ١٩٥) واتە: ئینجا پەروەردگاریان وەڵامی(نزاکانی) دانەوە (فەرمووی) بێگومان من زایە ناکەم کردەوەی (هیچ) خاوەن کردەوەیەک لە ئێوە لە نێر یان مێ هەندێکتان لە هەندێکی ترتان بوون جا ئەوانەی کە کۆچیان کرد و دەرکران لە جێ و شوێنی خۆیان و ئەشـکەنجەو ئازار دران لە ڕێی مندا و جەنگیان کرد و کوژران سـوێند بەخوا دەسـڕمەوە لێیان خراپەکانیان وە بێگومان دەیان خەمە بەهەشـتانێکەوە کە ڕووبارەکان دێن و دەچن بەژێریاندا ئەمە پاداشـت دانەوەیەکە لە لای خواوە، وە لای خوایە جوانترین(چاکترین) پاداشت.

إِنَّ ٱلۡمُسۡلِمِينَ وَٱلۡمُسۡلِمَٰتِ وَٱلۡمُؤۡمِنِينَ وَٱلۡمُؤۡمِنَٰتِ وَٱلۡقَٰنِتِينَ وَٱلۡقَٰنِتَٰتِ وَٱلصَّٰدِقِينَ وَٱلصَّٰدِقَٰتِ وَٱلصَّٰبِرِينَ وَٱلصَّٰبِرَٰتِ وَٱلۡخَٰشِعِينَ وَٱلۡخَٰشِعَٰتِ وَٱلۡمُتَصَدِّقِينَ وَٱلۡمُتَصَدِّقَٰتِ وَٱلصَّٰٓئِمِينَ وَٱلصَّٰٓئِمَٰتِ وَٱلۡحَٰفِظِينَ فُرُوجَهُمۡ وَٱلۡحَٰفِظَٰتِ وَٱلذَّٰكِرِينَ ٱللَّهَ كَثِيرٗا وَٱلذَّٰكِرَٰتِ أَعَدَّ ٱللَّهُ لَهُم مَّغۡفِرَةٗ وَأَجۡرًا عَظِيمٗا (الأحزاب: ٣٥) واتە: بەڕاسـتی پیاوە موسـوڵمانەکان و ئافرەتە موسـوڵمانەکان وە پیاوە باوەڕدارەکان و ئافرەتە باوەڕدارەکان و پیاوانی هەمیشە گوێڕایەڵ و ئافرەتانی هەمیشە گوێڕایەڵ و پیاوە ڕاست گۆکان و ئافرەتە ڕاست گۆکان و پیاوان و ئافرەتانی خۆگرو بەئارام وە پیاوانی لەخوا ترس و ژنانی لەخوا ترس و پیاوان و ئافرەتانی بەخشـندە و پیاوان و ئافرەتانی ڕۆژووەوان پیاوان و ئافرەتانی داوێن پاك پیاوانێ کە زۆر یادی خوا دەکەن و ئافرەتانێ کە زۆر یادی خوا دەکەن خوا ئامادەی کردووە بۆ هەموویان لێخۆش بوون و پاداشتی گەورە.

هُنَّ لِبَاسٞ لَّكُمۡ وَأَنتُمۡ لِبَاسٞ لَّهُنَّ (البقرة: ١٨٧) وَلَهُنَّ مِثۡلُ ٱلَّذِي عَلَيۡهِنَّ بِٱلۡمَعۡرُوفِ(البقرة: ٢٢٨)





٣٩. مقصد تحصين الاسرة: ئەوەی پێشووتر باسی دروست کردنی خێزان بوو بەڵام ئەم ئامانجە باسی پاراستنیەتی، شەریعەت یاساو ڕێسای زۆری داناوە بۆ پاراســتنی خێزان، وە لە کاتی پێویســتدا ســزاشــی داناوە، لە شەریعەت دا بەدرێژی باسی مافی ژن، مافی پیاو، مافی مناڵ، مافی باوک و دایک و خزمان و ئادابی چونە ماڵان و تێکەڵاو بوون و باســی مەحرەم و بێگانەوە و هەتا ئەدەبی هەڵس و کەوتی مناڵیش باسی کراوە.

٤٠. مقصد التربية: پەروەردەی مرۆڤ یەکێکە لە ئامانجە گەورەکان کە لە ســەرەتا ئاماژەمان پێدا، بەڵام مەبەســتمانە لێرەدا ڕوونتر ناوی جۆری پەروەردەکان بێنین بۆ ئەوەی بەرچاومان ڕوون بێ و کاری لەســەر بکەین لەوانە:

- پەروەردی ئیمانی
- پەروەردەی بەندایەتی
- پەروەردەی ئەخلاقی
- پەروەردەی کۆمەڵایەتی
- پەروەردەی ژیریی
- پەروەردەی تەندروستی وەرزشی
- پەروەردەی دەرونی
- پەروەردە بە سزا
- پەروەردە بە ئامۆژگاری
- پەروەردە بەهاندان
- پەروەردە بە دیاری پێدان
- پەروەدە بەگێرانەوەی چیرۆک
- پەروەردە بەکردەوە
- پەروەردە بەهۆی هاوڕێ و شوێنی باش





- پەروەدە بەخۆشویستن
- پەروەردە لەڕێی ماموٚستای باش
- پەروەردە لە ڕێی گەشەکردنی مرۆیی
- پەروەردەی زاستی
- پەروەردەی میدیایی

بەڕاستی دەکرێ بواری پەروەردە زۆر فراوان بکرێ و گرنگی زیاتری پێ بدرێ، ئەوەی کە باس کرا بەس بۆ بەرچاو روونییە لەم بوارەوە شتی زۆر جوان و بەسود نوسراوە، وە بەردەوام خول و وۆرک شۆپ هەیە لەم وارانەدا.

٤١. مقصد حوار الادیان: ئەم بابەتە جیاوازە لە ئازادی بیروباوەڕ، مەبەست لێرەدا ئەوەیە گفتوگۆمان هەبێ لەگەڵ دینە جیاوازەکان چونکە قورئان باسی دینەکانی تریشی کردوە و رەخنەی لێگرتون وتەحەدای کردون و پرسیاری لێکردون و وەڵامی پرسیاری ئەوانی داوەتەوە لە:

- ✓ جولەکە
- ✓ مەسیحی
- ✓ مەجوسی
- ✓ موشریک
- ✓ دەهری
- ✓ مولحید
- ✓ صابیئە

وەچەندین بیرو باوەری تر...

٤٢. مقصد تکوین الامة الشهیدة: وَكَذَٰلِكَ جَعَلۡنَٰكُمۡ أُمَّةٗ وَسَطٗا لِّتَكُونُواْ شُهَدَآءَ عَلَى ٱلنَّاسِ وَيَكُونَ ٱلرَّسُولُ عَلَيۡكُمۡ شَهِيدٗا (البقرة: ١٤٣)





ئوممەت نابێتە چاوەدێر بەبێ ئەوەی ئیسلام جێ بەجێ بکا.

٤٣. مقصـــد تكوين خير الامـة : لە کـاتێـک دا ئەم ئوممەتە چـاکترین ئوممەت بوو بە شـاهیدی نەیارەکانی ئەم دینە، ئەو کاتانە بوو فەرمانی بە چاکە دەکرد، نەهی لە خراپە دەکرد، ئیمانی راستەقینەی بە خوا بە دوا ڕۆژ بوو.

كُنتُمْ خَيْرَ أُمَّةٍ أُخْرِجَتْ لِلنَّاسِ تَأْمُرُونَ بِٱلْمَعْرُوفِ وَتَنْهَوْنَ عَنِ ٱلْمُنكَرِ وَتُؤْمِنُونَ بِٱللَّهِ وَلَوْ ءَامَنَ أَهْلُ ٱلْكِتَـٰبِ لَكَانَ خَيْرًا لَّهُم مِّنْهُمُ ٱلْمُؤْمِنُونَ وَأَكْثَرُهُمُ ٱلْفَـٰسِقُونَ (آل عمران: ١١٠) واتە: ئێوە(موسـولْمانان) باشـترین گەلێک بوون بۆ خەڵکی هێنرابێتە دی فەرمان دەدەن بەچاکە وە جڵەوگیری دەکەن لە خراپە وە بڕوا دەهێنن بەخوا ئەگەر نامە دارەکان بڕوایان بهێنایە ئەوە باشـتربوو بۆیان هەندێ لەوان بڕوادارن بەڵام زۆربەیان لە فەرمانی خوا دەرچوون.

٤٤. مقصـد تكوين الامة الواحدة: هەتا هەنگاوێک لەخوا نزیک تر بین لە یەکبوون نزیـک تر دەبین: إِنَّ هَـٰذِهِۦٓ أُمَّتُكُمْ أُمَّةً وَٰحِدَةً وَأَنَا۠ رَبُّكُمْ فَٱعْبُدُونِ (الأنبياء: ٩٢) واتە: بەڕاستی ئا ئەمەیە ئایینی ئێوە کە یەك ئایینە (ئایینی هەموو پێغەمبەران) و منیش پەروەردگارتانم کەواتە تەنها من بپەرستن.

وَأَطِيعُوا۟ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ وَلَا تَنَـٰزَعُوا۟ فَتَفْشَلُوا۟ وَتَذْهَبَ رِيحُكُمْ وَٱصْبِرُوٓا۟ إِنَّ ٱللَّهَ مَعَ ٱلصَّـٰبِرِينَ (الأنفال: ٤٦) واتە: باوەڕداران گوێڕایەڵی خواو پێغەمبەرەکەی بن وە جیاواز مەبن و دووبەرەکی مەکەن بەهۆیەوە بشـکێن و لاواز ببن و هێزتان بڕواو نەمێنێ وە خۆ ڕاگربن بەڕاستی خوا لەگەڵ خۆڕگراندایە.

٤٥. مقصـد تكوين الامة الوسطية: میانەڕەوی ئەو خەسڵەتەیە کە دەبێ هەم تـاک هەم کۆمەڵگا پێیەوە پابەند بێ، چونکە زیادەڕەوی، یان کورت





ڕەوی، إفراط یـان تفریط هیچی قبوڵ نییە لە خـاڵێکـدا بـاسـی ئەو ئامانجەمان کردبوو بەناوی هاوسەنگی.

٤٦. مقصـد السـلام العالمی: ئەگەر بێت و ئاشـتی و ئەمنی بێ، دینی ئیسـلام لە هەموو دینەکانی تر زیاتر سـود دەبینێ و گەشـە دەکا، خوای گەورە ناوی(السلام)ە، ئیسلام ناوی السلم ە، بەهەشت ناوی السلام ە، پەیوەندی نێوان خەڵک دەبێ سەلام و سەلام کردن بێ، ئەسڵ لە پەیوەندی نێوان خەڵک تعاروف و سـەلام و سـیلم و ئاشـتیە، شـەڕکردن حاڵەتی نائاساییە.

٤٧ مقصـد التسـامح الدینی والانسـانی: لێبوردەیی ئەو ڕەوشـتەیە کە هەموو مرۆڤایەتی لەسـەری کۆکە کەس نیە بانگەشـەی بۆ نەکاو شـانازی پێوە نەکـا، هەتـا خوای گەورە لەگەڵ بێبـاوەڕانیشـدا بـاسـی ئەو ئامانجەیکردوە، وەک دەفەرموێ: فَٱصۡفَحِ ٱلصَّفۡحَ ٱلۡجَمِيلَ (الحجر: ﴿٨٥﴾) صـفح ڕوو لێوەرگێرانە بەجوانی، وەدەفەرموێ: وَٱصۡبِرۡ عَلَىٰ مَا يَقُولُونَ وَٱهۡجُرۡهُمۡ هَجۡرٗا جَمِيلٗا (المزمل: ﴿١٠﴾) دان بە خۆتدا بگرە لەسـەر ئەو قسـانەی کە دەیڵێن وە وازیـان لێ بێنـەو لێیـان گـەڕێ بـە واز لێهێنـانێکی جوان وە دەفەر موێ: فَٱصۡبِرۡ صَبۡرٗا جَمِيلًا (المعـارج: ﴿٥﴾) واتە: کـەوا بوو خۆت ڕابگرە (ئـەی موحەممەد(صلى الله عليه وسلم)) بە خۆڕاگرتنێکی چاك و جوان.

کەواتە: الصفح الجمیل، والصبر الجمیل، والهجر الجمیل، لەگەڵ کافرانیشدا مەتڵوبەو فەرمانی پێکراوە چ جای لەگەڵ مسوڵمانان.

٤٨. مقصـد تکوین القوة: ئێمە کە باسـی ئاشـتی دەکەین مانای ئەوە نیە کە بروامـان بەهێز نیە، بەڵام هێز بۆ بەرگری کردن و پـاراسـتنی چەوسـاوەو موقەدەسـات و مافی مرۆڤەکان و ڕەتکردنەوەی دەسـت درێژیە، نەوەک داگیر







کردن و خۆســـەپاندن و قۆرخ کردن و گەندەڵکردن و مافی خەڵک بردن وەک ئەوەی لەمڕۆدا دەیبینین.

خوای گەورە دەفەرموێ: وَأَعِدُّواْ لَهُم مَّا ٱسْتَطَعْتُم مِّن قُوَّةٍ وَمِن رِّبَاطِ ٱلْخَيْلِ تُرْهِبُونَ بِهِۦ عَدُوَّ ٱللَّهِ وَعَدُوَّكُمْ وَءَاخَرِينَ مِن دُونِهِمْ لَا تَعْلَمُونَهُمُ ٱللَّهُ يَعْلَمُهُمْ وَمَا تُنفِقُواْ مِن شَيْءٍ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ يُوَفَّ إِلَيْكُمْ وَأَنتُمْ لَا تُظْلَمُونَ (الأنفال: ٦٠) واتە: ئەی ئیمانداران ئامادەی بکەن بۆیان ئەوەی لە تواناتاندا هەیە لە هێز وە لە ئەسپی دابەستراو تا بترسێنن پێ ی دوژمنی خواو دوژمنی خۆتان وە کەسانێکی تریش بێجگە لەوان ئێوە نایان ناسن خوا دەیانناسێ وە هەرشتێك ببەخشن لەڕێ ی خوادا (پاداشتەکەی) بەتەواوی دەدرێتەوە پێتان وە ئێوە هیچ ستەمتان لێ ناکرێت.

ئەگەر هێزت نەبێ داگیرت دەکەن سنورە کانت دەبەزێنن بۆیە هێز پێویستە، بەڵام هێز تەنیـا هێزی چەکـداری و بەرگری نیە، هێزی ئیمـان، هێزی تەکنەلۆجیا، هیزی ڕەوشـــت، هیزی بەدەنی، هێزی ڕوحی، هێزی ئـابوری، هێزی سیاسی ...

٤٩. مقصـــد التعرف على الآعداء من الداخل والخارج: هەرکەســـێ ناحەزی دین و ژینی نەناسێ دەکەوێتە داوی دوژمن بێ ئەوەی هەستی پێبکا، بەڵکو جـاری وایە خزمەتـی دوژمـن دەکەی بەخـۆت نـازانـی، بـۆیە خـوای گەورە ئاگادارمان دەکاتەوە لەم بابەتە دەفەرموێ:

يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لَا تَتَّخِذُوا عَدُوِّي وَعَدُوَّكُمْ أَوْلِيَاءَ تُلْقُونَ إِلَيْهِم بِالْمَوَدَّةِ وَقَدْ كَفَرُوا بِمَا جَاءَكُم مِّنَ الْحَقِّ يُخْرِجُونَ الرَّسُولَ وَإِيَّاكُمْ ۙ أَن تُؤْمِنُوا بِاللَّهِ رَبِّكُمْ إِن كُنتُمْ خَرَجْتُمْ جِهَادًا فِي سَبِيلِي وَابْتِغَاءَ مَرْضَاتِي ۚ تُسِرُّونَ إِلَيْهِم بِالْمَوَدَّةِ وَأَنَا أَعْلَمُ بِمَا أَخْفَيْتُمْ وَمَا أَعْلَنتُمْ ۚ وَمَن يَفْعَلْهُ مِنكُمْ فَقَدْ ضَلَّ سَوَاءَ السَّبِيلِ (الممتحنة: ١) واتە: ئەی ئەو کەسانەی کـە بـاوەڕتـان هێنـاوە دوژمنـانی من و خۆتـان مـەکـەن بـەدۆســـتی خۆتـان





دۆســـتایەتی خۆتانیان بۆ دەنێرن لە کاتێکدا دڵنیاشـــن ئەوان بێ باوەڕن بەو ئایینە ڕاســتەی کە بۆتان هاتووە پێغەمبەر(صــلی الله علیه وســلم) و ئێوەش دەردەکەن (لە بەرئەوەی) کە باوەڕ دەهێنن بە خوای پەروەردگارتان جا ئەگەر دەرچوون لـە وڵاتی خۆتـان بۆ جـەنـگ کردن لـە ڕێ ی منـا وە بۆ داواکردنی خۆشـــنوودی من (دۆســـتایەتی ئەوان مەکەن) ڕازو نهێنی یان پێ دەڵێن بە دۆستایەتی لە کاتێکدا من پێ ی ئەزانم بەوەی شاردتانەوە و بەوەی ئاشکراتان کرد وە هەر کەسێك لە ئێوە دۆستایەتیان بکات ئەوە بێگومان ڕێ ی ڕاستی ون کردووە.

٥٠. مقصـــد ترتیب الاولویة فی المصـــالح والمفاســـد: ئەمەش ئامانجێکی گەورەیی قورئانیە نابێ فەرامۆشـــی کەین هەرکەس ئەولەویەی فەرامۆش کا دەستی خۆی دەبەستێ لە کارەکانی دین و دونیایی، بەسەر هاتی موسا لەگەڵ پیاو چاکەکە کەناوی خدر بوو ئەوەمان فێر دەکا کە ئەم بەسەر هاتە لە ئایەتی ٦٠_٨٢ واتە بیســـت و دوو ئایەتی لەم ســـورەتە پیرۆزە گرتوە، وە لەچەندین شوێنی قوڕئان دا لە موناسەبەی جیاوازدا باسی کراوە.

٥١. مقصد مراعاة الرخص والضروریات: ئەسڵ ئەوەیە مسوڵمان پابەند بێ بە عەزیمەت و فەرمان و نەهیەکان، ئەگەر هۆکارێک نەبوو لامان دا لەم ئەســڵە، بەڵام ئەگەر هۆکارمان هەبوو دەتوانین روخسەت بەکاربێنین بەڵکو جاری وایە پێویســـت دەبێ، ئەســـڵ وایە لە مانگی ڕەمەزاندا بە ڕۆژو بین، بەڵام ئەگەر نەخۆش بووین لە ســـەفەر بووین، یان ئافرتان بیانوی تایبەتی خۆیان هەبوو بەڕۆژو نابێ، وە نوێژیش هەر وایە، بەڵام لە ســـەفەردا کۆدەکرێتەوە و کورت دەکرێتەوە، یان بەهۆی باران و نەخۆشــی کۆی دەکەینەوە، یان بەهۆی شــەڕو مەترسـی گۆڕانکاری زیاتریشـی بەسـەر دا دێ، مردارەوە بوو حەرامە بەڵام ئەی ئەگەر ناچار بوین؟ کوفر کردن جائیز نییە بەڵام ئەدی ئەگەر فشارێکی ئەوەندە زۆرمان لەسەر بوو پێمان تەحەممول نەدەکرا؟ لەسیاسەتیشدا هەروایە جاری





وایە ناچاری لەگەڵ نەیارەکەت ڕێک بکەوی و بەڕواڵەت دەبێ تەنەزوولیشــی بۆ بکەی !.

٥٢. مقصد الاهتمام بالشئ على قدر إهتمام القرآن: ئەم ئامانجە زۆر گرنگە جاری وایە ئێمە لەسـەر شـتێک شـەڕ دەکەین کە بەلای قوڕئانەوە هەر گرنگ نییە، وەک ناوی سەلەفیەت، سۆفیەت، ئەشعەری، ماتوریدی، فلان مامۆستا، فلان مەنهەج کە دانراوی فلان کەســە لەکاتێک دا قوڕئان داکۆکی لەســەر یەکبوون و شــوێن قوڕئـان کەوتن و رازیبوون بەنـاوی مســولمان و مردن بەمســوڵمانیەتییە، بۆیە دەبێ ئێمە گرنگی بەوە بدەین کە ئیســلام گرنگی پێداوە، ئەم خاڵە بابەتی هاوسەنگی و ئەولەویەت دەیگرێتەوە.

٥٣. مقصــدالاهتمام بالمادية والروحية: مرۆڤی مســوڵمان دین و دونیا بەیەکەوە کۆدەکـاتەوە بەبێ ئەوەی نـاکۆکی بخـاتە نێوانیـان، دونیـاو دواڕۆژ بەیەکەوە کۆ دەکـاتەوە بێ ئەوەی پێی وابێ پێکەوە هەڵنـاکەن، پێکهـاتەی ئێمە لاشــەو ڕوحە، نـابێ بەشــی هیچیـان فەرامۆش کەین، مســوڵمان با دەوڵەمەند بێ بەلاّم بەحەرام و لەســەر حســابی خەڵک نا، وەنابێ لەڕێی خراپا ســەرفی کا، ناکرێ بەشــی هەژاران نەدا، هەربۆیە هەرکاتێک زەمی دونیا کرا ئەوکاتەیە کە دەبێتە تاکە هیواو ئامانج، وە قیامەت لە بیر دەکرێ، دەنا دونیا کێڵگەی دواڕۆژە، وە پردی پەڕینەوەمـانە بۆ دواڕۆژ، وە تـاکە دەرفەتە بۆ ڕەزامەندی خواو بردنەوەی گرەو لە شــەیتان و شــەیتان ســیفەتەکان، خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿قُلْ مَنْ حَرَّمَ زِينَةَ ٱللَّهِ ٱلَّتِيٓ أَخْرَجَ لِعِبَادِهِۦ وَٱلطَّيِّبَٰتِ مِنَ ٱلرِّزْقِ قُلْ هِيَ لِلَّذِينَ ءَامَنُواْ فِي ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا خَالِصَةً يَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ كَذَٰلِكَ نُفَصِّلُ ٱلْءَايَٰتِ لِقَوْمٍ يَعْلَمُونَ﴾ (الأعراف: ٣٢) واتە: ئەی موحەممەد(صـلی الله علیه وسـلم) بڵێ کێ ئارایش و جوانی یە خواییەکانی حەرام کردووە کە خوا بۆ بەندەکانی دروســتی کردووە هەروەها ڕۆزی و خۆراکە پاك و خۆشــەکان(کێ حەرامی کردوون)، (ئەی موحەممەد(صلی الله علیه وسلم)) بڵێ ئەوانە بۆ بڕوادارانە لە ژیانی دنیادا(بێ





بڕوایانیش لە پەنای ئەواندا بەشـــداری دەکەن)، (بەڵام) لە ڕۆژی دوایی دا تایبەتە بە بڕوادارانەوە بەم شـــێوەیە ئایەتەکانمان باس دەکەین و ڕوونی دەکەینەوە بۆ گەل و کۆمەڵێك کە دەزانن و تێ دەگەن.

٥٤. مقصـــد ضـــرورة تطبيق الشـــريعة: قورئان بۆیە هاتووەکاری پێ بکرێ نەوەک وەلا بنرێ، بۆ ئەوە هاتووە سـەرچاوەی دەسـتوری یاسـاکانی ژیان بێ نەوەک لەناو مزگەوتەکان و سـەر ڕەفتەکان، دەیان ئایەت باســی جێ بەجێ کردنی یاساکانی قورئان دەکەن، دوو جۆرە کەس دەیانەوێ لەم بوارەدا فێڵمان لێ بکەن:

یەك: ئەوانەی وادەزانن شەریعەت تەنیا پەیوندی مرۆڤە بەخواوە و هەندێک بواری مەدەنی و ئەحوال شەخسیە.

دوو: هەندێ دەزانن بەڵام خۆیان فرۆشتەوە.

بە دوو بەڵگە ئەوە دەسەلمێنین کە شەریعەت بۆ جێبەجێ کردنە:

یەکەم: دەقی زۆر لە قورئـان دا هەن کە بـاس لە حوکمڕانی دەکەن. دووەم: بەکردەیی زیاتر لە سێزدە سەدە جێ بەجێکراوە.

ئێمە ناڵێین کەم کورتی نەبووە بەڵام بە بەراورد بە بەرامبەرەکانی زۆر جوانتر و بەهێزتر و زانستی تر و واقع ی تر بووە، لەبەرامبەریشدا دەستمان بۆ شتێکی باشـتر نەبرد، علمانی لە وەڵاتانی خۆمان ئەوەی هەشـمان بوو نەیهێشـت، ئەو وەڵاتانەی عەلمانیان بەسـەردا سـەپاندین هەرئەوان سـەرچاوەی نەهامەتی و پارچە پارچە بوون و هەژاری و ناکۆکیمان بوون.

٥٥. مقصـــد التيقن من خصـــائص القرآن : دەبێ دڵنیا بین قورئان چەندین خاسـیەت و تایبەت مەندی هەیە کە لە هیچ کتاب و شـەریعەتێکی تردا نیە لەوانە:





- ✓ خاصـية مصـدره الالهی: تایبەت مەندی ئەوەی کە لە خواوە سـەرچاوەی گرتوە.
- ✓ خاصية الحفظ : تایبەتمەندی پاراستن.
- ✓ خاصية التيسير: تایبەتمەندی ئاسانی و ئاسان کردن.
- ✓ خاصية الاعجاز: تایبەتمەندی تەحەدا و ئیعجاز.
- ✓ خاصية البيان: تایبەتمەندی بەیان و ڕوونکردنەوە.
- ✓ خاصية الكمال: تایبەتمەندی تەواوی.
- ✓ خاصية العموم: تایبەتمەندی گشتگیری.
- ✓ خاصية الشمول: تایبەتمەندی هەمەلایەنی.
- ✓ خاصیه کونه خاتما للكتب السماوية: تاییتمەندی کۆتا پەیامبوون و کۆتا هێنەر بە پەیامە ئاسمانیەکان.
- ✓ خاصية كونه واقعيا: تایبەتمەندی واقعی بوون.
- ✓ خاصـية كونه مثاليا: تایبەت مەندی میسـالی ئەوەیە تا مرۆڤ بیەوێ بالاّ بڕوا، قورئان مجالی بۆ کردۆتەوە بەس نابێتە پێغەمبەر.
- ✓ خاصـــية حصـــول الاجر العظيم لقرائته: تاییتمەندی دەســـت کەوتنی پاداشتی زۆر بە خوێندنەوەی.
- ✓ خاصية التناسق والسلامة من التناقض: تایبەتمەندی بەیەکەوە گونجان و هەماهەنگی و نەبوونی ناکۆکی و دژ بەیەکی.

٥٦. مقصـد الاهتمام باليوم الآخر: بەڵگەکان لەسـەر ئیمان بە دوارۆژ یەکجار زۆرن، وە لە قورئانی پیرۆز زۆر باسی کراوە، وە زۆر ناوی لێنراوە، وە دیمەنەکانی بەوردی بۆ ئێمە باســـکراون، باســـی قۆناغەکانی کراوە لە دەســـت پێکەوە کە دەست پێدەکات، نیشـانەکانی دوارۆژ، باسـی تێک چوونی دونیا، باسـی زیندو بوونەوە، قونـاغەکـانی دوای زینـدو بوونەوە، تـا کۆتـا هەوار بـاســـی دۆزەخ و بەهەشت، من سـەر ژمێرم نەکردوە، بەڵام بەسـەدان ئایەت باسـی دوارۆژمان بۆ دەکـات، قیـامەت گرنگە چونکە شـــوێنی ڕەنـگ دانەوەی تەواوی فەزڵ و





دادگەری پەروەردگارە، لەوێدا ڕاستیەکان هەموو دەردەکەون و وەڵامی هەموو پرسیارەکان وەردەگرینەوە.

٥٧. مقصد الایمان بالرسل: پێغەمبەران سەلامی خوایان لێبێ راست ترین و زاناترین و دڵسۆزترین و پاکترین و لێهاتوترینی مرۆڤایەتین، ئەوان نوێنەری خوان بۆ مرۆڤایەتی، هەتا ئێستاشی لەگەڵدابێ ئەم مرۆڤە گەورانە بێ هاوتاو مونافیسن، ئەگەر لە هەموو ئەوروپا پرسیار کەی بڵێی کەسایەتی بێ ڕکابەر کێیە؟ بێگومان لە وەڵامدا دەڵێ عیسای کوری مەریەمە، ئەگەر لە هەموو جیهانی سێهەم و زۆربەی وەڵاتان پرسیار کەی کەسایەتی بێ ڕکابەر کێ یە دەڵێ رەسول الله یە، جا لای هیندۆسەکان و بوزایەکانیش ئەوانی تریش هەر وایە.

٥٨. مقصد الایمان بالکتب: خوای پەروەردگار پەیتا پەیتا شەریعەتی ڕەوانە کردووە بۆ مرۆڤەکان، یاسای بۆ داناون بۆ ئەوەی سەریان لێ نەشێوێ و دین و دونیایان بەڕێک و پێکی ڕایی بکەن، ئەم کتابانە بەپێی پێداویستی و ئاستی خەڵکەکە بووە تا گەیشتە دوا قۆناغ کە قورئانی پیرۆز دابەزی، قورئان لە توانایدا هەیە وە بەکردەوەش سەلمێنراوە وە بەدەقەکانیش ڕوونە کە دەکرێ دوا پەیام بێ و وەڵام گۆی هەموو پرسیارو پێداویستیەکان بێ.

٥٩. مقصد الایمان بالملائکة: ءَامَنَ ٱلرَّسُولُ بِمَآ أُنزِلَ إِلَيْهِ مِن رَّبِّهِۦ وَٱلْمُؤْمِنُونَ كُلٌّ ءَامَنَ بِٱللَّهِ وَمَلَٰٓئِكَتِهِۦ وَكُتُبِهِۦ وَرُسُلِهِۦ لَا نُفَرِّقُ بَيْنَ أَحَدٍ مِّن رُّسُلِهِۦ وَقَالُوا۟ سَمِعْنَا وَأَطَعْنَا غُفْرَانَكَ رَبَّنَا وَإِلَيْكَ ٱلْمَصِيرُ (البقرة: ٢٨٥) واتە: پێغەمبەر بڕوای هێنا بەو نامەیەی کە بۆی نێرراوە لە پەروەردگاری یەوە لەگەڵ بڕواداراندا هەموو بڕوایان هێناوە بەخوا و فریشتەکانی و نامەکانی و پەیامبەرانی جیاوازی ناکەین لە نێوان هیچ یەکێک لە پەیامبەرانی(بڕوادارەکان) وتیان: (پێغەمبەر ئایینی خوای پێ





گەیاندین ئێمەش) بیســـتمان فەرمانبەرییمان کرد داوای لێخۆشـــبوونت لێ دەکەین ئەی پەروەردگارمان وە هەر بۆ لای تۆیە گەڕانەوە .

گومـان لەوەدا نییە ئیمـان بەفریشـــتەکـان ئـامـانجێکی گەورەی قورئـانیە، فریشـــتەکـان دروســـت کراوێکی نـاوازە و بەندەیەکی ڕاســـتەقینەی خوای پەروەردگارن، پەیوەندیان بەمرۆڤەکانەوە تایبەتە، چونکە ئەوان نیگا دێنن بۆ مرۆڤەکان و لە پێنـاوی بەختەوەری مرۆڤەکـان، ئەوان بە فەرمـانی خوا مرۆڤ دەپارێزن، نزا بۆ ئیماندار دەکەن، کردەوەکانی بەرز دەکەنەوە و مژدەی خۆشـــی پێدەدەن، لە دونیـا و دواڕۆژدا هـاوڕێی بڕواداران، لەکـاتی تەنگـانە و جەنگدا وەک مەدەد و یـارمەتی بۆ مرۆڤ دادەبەزن، هەر لە ســـکی دایکەوە تـا مردن لەگەڵ مرۆڤن لە مردنەوە بۆ هەتا هەتایە.

٦٠. مقصد الایمان القدر: ئیمان بە قەدەر بریتی یە لە چوار شت:

یەکەم: بڕوابوون بەزانســـتی خوا، بڕوات بەوە هەبێ کە خوای گەورە هەموو شتێک دەزانی.

دوو: نووســـینی پەورەردگار بۆ هەموو شـــتەکان، ئەم نوســـینە هەندێکی فریشتەکانی لێ ئاگادار کردۆتەوە، بەڵام زانیاری تەواو بەس لای خۆیەتی.

سێیەم: ویستی خوا لەسەر بەدیهێنانی شتەکان.

چوارەم : وەدیهێنانی شـتەکان بەپێی زانسـت و نوسـین و ویسـتی خۆی، وە خوای گەورە ســـتەم لەکەس ناکا، خوای گەورە تاوان بەکەس ناکا بە ناچاری، خوای گەورە مرۆڤی ئـازاد کردووە لە هەڵبژاردنی ڕێگـای خۆی، وە لە کوێـدا توانـای مرۆڤ پەکی کەوت یـان زۆر لە ژێر فشـــاردا کارێکی تـاوانی ئەنجام دا مرۆڤ گوناهبار نابێ.

٦١. بۆیە باســـی ئیمان باالله ناکەم چونکە هەموو بابەتەکان باســـی ئیمان بە خوای پەروەردگارن.





٦٢. مقصــد النهی عن الغلو فی الدین والصــالحین: دین نەبووە کە پارێزراو بووبێ لەوەی کە شوێن کەوتوەکانی زیادە ڕەوی نەکەن، خوای پەروەردگاریش ئـاگـادارمـان دەکـاتەوە لە ڕێی ئەهلی کتـابەوە کە زیـادە ڕەویـان کردووە لە بەرزکردنەوەی مرۆڤەکـان بۆ ئـاســـتی بەخوا کردن، وەک مەســـیحیەکـان کە کردیـان، خوای گەورە دەفەرموێ: يَٰٓأَهۡلَ ٱلۡكِتَٰبِ لَا تَغۡلُواْ فِي دِينِكُمۡ وَلَا تَقُولُواْ عَلَى ٱللَّهِ إِلَّا ٱلۡحَقَّۚ إِنَّمَا ٱلۡمَسِيحُ عِيسَى ٱبۡنُ مَرۡيَمَ رَسُولُ ٱللَّهِ وَكَلِمَتُهُۥٓ أَلۡقَىٰهَآ إِلَىٰ مَرۡيَمَ وَرُوحٞ مِّنۡهُۖ فَـَٔامِنُواْ بِٱللَّهِ وَرُسُلِهِۦۖ وَلَا تَقُولُواْ ثَلَٰثَةٌۚ ٱنتَهُواْ خَيۡرٗا لَّكُمۡۚ إِنَّمَا ٱللَّهُ إِلَٰهٞ وَٰحِدٞۖ سُبۡحَٰنَهُۥٓ أَن يَكُونَ لَهُۥ وَلَدٞۘ لَّهُۥ مَا فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِي ٱلۡأَرۡضِۗ وَكَفَىٰ بِٱللَّهِ وَكِيلٗا (النســاء: ١٧١) واتە: ئەی خاوەن پەڕاوە ئاســـمانییەکان زیادە ڕەوی مەکەن لە ئایینەکەتاندا وە مەڵێن لە بارەی خواوە بێجگە لە ڕاســـتی بێگومان مەســـیح عیســـای کوڕی مـەریـەم تـەنها پێغـەمبـەری خوایـە(دروســـتی کردوە بـە) وتـەی خۆی(ببـە) بە(جیبرییل دا) ناردی بۆ مەریەم و(عیسا) گیانێکە لە لایەن خواوە بەخشراوە کەواتەبڕوا بهێنن بە خواو پێغەمبەرانی وە مەڵێن(خواکانمان) ســـیانن (الله ، عیســـی ، مریم)،(لـەو وتـەیـە) کۆتـایی بهێنن چـاکترە بۆتـان بێگومـان خوا پەرســـتراوێکی تەنهایە پاك و بێگەردی بۆ خوا لەوەی ڕۆڵەی هەبێت هەر هی خوایە هەرچی لە ئاسمانەکان و هەرچی لەزەوی دایە وە خوا بەسە چاودێربێ و هەموو شتێکی بدرێتە دەست.

قُلۡ يَٰٓأَهۡلَ ٱلۡكِتَٰبِ لَا تَغۡلُواْ فِي دِينِكُمۡ غَيۡرَ ٱلۡحَقِّ وَلَا تَتَّبِعُوٓاْ أَهۡوَآءَ قَوۡمٖ قَدۡ ضَلُّواْ مِن قَبۡلُ وَأَضَلُّواْ كَثِيرٗا وَضَلُّواْ عَن سَوَآءِ ٱلسَّبِيلِ (المائدة: ٧٧) واتە: ئەی موحەممەد(صلی الله علیه وســـلم) بڵێ ئەی نامەدارەکان زیادەڕەوی مەکەن لە ئاینەکەتاندا جگە لەوە نەبێت کە ڕاســـت و حەقە و شـــوێن ئارەزووی کەســـانێک مەکەون کەبەڕاستی پێشتر گومڕاو سەرلێ شێواو بوون، وەزۆر کەسیشیان گومڕاکرد وە خۆشیان گومڕابوون و لایاندا لە ڕێگای ڕاست.





٦٣. مقصد الزجر عن التفريط فی حق الله والصالحين: ئەوەیان پێچەوانەی پێش خۆیەتی، لە جاری یەکەم دا زیادەڕەوی دەکرا لە حەقی پێغەمبەران و پیاو چاکان، بەڵام لێرەدا باسی کەم تەرخەمیە لە حەقی خوای گەورە، وە لە حەقی پێغەمبەران پیاوچاکان، لەراستیدا جولەکەکان پێشەنگی ئەم بوارەن وەک خوای گەورە بۆمان باس دەکاو دەفەرموێ: وَقَالَتِ ٱلْيَهُودُ يَدُ ٱللَّهِ مَغْلُولَةٌ غُلَّتْ أَيْدِيهِمْ وَلُعِنُواْ بِمَا قَالُواْ بَلْ يَدَاهُ مَبْسُوطَتَانِ يُنفِقُ كَيْفَ يَشَآءُ وَلَيَزِيدَنَّ كَثِيرًا مِّنْهُم مَّآ أُنزِلَ إِلَيْكَ مِن رَّبِّكَ طُغْيَـٰنًا وَكُفْرًا وَأَلْقَيْنَا بَيْنَهُمُ ٱلْعَدَٰوَةَ وَٱلْبَغْضَآءَ إِلَىٰ يَوْمِ ٱلْقِيَـٰمَةِ كُلَّمَآ أَوْقَدُواْ نَارًا لِّلْحَرْبِ أَطْفَأَهَا ٱللَّهُ وَيَسْعَوْنَ فِى ٱلْأَرْضِ فَسَادًا وَٱللَّهُ لَا يُحِبُّ ٱلْمُفْسِدِينَ (المائدة: ٦٤) واتە: جوولەکەکان وتیان خوا دەستی بەستراوە(پاکی بۆ خوا) یاخوا ئەوان چنگ قوچراوو دەست بەستراو بن وە نەفرینیان لێکرا بەهۆی ئەوەی کە وتیان(نەخێر وانی یە) بەڵکو هەردوو دەستی هەمیشە کراوەیە چۆنی بیەوێت دەیبەخشێت وە سوێند بەخوا زیاد دەکات بۆ زۆر لەوان (زاناو سەرۆکەکانیان) ئەو قورئانەی هێنراوەتە خوارەوە بۆ تۆ لە لایەن پەروەردگارتەوە سەرکەشی و بێ بڕوای(زیاد ئەکات) وە خستوومانەتە نێوانیان دوژمنایەتی و کینەو ڕقەبەری تا ڕۆژی دوایی هەر جارێك ئاگرێکیان هەڵگیرساندبێ بۆ ئاژاوە نانەوە و جەنگ خوا ئەو ئاگرەی کوژاندۆتەوە وە تێکۆشان ئەکەن لە زەوی دا بۆ خراپە و تێکدان خواش خراپەکارانی خۆش ناوێ.

وە خوای گەورە دەفەرموێ: لَّقَدْ سَمِعَ ٱللَّهُ قَوْلَ ٱلَّذِينَ قَالُوٓاْ إِنَّ ٱللَّهَ فَقِيرٌ وَنَحْنُ أَغْنِيَآءُ سَنَكْتُبُ مَا قَالُواْ وَقَتْلَهُمُ ٱلْأَنۢبِيَآءَ بِغَيْرِ حَقٍّ وَنَقُولُ ذُوقُواْ عَذَابَ ٱلْحَرِيقِ (آل عمران: ١٨١) واتە: بەڕاستی خوا بیستی وتەی ئەو(جوولەکانەی) کە وتیان بێگومان خوا هەژارە و ئێمە دەوڵەمەندین(چونکە داوای قەرزمان لێدەکات) ئەوەی کە وتیان دەینوسین(وە دەینوسین) کوشتنی ئەوانە بۆ پێغەمبەرەکان بە ناڕەوا وە (پێیان) دەڵێن بچەژن سزای ئاگری سوتێنەر.





لەراستیدا قسەی عەلمانیەکانیش لەمڕۆدا هەرهەمان شتە کەدەڵێن:

- ✓ دین بۆ تاکە و تەنیا پەیوەندی نێوان مرۆڤ و خوایە!
- ✓ دین بەکەڵکی دەوڵەتداری و سیاسەت و ئابووری نایەت!
- ✓ دین مافەکانی تێدا دەستە بەر نەکراوە!
- ✓ دین لە گەڵ زانستدا دژ بەیەک و ناکۆکن!
- ✓ دین بۆ کاتی خۆی باش بوو!
- ✓ ناتوانێ بیروورا جیاواز و بیرووباوەڕە جیاوازەکان کۆ بکاتەوە!
- ✓ دین پاکە، تێکەڵی کایەیی سیاسی مەکەن، بەڵێ دین پاکە بەڵام دەیەوێ سیاسەت کە گرنگترین بواری ژیانە بە پاکی بکرێ!
- ✓ دین تەنیا بۆ عەرەب و سەردەمی نەزانی بووە!
- ✓ دین بەدیلی پەیدا بووە لە یاسا دەستکردەکان!
- ✓ دین بۆ ئێمە بۆتە هۆی دواکەوتنمان!
- ✓ دین توندەروی بەرهەم دێنێ!!...

٦٤. مقصد الاهتمام بالمقاصد والعلل والاسرار والحكم والغايات: لە راستیدا من زۆر شت هەیە باسم نەکردوە وە زۆریش گرنگە، لەبەر ئەوەی نەمەویست لەمە زیاتر درێژ بێتەوە، ویستم ئەوە سەرەتایەک بێ بۆ خوێنەری بەرێز بۆ ئەوەی بە ئامانجەوە قورئان بخوێنێ، وە من بەتەرتیب و ڕیزبەندی باسم نەکردون چونکە لەقورئانیشدا بەڕیز بەندی نەهاتووە، بەڵام ئەوە مانای ئەوە نییە کە ڕیزبەندی باش نییە بەڵکو زۆریش باش و پێویستە، بەپشتیوانی خوا ئەگەر خوای گەورە تەمەنی پێداین دەتوانین بەوردی و بەڕیزبەندی باسی مقاصد القرآن بکەین ان شاء الله.



## تەوەرەی چوارەم

### ڕەچاو کردنی بنچینە جوانەکان، بۆ تێگەیشتن لە قوڕئان

بنچینەی یەکەم: قوڕئـان بۆ ئەوە هـاتووە جوان بیخوێنین و جوان تێی بگەیـن و جوان کـاری پێ بکەیـن و جـوان بیـگەیەنیـن، دەربـارەی جوان خوێنـدنەوەی خوای گەورە دەفەرمێ: وَرَتِّلِ ٱلْقُرْءَانَ تَرْتِيلًا (المزمل: ٤) ترتیـل ئەوەیە جوان بیخوێنینەوە و جوان لێی وردبینەوە،

دەربارەی تێگەیشـتن و تێڕامان فەرمویەتی: أَفَلَا يَتَدَبَّرُونَ ٱلْقُرْءَانَ أَمْ عَلَىٰ قُلُوبٍ أَقْفَالُهَآ (محمد: ٢٤) ئاخۆ ئەوانە ورد نابنەوە لە قورئان (و تێی ناگەن) ؟ ! (وا نی یە) بەڵکو دڵیان قفڵی لێ دراوە.

دەربارەی کارپێکردن دەفەرموێ: أَتَأْمُرُونَ ٱلنَّاسَ بِٱلْبِرِّ وَتَنسَوْنَ أَنفُسَكُمْ وَأَنتُمْ تَتْلُونَ ٱلْكِتَـٰبَ أَفَلَا تَعْقِلُونَ (البقرة: ٤٤) واتە: ئـایا فەرمـان بە مرۆڤەکـان ئەکەن چاکە بکەن و خۆتـان فەرامۆش ئەکەن، لەکـاتێکـدا کتێبەکە ئەخوێننەوە؟ بۆ مێشکتان بەکار ناهێنن؟ .

دەربارەی گەیاندنی قورئان دەفەرموێ: ٱلَّذِينَ يُبَلِّغُونَ رِسَـٰلَـٰتِ ٱللَّهِ وَيَخْشَوْنَهُۥ وَلَا يَخْشَوْنَ أَحَدًا إِلَّا ٱللَّهَ وَكَفَىٰ بِٱللَّهِ حَسِيبًا (الأحزاب: ٣٩) واتە: کەسانێ کە پەیامەکانی خوا ڕادەگەیەنن وە لە (خوا) دەترسن و بێجگە لە خوا لە کەسی تر ناترسن خوا بەسە بە چاودێر.

وە هەتا بۆ گرنگی دان بە لەبەرکردنی قوڕئان دەفەرموێ: وَلَقَدْ يَسَّرْنَا ٱلْقُرْءَانَ لِلذِّكْرِ فَهَلْ مِن مُّدَّكِرٍ ١٧ القمر واتە: سوێند بەخوا بەڕاستی ئێمە قورئانمان ئاسان کردووە بۆ ئامۆژگاری لێ وەرگرتن جا ئایا پەند وەرگرێك هەیە؟.



ئەم ئایەتە لەبەرکردنیش دەگرێتەوە چونکە لەبەرکردن ڕێگایەکی باشـــە بۆ تێگەیشـتن و موراجەعەکردن، بۆیە بە درێژای مێژووی ئیسـلامی گەورە زانایان قورئانیان لەبەر دابووە، وە مامۆســـتای مرۆڤایەتی کە رەســـول الله یە قورئان هەموو لەبەر دابووە.

٢. چۆن قورئـانی پیرۆز تەفســـیر بکەین؟ خوای گەورە دەفەرموێ ..... وَأْتُوا۟ ٱلْبُيُوتَ مِنْ أَبْوَٰبِهَا......... (البقرة: ١٨٩)،

هەموو شـتێک دەرگای خۆی هەیە مرۆڤی ژیر بە دەرگای خۆیدا دەچێتە ناو بابەتەکان بۆیە باشترین شت ئەوەیە :

- ✓ قورئان بە قورئان تەفسیر بکەین کە ئەم جۆرە لە قورئاندا زۆر زۆرە.
- ✓ قورئان بە سونەت تەفسیر بکەین ئەگەر هەبوو.
- ✓ قورئان بەوتەی زانایانی شـــارەزا و ڕۆچوو لە قورئان تەفســـیر بکەین لەو بابەتانەی کە بۆچونی ئەوان تەواوی تەفســـیر و لێکدانەوەی قورئان بێ، دەنا شـتێک بابەتی ئەوان نەبێ بەتایبەت بابەت زانسـتیە ڕوتەکان(العلوم الطبیعیة البحتة) لەم بابەتانە دەگەڕێینەوە بۆ لای پسپۆرەکان، کەواتە ئەو وتەیەی دەڵێ تێگەیشـتن لە قورئان و سـونەت بەتێگەیشـتنی پێشـینە چاکەکان بەرەهایی ئەم وتەیە ڕاست نییە.
- ✓ لە پـاشـــان گەڕانەوە بۆ زمـانی عەربی چونکە قورئـان بەزمـانی عەرەبی دابەزیوە.
- ✓ گەڕانەوە بۆ تەفســـیرەکـان ئەم گرفتـانەمـان بۆ حەل دەکـا، چونکە تەفســـیرمان هەیە گرنگی بە جۆری یەکەم داوە واتە قورئان بەقورئان بۆ نمونە وەک(أضــواء البیان)، وە تەفســـیر هەیە گرنگی بە جۆری دووەم و ســێ یەم داوە واتە تەفســـیر بە حەدیث و وتەی هاوەڵان و تابعی، وەک تەفسیری الطبری، تفسیر القرآن العظیم و ئیستا چەندین تەفسیری تازە هەن کە گرنگیان بە تەفسیر بە ئەثەر داوە (التفسیر بالمأثور)، وە هەشمانە





گرنگی بەلایەنی زمانەوانی و ئەدەبی داوە، وە هەمانە گرنگی بەلایەنی زانستی داوە، وە هەیە گرنگی بەلایەنی فەلسەفی داوە، هەیە گرنگی بەلایەنی کلامی و عقدی داوە، هەیە گرنگی بە فقه داوە، هەیە گرنگی بەلایەنی ئیشاری داوە، وە هەروەها کتابەکانی غریب القرآن هەیە دەبێ لە پێش فەرهەنگ و موعجەمەکان سەیری ئەوان بکەین، وە تەفسیری(موضوعی) بابەتی هەیە کە گرنگیان بە بابەتێکی تایبەت داوە ئەوانەش زۆر گرنگن،

پێشم باشە گوێ لە نەیارەکانی قورئان بگرین بزانین لە کوێ گومانیان هەیە، یان دەیانەوێ گومان پەیدا کەن لە جولەکە و گاور و مولحیدا وە بەناو قورئانیەکان، بۆ ئەوەی وەڵامی ئەوان بدەینەوە، وە بۆ ئەوەی خەڵک پێیان نەخەڵەتێ، وە زۆر باشە تەفسیرە کوردیەکان تەماشا بکەین بۆ ئەوەی تەرجومەکەمان راست و ورد بێ.

٣. ئێمە حەقیقەت ی شەرعی و عورفی و زمانەوانیمان هەیە، دەبێ وشەکانی قورئانی پیرۆز لە حەقیقەتە شەرعیەکان بەکار بێنین وەک صلاة، زکاة، صوم، حج، تیمم ... نەوەک لە مانا زمانیەوانیەکە، کە صلاة بە مانای دوعا بەکاردێ، وەصوم بەواتای خۆگرتنەوە بەکاردێ بەرەهای، وە هەروەها دواتر دەبێ بچین بۆ بەکار هێنانی حەقیقەتی عورف و نەریتی خەڵك، بۆ نمونە وەک دینار، درهم، ورق، کە ئەوانە لە قورئاندا بەکار دێن بۆ زێر وەک دینار، وە بۆ زیو وەک درهم و ورق، بەڵام لەمڕۆدا لە عورفی کۆمەڵگا مانای ئەوانە جیاوازە، ئەوجار بۆ واتای وشەکان دەگەڕێینەوە سەر واتای زمانەوانی، ئەگەر وانەکەین لەڕاقەی قورئان دا بەهەڵە دەچین.

٤. العبرة بعموم الالفاظ لا بخصوص الاسباب: ئیعتبارو حساب کردن بۆ مانای گشتی وشەکانە نەوەک بۆ هۆکارو ڕووداوە تایبەتیەکە کە ئەو ئایەت و فەرمودانەی بۆ وتراوە، چونکە ئەگەر وابێ ئێمە ناتوانین کار بەقورئان بکەین،





چونکه زۆربەی ئایاتی ئەحکام ســـەبەب نزولی هەیە، وە فەرمودەکان ســـبب ورودیان هەیە، لە کاتێکدا قورئان دەفەرموێ:

قُلْ أَيُّ شَيْءٍ أَكْبَرُ شَهَٰدَةً قُلِ ٱللَّهُ شَهِيدٌۢ بَيْنِي وَبَيْنَكُمْ وَأُوحِيَ إِلَيَّ هَٰذَا ٱلْقُرْءَانُ لِأُنذِرَكُم بِهِۦ وَمَنۢ بَلَغَ أَئِنَّكُمْ لَتَشْهَدُونَ أَنَّ مَعَ ٱللَّهِ ءَالِهَةً أُخْرَىٰ قُل لَّآ أَشْهَدُ قُلْ إِنَّمَا هُوَ إِلَٰهٌ وَٰحِدٌ وَإِنَّنِي بَرِيٓءٌ مِّمَّا تُشْرِكُونَ (الأنعام: ١٩) واتە: ئەی موحەممەد(صلى الله عليه وسلم) بڵێ: شایەتی دانی کێ لە هەموو شایەتی دانێك گەورەترە (لەسەر پێغەمبەرێتی من) بڵێ : خوا گەورەترین شایەتە لە نێوان من و ئێوەدا وە ئەم قورئانە سرووش کراوە بۆ من بۆ ئەوەی ئێوەی پێ بترسێنم و هەر کەسێکی کەش کە پێ ی دەگات ئایا بەڕاستی ئێوە شایەتی ئەدەن بە دڵنیاییەوە کە لەگەڵ خوادا چەند پەرستراوێکی تر هەبێ ؟ ! بڵێ : من شایەتی (وا ناڕەوا) نادەم بڵێ : بێگومان هەر ئەو پەرستراوی تاك و تەنهایە وە بەڕاستی من بەریم لەوەی کە ئێوە دەیکەنە هاوبەش بۆ خوا.

وە دەفەرموێ: تَبَارَكَ ٱلَّذِي نَزَّلَ ٱلْفُرْقَانَ عَلَىٰ عَبْدِهِۦ لِيَكُونَ لِلْعَٰلَمِينَ نَذِيرًا (الفرقان: ١) واتە: گەورە و پیرۆزە ئەو زاتەی کە فورقان(قورئان)ی بۆ سەربەندەی خۆی ناردۆتە خوارەوە تا ترسێنەر بێ بۆ هەموو جیهانیان.

٥. هەر وەسفێک یان ناوی هەر جنسێک کە ئەلف ولام ی چۆیە سەر ئەوە هەموو ماناو وەسفە کە دادگەرێ بە پێی ئەوەی کە چۆتە سەری، بۆ نمونە خوای گەورە دەفەرموێ: إِنَّ ٱلْمُسْلِمِينَ وَٱلْمُسْلِمَٰتِ وَٱلْمُؤْمِنِينَ وَٱلْمُؤْمِنَٰتِ وَٱلْقَٰنِتِينَ وَٱلْقَٰنِتَٰتِ وَٱلصَّٰدِقِينَ وَٱلصَّٰدِقَٰتِ وَٱلصَّٰبِرِينَ وَٱلصَّٰبِرَٰتِ وَٱلْخَٰشِعِينَ وَٱلْخَٰشِعَٰتِ وَٱلْمُتَصَدِّقِينَ وَٱلْمُتَصَدِّقَٰتِ وَٱلصَّٰٓئِمِينَ وَٱلصَّٰٓئِمَٰتِ وَٱلْحَٰفِظِينَ فُرُوجَهُمْ وَٱلْحَٰفِظَٰتِ وَٱلذَّٰكِرِينَ ٱللَّهَ كَثِيرًا وَٱلذَّٰكِرَٰتِ أَعَدَّ ٱللَّهُ لَهُم مَّغْفِرَةً وَأَجْرًا عَظِيمًا (الأحزاب: ٣٥)





واتە: بەڕاســـتی پیاوە موســـوڵمانەکان و ئافرەتە موســـوڵمانەکان وە پیاوە باوەڕدارەکان و ئافرەتە باوەڕدارەکان و پیاوانی هەمیشـــە گوێڕایەڵ و ئافرەتانی هەمیشــە گوێڕایەڵ و پیاوە ڕاســت گۆکان و ئافرەتە ڕاســت گۆکان و پیاوان و ئافرەتانی خۆگرو بەئارام وە پیاوانی لەخوا ترس و ژنانی لەخوا ترس و پیاوان و ئافرەتانی بەخشندە و پیاوان و ئافرەتانی ڕۆژوەوان پیاوان و ئافرەتانی داوێن پاك پیاوانێ کە زۆر یادی خوا دەکەن و ئافرەتانێ کە زۆر یادی خوا دەکەن خوا ئامادەی کردووە بۆ هەموویان لێخۆش بوون و پاداشتی گەورە.

ئەو دە وەسفانە کە بە ئەلف و لام هاتون مانای تەواوی وشەکان دەگرێتەوە لە ئیسلام و ئیمان و مل کەچی و ...

وە بەئەندازەی بەدی هاتنی ئەو سیفەتانە لە مرۆڤەکاندا شایەنی ئەو ئەجرو لێخۆش بوونە دەبن کە خوای گەورە بۆی دانـاون، خوای گەورە دەفەرموێ: إِنَّ ٱلْإِنسَـٰنَ لَفِى خُسْرٍ (العصر: ٢) بێگومان هەموو خەڵکی لە زیاندایە.

لێرەدا وشـەی إنسـان کە ئەلف و لامی لەسـەرە هەموو مرۆڤێک دەگرێتەوە بە بەڵگەی استثناء کەی دوای خۆی.

٦. ئەگەروشەیەکی (نکرة) هات واتە ئەلف و لامی پێوە نەبوو وە لەپێشیەوە نەفی هات، یان نەهی، یان مەرج، ئەوە مانا کەی گشـتگیر دەبێ دەبێتە عام و هەموو تا کەکانی دەگرێتەوە.

نمونەی نەفی: يَوْمَ لَا تَمْلِكُ نَفْسٌ لِّنَفْسٍ شَيْـًٔا وَٱلْأَمْرُ يَوْمَئِذٍ لِّلَّهِ (الانفطار: ١٩)

لێرەدا کە وشــەی (شــیئا) هاتووە وە لە ئایەتەکەدا (لا) هاتووە کە (نەفیە) کەواتە لەقیامەت دا هیچ کەس هیچی بەدەســـت نییە هەرچەند کەســـەکە گەورە و بەڕێز بن، وەک فریشتەو پێغەمبەران مەگەر خوای گەورە ئیزنیان بدا.





ڕۆژێکە کە هیچ کەس هیچی بەدەســـت نییە بۆ هیچ کەس وە فەرمان لەو ڕۆژەدا هەر بۆ خوایە.

نمونەی نەهی: وَٱعْبُدُواْ ٱللَّهَ وَلَا تُشْرِكُواْ بِهِۦ شَيْـًٔـــا وَبِٱلْوَٰلِدَيْنِ إِحْسَـٰنًا وَبِذِى ٱلْقُرْبَىٰ وَٱلْيَتَـٰمَىٰ وَٱلْمَسَـٰكِينِ وَٱلْجَارِ ذِى ٱلْقُرْبَىٰ وَٱلْجَارِ ٱلْجُنُبِ وَٱلصَّـاحِبِ بِٱلْجَنۢبِ وَٱبْنِ ٱلسَّـبِيلِ وَمَا مَلَكَتْ أَيْمَـٰنُكُمْ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يُحِبُّ مَن كَانَ مُخْتَالًا فَخُورًا (النســـاء: ٣٦) واتە: بەس خوا بپەرســـتن، و هیچ شـــتێك مەكەن بەهاوبەشـــی هەروەها لەگەڵ دایك و باوكتاندا چاك بن وە لەگەڵ خزم و نزیكان و هەتیوان و هەژاران و هاوســـێی خزم و هاوســـێی بێگانە یا دوور و هاوڕێی هەمیشـــەیی یا هاوڕێی ســـەفەر و ڕێبوار و ئەوانەی بوون بە موڵكتان(چاك بن لەگەڵیاندا) بەڕاستی خوا خۆشی ناوێت ئەو كەسەی كە خۆ بەزل زان و شانازی كەر بێ.

لێرەدا (شیئا) نکرەیە لە پێشیەوە نەهی هاتوە کە( لا )یە بۆیە دروست نییە هیچ شـــتێک بکرێتە شـــەریک و هاوتای خوا هەرچەند بەڕێزو گەورەو خاوەن پایە بێ

نمونەی (شـرط) مەرج: وَإِن يَمْسَسْـكَ ٱللَّهُ بِضُرٍّ فَلَا كَاشِـفَ لَهُۥٓ إِلَّا هُوَ وَإِن يُرِدْكَ بِخَيْرٍ فَلَا رَآدَّ لِفَضْـلِهِۦ يُصِـيبُ بِهِۦ مَن يَشَـآءُ مِنْ عِبَادِهِۦ وَهُوَ ٱلْغَفُورُ ٱلرَّحِيمُ (یونس: ١٠٧) واتە: وە ئەگەر خوا بە تۆ بگەیەنێت زیانێك هیچ لادەرێك نی یە بۆ ئەو (زیانە) بێجگە لە خوا وە ئەگەر خێر و خۆشـــیەكی بوێ بۆت ئەوە هیچ بەرگری كەرێك نی یە بۆ چاكەی خوا بەهرەمەندی دەكات ئەو كەســـەی خۆی بیەوێ لە بەندەكانی وە هەر ئەو لێبوردەی بە بەزەیی یە.

لێرەدا وشە(ضر) مان هەیە کە لەپێشتر( إن ) شرطیە هاتووە کەواتە لابەرو لادەری زیـان و زەرەد تەنیـا خوایە هیچ کەس نـاتوانێ مەگەر بە ئیزنی خوا نەبێ.





وەخوای گەورە دەفەرموێ: وَمَا بِكُم مِّن نِّعْمَةٍ فَمِنَ ٱللَّهِ ثُمَّ إِذَا مَسَّكُمُ ٱلضُّرُّ فَإِلَيْهِ تَجْـَٔرُونَ (النحل: ٥٣)

واتە: وە هەر چاکە و بەهرەیەکتان هەبێ ئەوە هەمووی لە خواوەیە پاشان کاتێ دووچاری زیان و ناڕەحەتیەك ببن ئەوە پەناو هاوار هەر بۆ لای ئەو دەبەن.

نمونەی (إستفهام) واتە پرسیار: هَلْ مِنْ خَٰلِقٍ غَيْرُ ٱللَّهِ يَرْزُقُكُم مِّنَ ٱلسَّمَآءِ وَٱلْأَرْضِ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ فَأَنَّىٰ تُؤْفَكُونَ (فاطر: ٣) لێرەدا وشەی (خالق) نکرەیە، لەپێشیەوە (استفهام) پرسیار هاتوە، کەواتە پرسارەکە بۆ هەر خالقێکە کەرۆزی دەر بێ، دیارە کە خالقیک نییە بە غەیری خوا کەڕۆزی دەر بێ.

٧. گرنگی دان بەیەکتا پەرستی بەشێوەیەکی چڕ دەتوانین بڵێین بە ڕاستەوخۆ و بە ناڕاستەوخۆ هەموو قوڕئان باسی یەکتا پەرستیە: وَلَقَدْ بَعَثْنَا فِى كُلِّ أُمَّةٍ رَّسُولًا أَنِ ٱعْبُدُوا۟ ٱللَّهَ وَٱجْتَنِبُوا۟ ٱلطَّٰغُوتَ فَمِنْهُم مَّنْ هَدَى ٱللَّهُ وَمِنْهُم مَّنْ حَقَّتْ عَلَيْهِ ٱلضَّلَٰلَةُ فَسِيرُوا۟ فِى ٱلْأَرْضِ فَٱنظُرُوا۟ كَيْفَ كَانَ عَٰقِبَةُ ٱلْمُكَذِّبِينَ (النحل: ٣٦) واتە: سوێند بە خوا لەناو هەموو گەل و ئوممەتێکدا پێغەمبەرێکمان ناردووە بەمەی تەنها خوا بپەرستن و دوورکەونەوە لە (پەرستنی) هەر پەرستراوێکی تر جا خوا هەندێکی لەو (ئوممەت) انە ڕێنموونی کرد و هەندێکیشیان (لەبەر خراپیان) گومڕایی یەخەی گرتن دەی بەزەوی دا بگەڕێن و تەماشا کەن سەر ئەنجامی بێ باوەڕان چۆن بوو.

وە دەفەرموێ: وَمَآ أَرْسَلْنَا مِن قَبْلِكَ مِن رَّسُولٍ إِلَّا نُوحِىٓ إِلَيْهِ أَنَّهُۥ لَآ إِلَٰهَ إِلَّآ أَنَا۠ فَٱعْبُدُونِ (الأنبياء: ٢٥) واتە: وە ئێمە نەمان ناردووە پێش تۆ هیچ پێغەمبەرێك مەگەر نیگامان بۆ ناردووە (بەوەی کە) بێگومان جگە لە من هیچ پەرستراوێك نی یە کەواتە تەنها من بپەرستن.





دەبینین لەم دوو ئـایەتە پیرۆزە ئەرکی پێغەمبەرانی کورت هەڵێنـاوە لە تەوحید، ئەمە حەقیقەتە چونکە دین ئەگەر باسـی خواو بەشـەکانی ئیمان بێ هەموو پەیوەسـتە بە تەوحیدەوە، ئەگەر باسـی شـیرک و کوفر بێ و باسـی سـزادانیـان بێ لە دونیـاو دواڕۆژدا هەموو لەبەر ئەوەیە پێچەوانەی تەوحید جولاوونەوە، ئەگەر باسـی پاداشـتی ئیمانداران بێ و باسـی نازو نیعمەتی بەهەشـت بێ هەموو ئەوانە پاداشـتی تەوحیدن، ئەگەر باسـی بەندایەتی بێ بەهەموو جۆرەکانیەوە ئەوە ئەرکی تەوحیدە کە لەسـەرمانە جێ بەجێی کەین، ئەگەر باسـی ئەخلاق و ڕەوشـت بێ ئەوە وەسـفی موحیدینە، ئەگەر باسـی تەشریع بێ ئەوە تەنیا مافی پەروەردگارە، بۆیە دەبینین هەموو دین لەدەورەی تەوحید دا دەخولێتەوە.

٨. چۆن دەبێ گرنگی بە وشـە و دەقەکانی قوڕئان بدەین، دەبێ گرنگی بە لازم و ئـامـاژەکـانی قوڕئـانیش بـدەین، بۆیە دەبینین ئەو وردەکـاریەی کە ڕاڤەکارانی قوڕئان باسـیان کردوە بەزۆری لەو جۆرەیە، ئەگەر ئێمە موراجەعەی بابەتی (الالفاظ) بکەینەوە ئەم بابەتە زۆر ڕونەو جوان باسی کراوە بەناوی :

- ✓ عبارة النص
- ✓ إشارة النص
- ✓ إيماء النص
- ✓ إقتضاء النص

ئەو جار جیاوازی هەیە لە نێوان، المفسـر، المحكم، النص، الظاهر، المؤول، ئەمانە بابەتی فراوانن وەک، عام، خاص، مطلق، مقيد، مجمل، مبين، مشـكل ...

ئەو کەسـەی دەیەوێ لە قوڕئـانی پیرۆز تێبگـا دەبێ لە أصـول ی فقه و زانستەکانی قوڕئان شارەزا بێ.





٩. ئەو ئایەتانەی کەوا دەردەکەون لەگەڵیەکدا ناکۆکن دەبێ وریا بین چونکە لە قورئـانی پیرۆزدا نـاکۆکی دژ بەیەک بوون نییە، وەک خوای گەورە دەفەرموێ: أَفَلَا يَتَدَبَّرُونَ ٱلْقُرْءَانَ وَلَوْ كَانَ مِنْ عِندِ غَيْرِ ٱللَّهِ لَوَجَدُواْ فِيهِ ٱخْتِلَٰفًا كَثِيرًا (النساء: ﴿٨٢﴾) واتە: ئەوە بۆ بیر ناکەنەوە لە قورئان؟ خۆ ئەگەر لە لایەن کەسێکی ترەوە بوایە جگە لە خوا بێگومان دەیان بینی تیایدا جیاوازی زۆر.

موعجیزەی قورئانی پیرۆز ئەوەیە کە ناکۆکی دژ بەیەکیی تێدا نییە لەوانەیە عام و خاص هەبێ، لەوانەیە مطلق و مقید بێ، لەوانەیە مجمل و مبین بێ، لەوانەیە حاڵەتەکە جیاواز بێ، لەوانەیە بەمەبەستی جیاواز بەکار هاتبێ نمونە زۆرن، من خوێنەر حەواڵەی کتابە ئوصولیەکان و ئەو کتابانە دەکەم کەتایبەت بەو بوارە نوسراون.

١٠. بنچینە ئەوەیە هەرکـاتێـک متعلق فعلێـک نەوترا ئەوە مـانـای وایە گشتگیرە و هەموو شتێک دەگرێتەوە کە شیاوی ئەوە بێ ئەوشتە بیگریتەوە، بۆنمونە وتراوە لعلكم تتقون، لعلكم تـذكرون، لعلكم تفكرون وەهەروەهـا، بۆ مفعول (بەرکـار) نەوتراوە؟ بۆ ئەوەی هەموو شـــتێـک بگرێتەوە، بۆ نمونە بیرکردنەوە لە هەموو شـــتێک، بۆ ئەوەی هەموو شـــتێکتان بیر کەوێتەوە، بۆ ئەوەی لە هەموو شتێک تەقوا بکەن کە بشێ بۆ تەقوا لێکردن.

١١. خوای گەورە هۆکارەکانی کردۆتە مایەی ئارامی و ئاسودەیی، خوای گەورە دەفەرموێ: وَمَا جَعَلَهُ ٱللَّهُ إِلَّا بُشْرَىٰ لَكُمْ وَلِتَطْمَئِنَّ قُلُوبُكُم بِهِۦ وَمَا ٱلنَّصْرُ إِلَّا مِنْ عِندِ ٱللَّهِ ٱلْعَزِيزِ ٱلْحَكِيمِ (آل عمران: ﴿١٢٦﴾) واتە: وە خوا تـەنها ئـەو(کۆمەکی) ی کرد بە مژدە بۆتـان وە بۆ ئـەوەی دڵەکانتانی پێ ئارام ببێ ســـەرکەوتنیش تـەنها لەلایەن خوای باڵا دەستی داناوەیە.

دابەزینی فریشـــتەکـان و یـارمەتی خوا هۆی ئـارامی و دڵنەوای و مزگێنی دانە، وە دەفەرموێ: وَمِنْ ءَايَٰتِهِۦٓ أَن يُرْسِلَ ٱلرِّيَاحَ مُبَشِّرَٰتٍ وَلِيُذِيقَكُم مِّن رَّحْمَتِهِۦ





وَلِتَجْرِيَ ٱلْفُلْكُ بِأَمْرِهِۦ وَلِتَبْتَغُواْ مِن فَضْلِهِۦ وَلَعَلَّكُمْ تَشْكُرُونَ (الروم: ٤٦) واتە: وە لە نیشـانەکانی ئەو (خوایە) کە چەند بایەکی مژدەدەر (بەبارینی باران) دەنێرێ بۆ ئەوە هەندێ لە (بارانی) بەزەیی خۆیتان پێ بچەژێ و بۆ ئەوەی کەشـتییەکان بەفەرمانی خوا (بەو بایە) بڕۆن و بگەڕێن و بۆ ئەوەی بەدوای ڕۆزی ئەو (خوا) دا بگەڕێن (لە دەریادا) تا شـــوکرانە بژێری خوا بن، دەبینی هاتنی با مزگێنی بارانە و دڵ پێی خۆش دەبێ ئیمان پێی زیاد دەکا.

١٢. لابردنی وەڵامی شــرط بەڵگەیە لەســەر گرنگی و گەورەیی و تونـدی لابردراوەکە، خوای گەورە دەفەرموێ: وَلَوْ تَرَىٰٓ إِذِ ٱلْمُجْرِمُونَ نَاكِسُواْ رُءُوسِهِمْ عِندَ رَبِّهِمْ رَبَّنَآ أَبْصَرْنَا وَسَمِعْنَا فَٱرْجِعْنَا نَعْمَلْ صَٰلِحًا إِنَّا مُوقِنُونَ (السجدة: ١٢) واتە: ئەگەر دەبینی کاتێ (لە قیامەت دا) تاوانباران لە حوزوری پەروەردگاریاندا (لە خەجاڵەتی دا) سـەریان داخسـتووە (دەڵێن) ئەی پەروەردگاری ئێمە (ئەوەی بەڵێنت پێ دابووین) دیمان و بیســتمان دەی بمانگێڕەرەوە (بۆ دنیا) تا کردەوەی چاك بکەین بەڕاستی ئێمە دڵنیاین لە قیامەت.

کەواتە ئەگەر دەکرا ئەو حاڵەتە ببینی کەکافرەکان تێی دەکەون شتێکی زۆر گەورە و ترسناکت دەبینی: وَلَوْ تَرَىٰٓ إِذْ يَتَوَفَّى ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ ٱلْمَلَٰٓئِكَةُ يَضْرِبُونَ وُجُوهَهُمْ وَأَدْبَٰرَهُمْ وَذُوقُواْ عَذَابَ ٱلْحَرِيقِ (الأنفال: ٥٠) واتە ئەگەر ئەوحـاڵەت دەبینی کەفریشـتەکان روحی کافرەکان دەکێشـن بە لێدان لە ڕوو دواوە یان شـتێکی گەورەو ترسناک و عەجیبت دەبینی.

١٣. هەندێک وشـە هەیە لە قورئاندا ئەگەر بەتەنیا بەکار بێ واتاکەی گشـتیە بەڵام ئەگەر لەگەڵ شـــتی تردا بەکار هات ماناکەی تایبەت دەکرێ، بۆ نمونە وشـەی ئیمان، یان ئیسـلام، یان ئیحسـان، یان بر، ئەوانە ئەگەر شـتی تریان لەگەڵ بەکارنەیە هەموو شـتێک دەگرێتەوە کە گونجاو بێ لەگەڵ واتاکەی، بۆ نمونە وشـــەی ئیمان ئەگەر بەتەنیا بەکار هات کرداریش دەگرێتەوە، بەڵام





ئەگەر لەگەڵ کردەوەی باش بەکار هات ئەوە ئیمان بەشــتە غەیبی نادیارەکان دەگوترێ کە لەدڵدایە، ئەوەکانی تریش هەروان.

کە لە هەندێک شوێندا کەدەفەرموێ : یهدی من یشاء، یان یضل من یشاء، ئەوە دەلالەت دەکات لەسەر دوو شت، یەکەم: مانای وایە خوای گەورە مالک و دەســـەڵات دارو خاوەن بریار هەر خۆیەتی. دوو: مانای ئەوە نیە کە خوای گەورە بێ هۆکارو سەبەب خەڵک گومرا و هیدایەت دەدا. چونکە لە شوێنی تر ڕوون کراوەتەوە کێ هیدایەت دەداو کێ گومڕا دەکا، بۆیە دەبێ بەو شـــێوەیە قورئانی پیرۆز بخوێنینەوە. إِنَّ ٱللَّهَ لَا يَسْتَحْيِۦٓ أَن يَضْرِبَ مَثَلًا مَّا بَعُوضَةً فَمَا فَوْقَهَا فَأَمَّا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ فَيَعْلَمُونَ أَنَّهُ ٱلْحَقُّ مِن رَّبِّهِمْ وَأَمَّا ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ فَيَقُولُونَ مَاذَآ أَرَادَ ٱللَّهُ بِهَٰذَا مَثَلًا يُضِلُّ بِهِۦ كَثِيرًا وَيَهْدِى بِهِۦ كَثِيرًا وَمَا يُضِلُّ بِهِۦٓ إِلَّا ٱلْفَٰسِقِينَ (البقرة: ٢٦) کەواتە ئەوەی گومڕا دەبێ فاسق و لەڕێگا دەرچویە. يُثَبِّتُ ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ بِٱلْقَوْلِ ٱلثَّابِتِ فِى ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا وَفِى ٱلْءَاخِرَةِ وَيُضِلُّ ٱللَّهُ ٱلظَّٰلِمِينَ وَيَفْعَلُ ٱللَّهُ مَا يَشَآءُ (إبراهيم: ٢٧) کەواتە ئەوەی ئیمانداره شایەنی هیدایەتە، وە ئەوەی ستەم کارە شایەنی گومڕا کردنە.

١٤. کۆتا هاتنی ئایەتەکان بەناوەکانی پەروەردگار مانای ئەوەیە پەیوەندی حوکمەکە بەو ناوانەوە گونجاوو موناسەبەی هەیە کەنمونەکانی یەکجار زۆرن.

١٥. قورئان هەمووی محکم ە بە رەچاو کردنی بوارێک وەك ئەوەی هەمووی راستەو لەجێی خۆیدایە و ئیختلاف و دژ یەک و ناکۆکی تێدا نیە، وە هەمووی متشـابە بە رەچاوکردنی بوارێکی تر چونکە هەمووی وەك یەك دەچێ و تەواو کاری یەکترەو یەکتر پشـــت راســـت دە کاتەوە لەو روەوە بەیەک دەچێ، وەهەندێکی محکم ە و هەندێکی متشابە بەئیعتباری سێیەم هەموو ئەوانەش بەڵگەی قورئـانیـان هەیە دەربارەی محکم دەفەرموێ: الٓر كِتَٰبٌ أُحْكِمَتْ ءَايَٰتُهُۥ





ثُمَّ فُصِّلَتۡ مِن لَّدُنۡ حَكِيمٍ خَبِيرٍ (هود: ①) واتە: بە (ئەلیف، لام، ڕا) دەخوێنرێتەوە ئەمە کتێبێکە پتەو داڕێژراوە ئایەتەکانی پاشـــان ڕوون کراونەتەوە لەلایەن (خوای) کاردروستی زاناوە.

دەربارەی متشابە دەفەرموێ: ٱللَّهُ نَزَّلَ أَحۡسَنَ ٱلۡحَدِيثِ كِتَٰبًا مُّتَشَٰبِهًا مَّثَانِيَ تَقۡشَعِرُّ مِنۡهُ جُلُودُ ٱلَّذِينَ يَخۡشَوۡنَ رَبَّهُمۡ ثُمَّ تَلِينُ جُلُودُهُمۡ وَقُلُوبُهُمۡ إِلَىٰ ذِكۡرِ ٱللَّهِۚ ذَٰلِكَ هُدَى ٱللَّهِ يَهۡدِي بِهِۦ مَن يَشَآءُۚ وَمَن يُضۡلِلِ ٱللَّهُ فَمَا لَهُۥ مِنۡ هَادٍ (الزمر: ㉓) واتە: خوا جوانترین فەرمایشــتی ناردۆتە خوارەوە قورئانێکە (کە ئایەتەکانی) لە یەکچووی دووپات کراوەن ئەو کەسانەی لە پەروەردگاریان دەترسن پێستیان تەزووی پیادێ (بە بیستنی قورئان) پاشان پێستیان و دڵیان نەرم دەبێ بە یادی (قورئانی) خودا ئەو (قورئانە) ڕێنموونی خوایە بەو (قورئانە) ڕێنموونی هەر کەسێ دەکات کە بیەوێ هەر کەسیش خوا گومڕای بکات ئەوە ڕێنموونی کەرێك بۆ ئەو نی یە.

دەربـارەی هەردوکیـان دەفەرموێ: هُوَ ٱلَّذِيٓ أَنزَلَ عَلَيۡكَ ٱلۡكِتَٰبَ مِنۡهُ ءَايَٰتٌ مُّحۡكَمَٰتٌ هُنَّ أُمُّ ٱلۡكِتَٰبِ وَأُخَرُ مُتَشَٰبِهَٰتٌۖ فَأَمَّا ٱلَّذِينَ فِي قُلُوبِهِمۡ زَيۡغٌ فَيَتَّبِعُونَ مَا تَشَٰبَهَ مِنۡهُ ٱبۡتِغَآءَ ٱلۡفِتۡنَةِ وَٱبۡتِغَآءَ تَأۡوِيلِهِۦۖ وَمَا يَعۡلَمُ تَأۡوِيلَهُۥٓ إِلَّا ٱللَّهُۗ وَٱلرَّٰسِخُونَ فِي ٱلۡعِلۡمِ يَقُولُونَ ءَامَنَّا بِهِۦ كُلٌّ مِّنۡ عِندِ رَبِّنَاۗ وَمَا يَذَّكَّرُ إِلَّآ أُوْلُواْ ٱلۡأَلۡبَٰبِ (آل عمران: ⑦) واتە: ئەو خوایە ناردویەتی یە خوارەوە بۆت قورئان هێندێکی ئایاتی ڕۆشـــنن ئەو ئایەتانە بنەڕەتی قورئانن وە ئەوانی تر(ئایەتانێکن کە مەبەســتەکانیان) ڕۆشـــن نین ئینجا ئەوانەی کە لە دڵیاندا لادان و چەوتی هەیە دوای ئەو ئایەتانە دەکەون کە لە قورئاندا موتەشـابهن(هاوشـێوەن) بۆ تێکدانی بیروباوەڕی موسـوڵمانان وە بۆ ڕاڤەکردنی بە ئارەزووی ناپاکی خۆیان لە حاڵەتێکدا کەس ڕاڤە کردنی نازانێ تەنیا خوا نەبێ وە دامەزراوان لە زانییندا ئەڵێن ئێمە بڕوامان هێناوە





بە(متشـــابە) هەمووی لە پەروەردگارمانەوەن بیر لە قورئان ناکەنەوە تەنها خاوەنانی ژیریی و بیر نەبێ.

کەواتە بەشـــێک لە ئایەتەکان موحکەمن و ماناکەیان ڕوونە ئەو جۆرە زۆربەی قورئان پێک دەهێنێ، وە بەشێکیان متشابە ن کە ماناکەیان زۆر ڕوون نین ئەوانە ژمارەیان زۆر نین.

١٦. خوای گەورە ڕێنماییمان دەکات بۆ ئەوەی ڕەچاوی نەریتی ســـەردەمی خۆمان بکەین، وەک دەفەرموێ: خُذِ ٱلْعَفْوَ وَأْمُرْ بِٱلْعُرْفِ وَأَعْرِضْ عَنِ ٱلْجَٰهِلِينَ (الأعراف: ١٩٩) واتە: دەســـت بگرە بە لێبوردەیی یەوە (چاوو پۆشـــی بکە) فەرمانیش بدە بە چاکە و چاکە کردن و ڕوو وەرگێڕە لە نەفامان و نەزانان واتە وازیان لێ بێنە.

(عرف) دوو شــت دەگرێتەوە، یەکەم فەرمان بە چاکە، دووەم فەرمان کردن دەســـت گرتن بەنەریتی باش: وَعَاشِرُوهُنَّ بِٱلْمَعْرُوفِ فَإِن كَرِهْتُمُوهُنَّ فَعَسَىٰٓ أَن تَكْرَهُوا۟ شَيْـًٔا وَيَجْعَلَ ٱللَّهُ فِيهِ خَيْرًا كَثِيرًا (النساء: ١٩) ژیان لە گەڵ خێزان هەم بەچاکە دەگرێتەوە، هەم بەپێی جوانترین نەریتی کۆمەڵگا دەگرێتەوە.

١٧. لە قورئانی پیرۆزدا نمونەی زۆر هێندراوەتەوە بۆ هەموو شـــتێک، دیارە هەموو ئەو نمونانە ئامانجی زۆری لە پشتە پێویستە هەوڵ دەین لە نمونەکان تێ بگەین: وَتِلْكَ ٱلْأَمْثَٰلُ نَضْرِبُهَا لِلنَّاسِ وَمَا يَعْقِلُهَآ إِلَّا ٱلْعَٰلِمُونَ (العنکبوت: ٤٣) واتە: ئەو وێنەو نموونانە بۆ خەڵکی دێنینەوە تەنها زانایان لەوانە تێدەگەن.

١٨. قورئان ڕێنماییمان دەکا کە میانەڕەو بین، نەک زیادەڕەو کار بین، نە کەمتەرخەم، خوای گەورە دەفەرموێ: وَكَذَٰلِكَ جَعَلْنَٰكُمْ أُمَّةً وَسَطًا لِّتَكُونُوا۟ شُهَدَآءَ عَلَى ٱلنَّاسِ....... (البقرة: ١٤٣) وە دەفەرموێ: وَٱلَّذِينَ إِذَآ أَنفَقُوا۟ لَمْ يُسْرِفُوا۟ وَلَمْ يَقْتُرُوا۟





وَكَانَ بَيْنَ ذَٰلِكَ قَوَامًا (الفرقان: ﴿٦٧﴾) واته: وه کەسانێکن کاتێ ماڵ و سامان خەرج دەکەن (بۆ خۆیان و خێزانیان) نە زیادە ڕەوی و نە ڕەزیلی و دەست نوقاوی (تێدا) ناکەن (بەڵکو) مام ناوەندیە لەو نێوانەدا، وەهەتا دەبێ ئیمە لەبەخشینیشدا زیادە ڕەوی و کەمتەرخەمی نەکەین.

١٩. لە قورئانی پیرۆزدا سنوورەکان هەتا دەبێ بیان پارێزین: ٱلتَّٰٓئِبُونَ ٱلْعَٰبِدُونَ ٱلْحَٰمِدُونَ ٱلسَّٰٓئِحُونَ ٱلرَّٰكِعُونَ ٱلسَّٰجِدُونَ ٱلْـَٔامِرُونَ بِٱلْمَعْرُوفِ وَٱلنَّاهُونَ عَنِ ٱلْمُنكَرِ وَٱلْحَٰفِظُونَ لِحُدُودِ ٱللَّهِ وَبَشِّرِ ٱلْمُؤْمِنِينَ (التوبة: ﴿١١٢﴾) واته: موجاهیدان ئەمانە سیفەتیانە تۆبەکارن خوا پەرستن سوپاسگوزارن گەشتیارن و کۆچەرن کڕنوش و سوژدە بەرن (نوێژ خوێنن) فەرمان دەرن بەچاکە و بەرگری کەرن لە خراپە پارێزەران بۆ سنوورەکانی خودا جا (ئەی موحەممەد(صلی الله علیه وسلم) موژدە بدە بەو باوەڕدارانەی (ئەو سیفاتانەیان) تیایە.

والحافظون لحدودالله، حەددەکان ئەوانە کە لە ئایەتەکاندا باسکراون، وە نابێ تخونیانکەوین

أُحِلَّ لَكُمْ لَيْلَةَ ٱلصِّيَامِ ٱلرَّفَثُ إِلَىٰ نِسَآئِكُمْ هُنَّ لِبَاسٌ لَّكُمْ وَأَنتُمْ لِبَاسٌ لَّهُنَّ عَلِمَ ٱللَّهُ أَنَّكُمْ كُنتُمْ تَخْتَانُونَ أَنفُسَكُمْ فَتَابَ عَلَيْكُمْ وَعَفَا عَنكُمْ فَٱلْـَٰٔنَ بَٰشِرُوهُنَّ وَٱبْتَغُواْ مَا كَتَبَ ٱللَّهُ لَكُمْ وَكُلُواْ وَٱشْرَبُواْ حَتَّىٰ يَتَبَيَّنَ لَكُمُ ٱلْخَيْطُ ٱلْأَبْيَضُ مِنَ ٱلْخَيْطِ ٱلْأَسْوَدِ مِنَ ٱلْفَجْرِ ثُمَّ أَتِمُّواْ ٱلصِّيَامَ إِلَى ٱلَّيْلِ وَلَا تُبَٰشِرُوهُنَّ وَأَنتُمْ عَٰكِفُونَ فِي ٱلْمَسَٰجِدِ تِلْكَ حُدُودُ ٱللَّهِ فَلَا تَقْرَبُوهَا كَذَٰلِكَ يُبَيِّنُ ٱللَّهُ ءَايَٰتِهِۦ لِلنَّاسِ لَعَلَّهُمْ يَتَّقُونَ (البقرة: ﴿١٨٧﴾) واته: ڕێتان پێ دراوە لەشەوانی ڕۆژوو(ی ڕەمەزان) دا درووست بوون لەگەڵ ژنەکانتان ئەوان بۆ ئێوە پۆشاکن وە ئێوەش بۆ ئەوان پۆشاکن خوا دەیزانی کەئێوە ناپاکیتان لەخۆتان دەکرد بۆیە پەشیمانی لێ گیراکردن وەلێتان خۆش بوو ئیتر لەئێستاوە(بە شەودا) بچنە لایان وە بەدڵ بخوازن ئەوی کە خوا بۆی





نوسـیوون(له منداڵ) وه بخۆن و بخۆنەوە هەتا بۆتان جیا دەبێتەوە ڕوشـتەی سپی(ڕۆژ) له ڕوشتەی ڕەش(ی شەو) لەشەبەقدا لەپاشان ڕۆژووەکەتان تەواو بکەن تاشەوی دوایی وەمەچنەلای ژنەکانتان لەکاتێکدا کە لەمزگەوتدا مابنەوە بۆ خواپەرستی ئەمانە سنوورانی خودان و نزیکیان مەکەونەوە ئاوا خوا باسی فرمانی خۆی دەکات بۆ خەڵکی تا خۆیان بپارێزن.

ئەمانەی لەئایەتەکەدا باس کران دەبێ بەخراپە لێ یان نزیک نەبینەوە، تلك حدودالله فلا تقربوها، وه نابێ سنوورەکان بشکێنین.

ٱلطَّلَٰقُ مَرَّتَانِ فَإِمۡسَاكُۢ بِمَعۡرُوفٍ أَوۡ تَسۡرِيحُۢ بِإِحۡسَٰنٖۗ وَلَا يَحِلُّ لَكُمۡ أَن تَأۡخُذُواْ مِمَّآ ءَاتَيۡتُمُوهُنَّ شَيۡـًٔا إِلَّآ أَن يَخَافَآ أَلَّا يُقِيمَا حُدُودَ ٱللَّهِۖ فَإِنۡ خِفۡتُمۡ أَلَّا يُقِيمَا حُدُودَ ٱللَّهِ فَلَا جُنَاحَ عَلَيۡهِمَا فِيمَا ٱفۡتَدَتۡ بِهِۦۗ تِلۡكَ حُدُودُ ٱللَّهِ فَلَا تَعۡتَدُوهَاۚ وَمَن يَتَعَدَّ حُدُودَ ٱللَّهِ فَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلظَّٰلِمُونَ (البقرة: ٢٢٩) واته: تەڵاقێک کە بردنەوەی لە دواوە بێت دوو جاره، دوای ئەوە ڕاگرتنە بەخۆشـیی یان بەڕەڵاکردنە بەباشـی، وە دروسـت نی یە بۆ ئێوە کەلێ بسـەننەوە هیچێک لەوشـتانەی کەداوتاننێ مەگەر هەردوولا بترسـن(لەوەی) کە سـنووری خوا ڕانەگرن، جا ئەگەر ترسـان لەوەی سـنووری خوا ڕانەگرن ئەوا پیاوو ئافرەتەکە گوناهیان ناگات بەوە کە ژنەکە لەبریتی خۆی بیدات، ئەمانەی( باسـکران) سـنووری خوان لێیان دەرمەچن، وە هەرکەسێک لە سنووری خوا دەربچێت ئا ئەوانە ستەمکارن.

لەکاتی کێشـەی خێزانی ژن و پیاودا تورەبوون و ناخۆشـی ڕوو دەدا، بۆیە دەبێ تێپەراندن نەکەن( تلک حدودالله فلاتعتدوها)

٢٠. ئەسـڵ وایە ئەو ئایەتانەی مەرجدار کراوە و وەسـفدار کراوە ئەوە حوکمەکانیان و نەتیجەکانیان نایەتەدی مەگەر بەو مەرج و وەسـفانە نەبێ کەباس کراوە، مەگەر قەید و مەرجەکە بۆ غالبیە و ناشـیرن کردن و نەریت بێ: يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا تَأۡكُلُواْ ٱلرِّبَوٰٓاْ أَضۡعَٰفٗا مُّضَٰعَفَةٗۖ وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ لَعَلَّكُمۡ تُفۡلِحُونَ (آل





عمران: ﴿١٣٠﴾) واتە: ئەی کەسانێ کە بڕواتان هێناوە سوو مەخۆن چەند بەرامبەر و لە خوا بترسن بۆ ئەوەی ڕزگاربن.

(أضعافا مضاعفة) مەرجی حەرام بوون نییە بەڵام بەزۆری نەریتیان وا بووە ڕیبایان زۆر خواردووە، دەنا کەمیش بێ هەر حەرامە.

٢١. ئیمان بوون بە ناو و سیفەتەکانی خوا سێ شت دەگرێتەوە:

- ✓ ئیمان بوون بە ناو و سیفەتەکە.
- ✓ بە ماناکەی.
- ✓ بە شـوێنەوارەکەی. بۆ نمونە خالق ناوی خوایە، بەمانای دروسـتکار و ئەندازەگیر دێ، وە مەخلوقاتەکان شوینەوارو بەڵگەی ئەو ناوە پیرۆزەن.

٢٢. ربوبیەتی خوای گەورە لە قورئانی پیرۆز دا دوو بەشە:

یەکەم گشتیە بۆ هەموو دروست کراوەکانە.

دووەم تایبەتە بۆ ئیمانداران و چاکەکاران.

نمونەی یەکەم وەک دەفەرموێ: ٱلْحَمْدُ لِلَّهِ رَبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ (الفاتحة: ﴿٢﴾) سـتایش بۆ خودای خاوەن جیهانیان.

نمونەی دووەم کە تایبەتە وەک دەفەرموێ: إِنَّهُۥ رَبِّىٓ أَحْسَنَ مَثْوَاىَ إِنَّهُۥ لَا يُفْلِحُ ٱلظَّٰلِمُونَ (یوسف: ﴿٢٣﴾)

کە ئەم ڕبوبیەتە تایبەتە بەمانای پاراسـتن و ئیمان بەهێز کردن و چاکە لەگەڵدا کردن دێ. وە زۆرێک لە ناو و سـیفەتەکانیش هەروان، وەک لەگەڵدا بوون(معیة الله)، وەک بیستن ...





٢٣. ئەگەر خـوای گەورە ئەمـری بە شـــتێـک کرد ئەوە نەهـی دەکـا لە پێچەوانەکەی، ئەگەر لەشـتێک بێدەنگ بوو یان چاوپۆشـی کرد ئەوە ڕێگەدانە بە شـــتەکە، وە ئەگەر نەفی ســـیفەتێکی لەخۆی یان لە بەندەکانی کرد ئەوە ئیسپا کردنی کەمال و تەواوی خۆیەتی.

٢٤. دوو جۆر نەخۆشـی هەیە: یەکەم نەخۆشـــی گومان شـــوبهە، دووەم نەخۆشـی دڵ، نەخۆشـی شـوبهە بە بیروو باوەڕ وەلآم دەدرێتەوە، نەخۆشـی دڵ بەچارە ســەرە مەعنەویەکان چارە دەکرێ، دەتوانین دابەشـکردنێکی تر بکەین، بڵێین نەخۆشـی گومان و دوودڵی، وە نەخۆشـی شـەهەوات و ئارەزوەکان. ئەم نەخۆشیە کە ئارەزوەکانن دەبێ بەئیمان و خۆپاراستن و زەواج چارەسەر بکرێ، وە دەتوانین بڵێین نەخۆشی لاشەیی مان هەیە و نەخۆشی روحی، هەموو ئەو جۆرە نەخۆشـــیانە لەقورئانی پیرۆزدا باســـی کراوە و هۆکار و شـــوێنەوار و چارەسەریشی باس کراوە.

٢٥. قورئانی پیرۆز دڵنیامان دەکاتەوە لەوەی ئەگەر سـەرقاڵ نەبین بە ئیمان و کردەوەی چاک، ئەوە سـەرقاڵ دەبین بە خزمەت کردنی شـەیتان و کردەوەی خراپ: ٱللَّهُ وَلِيُّ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ يُخْرِجُهُم مِّنَ ٱلظُّلُمَٰتِ إِلَى ٱلنُّورِ وَٱلَّذِينَ كَفَرُوٓاْ أَوْلِيَآؤُهُمُ ٱلطَّٰغُوتُ يُخْرِجُونَهُم مِّنَ ٱلنُّورِ إِلَى ٱلظُّلُمَٰتِ أُوْلَٰٓئِكَ أَصْحَٰبُ ٱلنَّارِ هُمْ فِيهَا خَٰلِدُونَ (البقرة: ٢٥٧) واتە: خوا دۆســـت و کارســـازی ئەوانەیە کە بڕوادارن دەریان دەهێنێت لە تاریکستانی بێ بڕوایی بۆ ڕووناکی باوەڕو ڕێنموونیی وە ئەوانەی کە بێ بڕوان شـــەیتـان دۆســـتیـانـە دەریـان دەهێنێ لـە ڕووناکی(و بیر و بـاوەڕ) ەوە بۆ تاریکستان ئەوانە هاوڕێی دۆزەخن تیایا ئەمێننەوە هەتا هەتایە.

ئەگەر بڕوادار بی خوای گەورە ڕزگارت دەکا لە تاریکاییەکانی دونیاو دواڕۆژ، وە بەپێچەوانەوەش هەر راســتە: وَٱتَّبَعُواْ مَا تَتْلُواْ ٱلشَّيَٰطِينُ عَلَىٰ مُلْكِ سُلَيْمَٰنَ وَمَا كَفَرَ سُلَيْمَٰنُ وَلَٰكِنَّ ٱلشَّيَٰطِينَ كَفَرُواْ يُعَلِّمُونَ ٱلنَّاسَ ٱلسِّحْرَ وَمَآ أُنزِلَ عَلَى ٱلْمَلَكَيْنِ





بِبَابِلَ هَٰرُوتَ وَمَٰرُوتَ وَمَا يُعَلِّمَانِ مِنْ أَحَدٍ حَتَّىٰ يَقُولَآ إِنَّمَا نَحْنُ فِتْنَةٌ فَلَا تَكْفُرْ فَيَتَعَلَّمُونَ مِنْهُمَا مَا يُفَرِّقُونَ بِهِۦ بَيْنَ ٱلْمَرْءِ وَزَوْجِهِۦ وَمَا هُم بِضَآرِّينَ بِهِۦ مِنْ أَحَدٍ إِلَّا بِإِذْنِ ٱللَّهِ وَيَتَعَلَّمُونَ مَا يَضُرُّهُمْ وَلَا يَنفَعُهُمْ وَلَقَدْ عَلِمُواْ لَمَنِ ٱشْتَرَىٰهُ مَا لَهُۥ فِى ٱلْءَاخِرَةِ مِنْ خَلَٰقٍ وَلَبِئْسَ مَا شَرَوْاْ بِهِۦٓ أَنفُسَهُمْ لَوْ كَانُواْ يَعْلَمُونَ (البقرة: ١٠٢) لەکاتێ پشتیان لەفەرمانی خواو پێغەمبەرەکەی کرد شوێن پلانەکانی شەیتان جنۆکە کەوتن.

٢٦. ڕەچاو کردنی گەورەترین بەرژەوەندی، وە لەبەرچاو گرتنی تەحەممول کردنی کەمترین زیان بۆ ئەوەی توشی گەورەترین نەبین، بۆنمونە بەسەرهاتی موسا لە گەڵ خدر هەرسێکیان پشتیوانیب لەم ڕاستیە دەکەن، بۆ نمونە خواردنی مردارەوە بوو بۆ بەرژەوەندی گەورەتر کە پاراستنی گیانە...

٢٧. قورئان تۆڵە سەندنەوەمان بە ئەندازەی خۆی بۆ حەڵاڵ دەکا، بەڵام نابێ زیادە ڕەوی بکەین، وە ئەگەر چاو پۆشی بکەین باشترە: يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ كُتِبَ عَلَيْكُمُ ٱلْقِصَاصُ فِى ٱلْقَتْلَى ٱلْحُرُّ بِٱلْحُرِّ وَٱلْعَبْدُ بِٱلْعَبْدِ وَٱلْأُنثَىٰ بِٱلْأُنثَىٰ فَمَنْ عُفِىَ لَهُۥ مِنْ أَخِيهِ شَىْءٌ فَٱتِّبَاعٌۢ بِٱلْمَعْرُوفِ وَأَدَآءٌ إِلَيْهِ بِإِحْسَٰنٍ ذَٰلِكَ تَخْفِيفٌ مِّن رَّبِّكُمْ وَرَحْمَةٌ فَمَنِ ٱعْتَدَىٰ بَعْدَ ذَٰلِكَ فَلَهُۥ عَذَابٌ أَلِيمٌ (البقرة: ١٧٨) واتە: ئەی ئەو کەسانەی کە بڕواتان هێناوە پێویست کراوە لەسەر تان تۆڵە سەندن لە کوژراواندا(بەیەکسانی) ئازاد بە ئازادو بەندە بە بەندە و ژن بە ژن (مێینە بە مێینە) ئینجا هەرکەسێک بەخشرا لەلایەن برایەکی دینیەوە بەبەشێک(لە خوێنەکە) ئەبێ(خزمەکانی تر) پەیڕەوی بکەن بەباشی(بکوژیش) بەچاکی خوێنەکە بدات ئەمە سووک کردنە لەپەروەردگارتانەوەو میهرە بانی یە ئینجا هەرکەسێک دوای ئەمە دەست درێژیی کرد بۆئەو هەیە سزای بەسوێ، واتە سزای بەئازار.





وَقَٰتِلُواْ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ ٱلَّذِينَ يُقَٰتِلُونَكُمْ وَلَا تَعْتَدُوٓاْ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يُحِبُّ ٱلْمُعْتَدِينَ (البقرة: ١٩٠) جەنگ بکەن لەڕێ ی خوادا لەگەڵ ئەوانەی جەنگتان لەگەڵدا دەکەن وەدەست درێژی مەکەن بەڕاستی خودا دەست درێژی کەرانی خۆش ناوێت.

٢٨. خوای گەورە خێر و پاداشتی کردەوەکانی بەستۆتەوە بە نیەت و مەبەستەکان، بۆ نمونە چاکە: مَّثَلُ ٱلَّذِينَ يُنفِقُونَ أَمْوَٰلَهُمْ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ كَمَثَلِ حَبَّةٍ أَنۢبَتَتْ سَبْعَ سَنَابِلَ فِي كُلِّ سُنۢبُلَةٍ مِّاْئَةُ حَبَّةٍ وَٱللَّهُ يُضَٰعِفُ لِمَن يَشَآءُ وَٱللَّهُ وَٰسِعٌ عَلِيمٌ (البقرة: ٢٦١) واتە: وێنەی(خێری) ئەوانەی کە ماڵی خۆیان بەخت دەکەن لە ڕێ ی خوادا وەک دەنکێک(تۆو) وایە (ڕوابێت) و حەوت گوڵی گرتبێت لەهەر گوڵێک سەد دانەی تێدا بێت وە خوا لەمەش زیاتری دەکات بۆ هەر کەسێک کە خۆی بیەوێت وە خوا خاوەن بەهرەی فراوانی ئاگادارە.

بۆ نمونە بۆ نیەتی خراپ و ڕوپامایی دەفەرموێ: يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا تُبْطِلُواْ صَدَقَٰتِكُم بِٱلْمَنِّ وَٱلْأَذَىٰ كَٱلَّذِي يُنفِقُ مَالَهُۥ رِئَآءَ ٱلنَّاسِ وَلَا يُؤْمِنُ بِٱللَّهِ وَٱلْيَوْمِ ٱلْءَاخِرِ فَمَثَلُهُۥ كَمَثَلِ صَفْوَانٍ عَلَيْهِ تُرَابٌ فَأَصَابَهُۥ وَابِلٌ فَتَرَكَهُۥ صَلْدًا لَّا يَقْدِرُونَ عَلَىٰ شَيْءٍ مِّمَّا كَسَبُواْ وَٱللَّهُ لَا يَهْدِي ٱلْقَوْمَ ٱلْكَٰفِرِينَ (البقرة: ٢٦٤) ئەی ئەوانەی بڕواتان هێناوە پوچەڵی مەکەنەوە خێرو بەخشینەکانتان بە منەت نان و ئازاردان و دڵ ئێشان وەک ئەو کەسەی ماڵ و سامانی خۆی بەخت دەکات بۆ ڕووپامایی خەڵک وە باوەڕی نیە بەخواو بە ڕۆژی دوایی جا وێنەی ئەو ناپاکانە وەک بەردێکی لووس وایە کە گڵێکی کەمی بەسەرەوە بێت ئینجا بارانێکی لێزمەی لێ بدات وە بەردەکە بهێڵێتەوە بە ڕووتی ناتوانن دەستی بخەن هیچ لەوەی کە کردوویانە وە خوا ڕێنموونیی ناکات گەلی بێ بڕواو خوا نەناس.

٢٩. چەندین ئایەت دەلالەت دەکەن لەسەر دڵنەوای دڵ شکاو و هەژارو نەدارەکان: وَهُوَ ٱلَّذِيٓ أَنشَأَ جَنَّٰتٍ مَّعْرُوشَٰتٍ وَغَيْرَ مَعْرُوشَٰتٍ وَٱلنَّخْلَ وَٱلزَّرْعَ مُخْتَلِفًا





أُڪُلُهُۥ وَٱلزَّيۡتُونَ وَٱلرُّمَّانَ مُتَشَٰبِهٗا وَغَيۡرَ مُتَشَٰبِهٖۚ كُلُواْ مِن ثَمَرِهِۦٓ إِذَآ أَثۡمَرَ وَءَاتُواْ حَقَّهُۥ يَوۡمَ حَصَادِهِۦۖ وَلَا تُسۡرِفُوٓاْۚ إِنَّهُۥ لَا يُحِبُّ ٱلۡمُسۡرِفِينَ (الأنعام: ١٤١) وآتوا حقه يوم حصاده، چەندین هەژارو داماو هەیە لەسەر خەرمان چاوی لەوەیە مافە کەی بدەیتێ، خوا دەفەرموێ هەر لەسەر خەرمان حەقی هەژارانی لێ بدە، وە دەفەرموێ: وَإِذَا حَضَرَ ٱلۡقِسۡمَةَ أُوْلُواْ ٱلۡقُرۡبَىٰ وَٱلۡيَتَٰمَىٰ وَٱلۡمَسَٰكِينُ فَٱرۡزُقُوهُم مِّنۡهُ وَقُولُواْ لَهُمۡ قَوۡلٗا مَّعۡرُوفٗا (النساء: ٨) واتە: جا ئەگەر کاتی دابەش کردنی(کەلەپورەکە) ئامادەبوون خزمە نزیکەکان(کە میرات ناگرن لە مردوو) و هەتیوو و هەژارە(بێگانە) کان ئەو لەو کەلەپووره بەشیان بدەن(ئەم بەش دانە سوننەتە نەک واجب) وە قسەیان لەگەڵ بکەن بە قسەکردنێکی جوان و چاک.

بەداخەوە ئەم یاسا جوانە فەرامۆش کراوە جاری وایە دەیان دەفتەر دۆلار بەسەر میرات بەراندا دابەش دەکرێ بەڵام بەشی یەک هەژار نادرێ کە خزمی مردووش بێ.

٣٠. ڕێنمای قورئانی پیرۆز بۆ سیاسەت و حوکم کردن: کارکردن بە شورا، واتە ڕاوێژکردن: ........... وَأَمۡرُهُمۡ شُورَىٰ .......... (الشورى: ٣٨) کەسی شایەن سەرکردە بێ: .......قَالَ إِنَّ ٱللَّهَ ٱصۡطَفَىٰهُ عَلَيۡكُمۡ وَزَادَهُۥ بَسۡطَةٗ فِي ٱلۡعِلۡمِ وَٱلۡجِسۡمِۖ وَٱللَّهُ يُؤۡتِي مُلۡكَهُۥ مَن يَشَآءُۚ وَٱللَّهُ وَٰسِعٌ عَلِيمٞ (البقرة: ٢٤٧) .

هێزی بەڕێوەبردن و هێزی لاشە، پاراستنی مافەکان و حوکم بە دادگەری: إِنَّ ٱللَّهَ يَأۡمُرُكُمۡ أَن تُؤَدُّواْ ٱلۡأَمَٰنَٰتِ إِلَىٰٓ أَهۡلِهَا وَإِذَا حَكَمۡتُم بَيۡنَ ٱلنَّاسِ أَن تَحۡكُمُواْ بِٱلۡعَدۡلِۚ إِنَّ ٱللَّهَ نِعِمَّا يَعِظُكُم بِهِۦٓۗ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ سَمِيعَۢا بَصِيرٗا (النساء: ٥٨) واتە: بەڕاستی خوا فەرمانتان پێ دەکات بەدانەوەی گشت سپاردەکان بۆ خاوەنەکانیان وە کاتێك دادوەریتان کرد لە نێوان خەڵکیدا بە داد حوکم بکەن بەڕاستی خوا بە چاکی ئامۆژگاریتان دەکات بەڕاستی خوا هەمیشە بیسەری بینایە.





ئەمانەت واتە مافەکان، حوکم بە عەدالەت سیاسـەت و ئیدارە و قەزایەکی دادگەرانە، ئـامـادە کردنی هێز: وَأَعِدُّواْ لَهُم مَّا ٱسۡـــتَطَعۡتُم مِّن قُوَّةٖ وَمِن رِّبَاطِ ٱلۡخَيۡلِ تُرۡهِبُونَ بِهِۦ عَدُوَّ ٱللَّهِ وَعَدُوَّكُمۡ وَءَاخَرِينَ مِن دُونِهِمۡ لَا تَعۡلَمُونَهُمُ ٱللَّهُ يَعۡلَمُهُمۡ وَمَا تُنفِقُواْ مِن شَيۡءٖ فِي سَـــبِيلِ ٱللَّهِ يُوَفَّ إِلَيۡكُمۡ وَأَنتُمۡ لَا تُظۡلَمُونَ (الأنفـال: ﴿٦٠﴾) واتە: ئـەی ئیمانداران ئامادەی بکەن بۆیان ئەوەی لە تواناتاندا هەیە لە هێز وە لە ئەسپی دابەســتراو تا بترسـێنن پێ ی دوژمنی خواو دوژمنی خۆتان، وە کەســانێکی تریش بێجگە لەوان، ئێوە نایان ناسن خوا دەیانناسێ وە هەرشتێك ببەخشن لـەڕێ ی خوادا (پاداشـــتـەکەی) بـەتـەواوی دەدرێتـەوە پێتـان وە ئێوە هیچ ستەمتان لێ ناکرێت.

وەڵاتی بێ هێز هەمیشـــە لەژێر پێیان کەوتوە، بەڵام هێز بۆ داگیر کردن نا بەڵکو بۆ پاراســتنی شــکۆی مرۆڤایەتی، ئەوجار بەردەوام وریایی و ئاگا لەخۆ بوون: يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ خُذُواْ حِذۡرَكُمۡ فَٱنفِرُواْ ثُبَاتٍ أَوِ ٱنفِرُواْ جَمِيعٗا (النساء: ﴿٧١﴾) واتە: ئەی کەسانێك کە باوەڕتان هێناوە ئاگاداریی خۆتان وەرگرن ئەوسا تاقم تاقم هێرش بەرن و دەرچن بۆ جیهاد.

بەدەستەوە گرتنی هۆکارەکان: إِنَّا مَكَّنَّا لَهُۥ فِي ٱلۡأَرۡضِ وَءَاتَيۡنَٰهُ مِن كُلِّ شَيۡءٖ سَبَبٗا (الکهف: ﴿٨٤﴾) واتە: بەڕاســـتی ئێمە هێزو دەســـەڵاتمان پێ دا لە زەوی دا وە هۆکاری هەموو شتێکمان پێ دابوو (کە پاشایەتی پێویستی) بوو.

وە شتی تریش زۆرە وەک لایەنی هێزی مەعنەوی و پشت بە خوا بەستن و نمونەکانی سـەرکەوتو لە حوکمڕانی وەک سولەیمان، داوود، زوولقەڕنەین، وە ڕەسوڵ الله ش لەسەروی هەموویانەوە.





٣١. ڕێنمای بۆ بنچینەی پزیشکی و لەش ساغی: یەکەم بە هۆی زیادەڕەوی نەکردن لە خواردن و خواردنەوە دا: وَكُلُوا۟ وَٱشْرَبُوا۟ وَلَا تُسْرِفُوٓا۟ إِنَّهُۥ لَا يُحِبُّ ٱلْمُسْرِفِينَ (الأعراف: ٣١)

پاک خۆری: يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ كُلُوا۟ مِن طَيِّبَٰتِ مَا رَزَقْنَٰكُمْ وَٱشْكُرُوا۟ لِلَّهِ إِن كُنتُمْ إِيَّاهُ تَعْبُدُونَ (البقرة: ١٧٢) واتە: ئەی ئەو کەســـانەی کە بڕواتان هێناوە بخۆن لەو خواردەمەنی یە پاکانەی کردومانە بەڕۆزیتان وە سوپاسی خوا بکەن ئەگەر ئێوە هەر ئەو دەپەرستن.

ئەوجار جوڵەو وەرزش کردن، کە لە هەموو قورئان دا دانیشـــتن و پاڵدانەوە بە مەدح هاتبێ مەگەر بۆ حەسانەوەو فێربوونی زانست .

٣٢. قورئـان ئیرشـــادمان دەکا کاری وەختی خۆی لەکاتی خۆیدا بکەین، نەپێشـــی خەین نەدوای خەین: أَلَمْ تَرَ إِلَى ٱلَّذِينَ قِيلَ لَهُمْ كُفُّوٓا۟ أَيْدِيَكُمْ وَأَقِيمُوا۟ ٱلصَّلَوٰةَ وَءَاتُوا۟ ٱلزَّكَوٰةَ فَلَمَّا كُتِبَ عَلَيْهِمُ ٱلْقِتَالُ إِذَا فَرِيقٌ مِّنْهُمْ يَخْشَوْنَ ٱلنَّاسَ كَخَشْيَةِ ٱللَّهِ أَوْ أَشَدَّ خَشْيَةً وَقَالُوا۟ رَبَّنَا لِمَ كَتَبْتَ عَلَيْنَا ٱلْقِتَالَ لَوْلَآ أَخَّرْتَنَآ إِلَىٰٓ أَجَلٍ قَرِيبٍ قُلْ مَتَٰعُ ٱلدُّنْيَا قَلِيلٌ وَٱلْءَاخِرَةُ خَيْرٌ لِّمَنِ ٱتَّقَىٰ وَلَا تُظْلَمُونَ فَتِيلًا (النساء: ٧٧) واتە: ئایا سەیری ئەو کەسانەت نە کردووە کە پێیان وترا دەستان بگێڕنەوە (لە جەنگ و کوشتار) و نوێژ بکەن و زەکات بدەن ؟ کەچی کاتێك جەنگیان لەســـەر پێویســـت کرا یەکسەر دەستەیەکیان لە خەڵکی دەترسان وەك ترسان لە خودا بگرە زیاتریش دەترســـان دەیان وت ئەی پەروەردگاری ئێمە بۆچی جەنگت لەســـەرمان پێویســت کردووە خۆزگە دوات دەخســتین(لە جەنگ کردن) بۆ ماوەیەکی کەم بڵێ خۆشــی و لەزەتی دنیا زۆر کەمە و ڕۆژی دوایی باشــترە بۆ کەسـێك لەخوا بترسێت وە ستەمتان لێ ناکرێت بە (ئەندازەی) تاڵی ناوکە خورمایەك.





ئەوانە داوای شـــتێكیان كرد كە هێشـــتا كاتی نەهاتبوو بۆیەش كەوەختی هات شایەن و ئەهل نەبوون و ئامادە نەبوون.

٣٣. خوای گەورە ئیرشـــادمان دەكا پەلە نەكەین لە حوكم داندا، چونكە سـەرەنجامی خراپی لێ دەكەوێتەوە: يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِن جَآءَكُمۡ فَاسِقُۢ بِنَبَإٖ فَتَبَيَّنُوٓاْ أَن تُصِيبُواْ قَوۡمَۢا بِجَهَٰلَةٖ فَتُصۡبِحُواْ عَلَىٰ مَا فَعَلۡتُمۡ نَٰدِمِينَ (الحجرات: ٦)

٣٤. خوای گەورە ڕێنمـایمـان دەكـا ژیـان هەمووی تـاقی كردنەوەیە، چ بەخۆشـی چ بەناخۆشـی: كُلُّ نَفۡسٖ ذَآئِقَةُ ٱلۡمَوۡتِۗ وَنَبۡلُوكُم بِٱلشَّرِّ وَٱلۡخَيۡرِ فِتۡنَةٗۖ وَإِلَيۡنَا تُرۡجَعُونَ (الأنبياء: ٣٥) واتە: هەموو كەسـێك مردن دەچێژێ (دەمرێ) وە ئێمە تاقیتان دەكەینەوە بە خراپەو ناخۆشـی وە بە چاكەو خۆشـی تا دەردەكەوێ (چاك و خراپ) وە هەر بۆ لای ئێمە دەگەڕێنەوە.

صلاح و ئیصلاح دوو پرۆسەی تەواوكاری گرنگی قورئانن: قَالَ يَٰقَوۡمِ أَرَءَيۡتُمۡ إِن كُنتُ عَلَىٰ بَيِّنَةٖ مِّن رَّبِّي وَرَزَقَنِي مِنۡهُ رِزۡقًا حَسَنٗاۚ وَمَآ أُرِيدُ أَنۡ أُخَالِفَكُمۡ إِلَىٰ مَآ أَنۡهَىٰكُمۡ عَنۡهُۚ إِنۡ أُرِيدُ إِلَّا ٱلۡإِصۡلَٰحَ مَا ٱسۡتَطَعۡتُۚ وَمَا تَوۡفِيقِيٓ إِلَّا بِٱللَّهِۚ عَلَيۡهِ تَوَكَّلۡتُ وَإِلَيۡهِ أُنِيبُ (هود: ٨٨).

٣٥. صـوڵح لە نێوان ژن و مێرد، یان هەر كەسێكی تر پرۆسـەیەكی گەورەی قورئانیە: وَإِنۡ خِفۡتُمۡ شِقَاقَ بَيۡنِهِمَا فَٱبۡعَثُواْ حَكَمٗا مِّنۡ أَهۡلِهِۦ وَحَكَمٗا مِّنۡ أَهۡلِهَآ إِن يُرِيدَآ إِصۡلَٰحٗا يُوَفِّقِ ٱللَّهُ بَيۡنَهُمَآۗ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ عَلِيمًا خَبِيرٗا (النساء: ٣٥) واتە: وە ئەگەر ترسان لە تێكچونی نێوان(ژن و مێرد) ئەوە ناوبژیوانێك بنێرن لە خزمی پیاوەكە و ناوبژیوانێك لە خزمی ئافرەتەكە ئەگەر(دوو ناوبژیوانەكە) ئاشـتییان بوێ خوا نێوان ژن و مێردەكە چاك دەكاتەوە بەڕاستی خوا هەمیشە زانای ئاگادارە.





وَإِنِ ٱمْرَأَةٌ خَافَتْ مِنۢ بَعْلِهَا نُشُوزًا أَوْ إِعْرَاضًا فَلَا جُنَاحَ عَلَيْهِمَآ أَن يُصْلِحَا بَيْنَهُمَا صُلْحًا وَٱلصُّلْحُ خَيْرٌ وَأُحْضِرَتِ ٱلْأَنفُسُ ٱلشُّحَّ وَإِن تُحْسِنُوا۟ وَتَتَّقُوا۟ فَإِنَّ ٱللَّهَ كَانَ بِمَا تَعْمَلُونَ خَبِيرًا (النساء: ١٢٨) واته: وه ئەگەر ئافرەتێك ترسا لە گوێ پێ نەدان یا پشت هەڵكردنی مێردەكەی ئەوە هەردووكیان هیچ گوناهێكیان لەسەر نی یە كە ئاشتەواییەكی چاك بكەن لە نێوان خۆیاندا هەر ئاشـــتەوایی و یەك كەوتن چاكترە هەر چەندە چروكی و ڕەزیلی تێكەڵاوی دەرونەكان كراوە، وە ئەگەر چاكە كارو پارێزكار بن ئەوە دڵنیا بن بەڕاستی خوا هەمیشە بە ئاگایە لەوەی كە دەیكەن.

وَإِن طَآئِفَتَانِ مِنَ ٱلْمُؤْمِنِينَ ٱقْتَتَلُوا۟ فَأَصْـلِحُوا۟ بَيْنَهُمَا فَإِنۢ بَغَتْ إِحْدَىٰهُمَا عَلَى ٱلْأُخْرَىٰ فَقَـٰتِلُوا۟ ٱلَّتِى تَبْغِى حَتَّىٰ تَفِىٓءَ إِلَىٰٓ أَمْرِ ٱللَّهِ فَإِن فَآءَتْ فَأَصْلِحُوا۟ بَيْنَهُمَا بِٱلْعَدْلِ وَأَقْسِطُوٓا۟ إِنَّ ٱللَّهَ يُحِبُّ ٱلْمُقْسِطِينَ (الحجرات: ٩) واته: ئەگەر دوو كۆمەڵ لە ئیمانداران دژ بەیەكتر جەنگیان كرد ئەوە لە نێوانیاندا ئاشـــتەوایی بكەن ئینجا ئەگەر كۆمەڵێكیان دەســـت درێژی كرد بۆ ســـەر كۆمەڵێكی تریان ئەوە ئێوە (موسوڵمانان) لەگەڵ ئەوەیان بجەنگن دەست درێژی دەكات تا دەگەڕێتەوە بۆ فەرمانی خوا (ملكەچی فەرمانی دەبێ) ئینجا ئەگەر گەڕایەوە ئەوســـا لە نێوانیاندا ئاشتەوایی بكەن بە دادگەرانە و ڕاست و دادپەروەر بن (لە نێوانیاندا) بێگومان خوا دادپەروەرانی خۆش دەوێ.

٣٦. ئەگەر خوای گەورە فەرمانی بە شتێك كرد، ئەوە فەرمانە بۆ ئەو كەسەی لەناو فەرمانەكەدا نیە بچێتە ناوی، وە ئەوەش لەناوی دا خۆی ڕاست كاتەوەو لەسەر شتە راستەكان بەردەوام بێ وەك دەفەرموێ: يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓا۟ ءَامِنُوا۟ بِٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦ وَٱلْكِتَـٰبِ ٱلَّذِى نَزَّلَ عَلَىٰ رَسُولِهِۦ وَٱلْكِتَـٰبِ ٱلَّذِىٓ أَنزَلَ مِن قَبْلُ وَمَن يَكْفُرْ بِٱللَّهِ وَمَلَـٰٓئِكَتِهِۦ وَكُتُبِهِۦ وَرُسُلِهِۦ وَٱلْيَوْمِ ٱلْـَٔاخِرِ فَقَدْ ضَلَّ ضَلَـٰلًۢا بَعِيدًا (النساء: ١٣٦) واته: ئەی كەســـانێك كە باوەڕتان هێناوە بەردەوام بن لەســـەر باوەڕ بە خوداو





پێغەمبەرەکەی و بەو قورئانەی ناردوویەتیە خوارەوە، بۆ فروستادەکەی وە بەو کتێبانەش کە پێشـــتر ناردوویەتیە خوارەوە، وە هەر کەســـێك بێ باوەڕ بێت بەخوا و بە فریشتەکانی و بە کتێبەکانی و پێغەمبەرەکانی و ڕۆژی دوایی ئەوە بەڕاستی گومڕا بووە بە گومڕایی یەکی زۆر دوور(لە ڕاستی) ی.

٣٧. هەرکاتێک خوای گەورە زانینی خۆی بەســـتەوە بەشـــتێکەوە لەدوای بەدیهاتنی ئەوە مەبەست ئەو سزاو پاداشتەیە کە بۆی بڕیار دراوە: يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَيَبْلُوَنَّكُمُ ٱللَّهُ بِشَيْءٖ مِّنَ ٱلصَّيْدِ تَنَالُهُۥٓ أَيْدِيكُمْ وَرِمَاحُكُمْ لِيَعْلَمَ ٱللَّهُ مَن يَخَافُهُۥ بِٱلْغَيْبِ فَمَنِ ٱعْتَدَىٰ بَعْدَ ذَٰلِكَ فَلَهُۥ عَذَابٌ أَلِيمٌ (المائدة: ﴿٩٤﴾) واتە: ئەی ئەوانەی بڕواتان هێناوە ســـوێند بەخوا، خوا تاقیتان دەکاتەوە بە هەندێك نێچیر کە بەدەســـت دەیانگرن و بە ڕمەکانتان ڕاویان دەکەن تا خوا دەری بخات کێ لێ ی دەترسێ بە پەنهانی ئینجا هەرکەس دەست درێژی بکات دوای ئەو(هەواڵ پێدانە) ئەوە بۆی هەیە سزایەکی بە ئازار.

خوای گەورە بۆ ئەوەی نیە زانیاری دەســـت خا کە دەفەرموێ (لیعلم) بەڵکو بۆ ئەوەیە پاداشتی یان سزای بداتەوە.

٣٨. ئەگەر خوای گەورە نەفی علمی خۆی کرد لە شـــتێـک ئەوە نەفی معلومەکەیە واتە زانراوەکە، نەوەک زانینی خۆی، چونکە خوای گەورە هەموو شتێک دەزانێ پێشترو دواتر، ببێ یان نەبێ، بۆ نموونە: وَيَعْبُدُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ مَا لَا يَضُرُّهُمْ وَلَا يَنفَعُهُمْ وَيَقُولُونَ هَٰٓؤُلَآءِ شُفَعَٰٓؤُنَا عِندَ ٱللَّهِ قُلْ أَتُنَبِّـُٔونَ ٱللَّهَ بِمَا لَا يَعْلَمُ فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَلَا فِى ٱلْأَرْضِ سُبْحَٰنَهُۥ وَتَعَٰلَىٰ عَمَّا يُشْرِكُونَ (یونس: ﴿١٨﴾) واتە: ئەوانە بێجگە لەخوا شـتانێك دەپەرسـتن کە نە زیانیان پێ دەگەیەنن نە سـوود و قازانج وە دەڵێن ئەو بتانە تکا کارمانن لای خوا (ئەی موحەممەد(صلی الله حلیه وسلم) بەوانە) بڵێ ئایا ئێوە هەواڵ دەدەن بەخوا بە شـــتێك کە بێ ئاگایە لێ ی لە





ئاســـمانەکان و زەوی دا خوا پاك و بێگەرد و بڵندە لەوەی کە دەیکەنە هاوبەشی.

خوای گەورە لە هیچ شـــتێک بێ ئاگا نیە، بەڵام مەبەســـت ئەوەیە نەفی پەرســـتراوەکە بکا نەوەک نەفی زانینی خۆی، ئەمە شـــێوازێکی قســـە کردنی ئاساییە، دەڵێی ئەگەر وابا دەمزانی، واتە مادام نایزانم نیە، یان دەڵێی تۆ ئەوە بەمن دەڵێی، یان ئەوە فێری من دەکەی؟ مەبەســـتت ئەوەیە من دەیزانیم شتی وانیە.

٣٩. ئەگەر خوای گەورە مرۆڤی لە شـــتیک مەنع کرد ئەوە بەدیلی باشـــتریان پێ دەڵێ: وَلَا تَتَمَنَّوْاْ مَا فَضَّـــلَ ٱللَّهُ بِهِۦ بَعْضَـــكُمْ عَلَىٰ بَعْضٍ لِّلرِّجَالِ نَصِـــيبٌ مِّمَّا ٱكْتَسَبُواْ وَلِلنِّسَآءِ نَصِيبٌ مِّمَّا ٱكْتَسَبْنَ وَسْـَٔلُواْ ٱللَّهَ مِن فَضْلِهِۦٓ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ بِكُلِّ شَىْءٍ عَلِيمًا (النســـاء: ٣٢) واتە: وە ئـاوات مـەخوازن بۆ ئـەو پلـەیـەی کـە خوا بـاوی هـەندێکتـانی داوە بـەســـەر هـەندێکی ترتـاندا بۆ پیـاوان بـەش هـەیـە لـەوەی بەدەستی ئەهێنن وە بۆ ئافرەتانیش بەش هەیە لەوەی بەدەستی ئەهێنن وە داوا لەخوا بکەن لە بەهرەو بەخششی خۆی بەڕاستی خوا هەمیشە بە هەموو شتێك زانایە.

خوای گەورە ڕێنمایمان دەکا لەجیاتی ئەوەی حەســـودی بەرین باکاســـبی بکەین، وە خوای گەورە لەجیـاتی پـارەو مـاڵی حەرامی ئـافرەتـان خوای گەورە میراتی بۆ حەلاڵکردوین، وە لەجیـاتی داوێن پیســـی هـاوســـەر گیری حەلاڵ کردوە، لەجیـاتی خواردنی پیس و حەرام خواردنی پـاک و بەســـودی حەلاڵ کردوە.

٤٠. بەڵگەکانی پێغەمبەرایەتی پێغەمبەرعلیە الصـلاة والســلام خوای گەورە باســی کردون بەلاّم ئەوە بێ باوەڕەکان داوای دەکەن عینادو ســەر کەشــیە، بۆ





باوەڕ هێنان نیە، هەرچی بەڵگەیەک ڕاستی قورئان بسەلمێنێ، ئەوە پێغەمبەرایەتی پێغەمبەریش دەسەلمێنێ.

٤١. هەرکات خوای گەورە فەرمانی بەبەندەکانی کرد لێی بپاڕێنەوە، وە نەهی کرد لە غەیری خوا بپاڕێنەوە، وە مەدحی ئەوانەی کرد کە دەپاڕێنەوە، ئەوەی دوعای عبادەت و دوعای داوا کردنیش دەگرێتەوە،

واتە (دعاء المسئلة ودعاء العبادة) :وَقَالَ رَبُّكُمُ ٱدْعُونِيٓ أَسْتَجِبْ لَكُمْ إِنَّ ٱلَّذِينَ يَسْتَكْبِرُونَ عَنْ عِبَادَتِي سَيَدْخُلُونَ جَهَنَّمَ دَاخِرِينَ (غافر: ٦٠) واتە: وە پەروەردگارتان فەرموویەتی: لێم بپاڕێنەوە وەڵامتان دەدەمەوە بەڕاستی ئەوانەی خۆ بەگەورە دەزانن کە بمپەرستن لەمەوپاش بەسەر شۆڕی دەچنە دۆزەخەوە.

لێرەدا (أدعونی) هەم داوا کردنە، هەم عیبادەت کردنە. خۆ بەزل نواندن و مل کەچ نەکردن هەردووکیان دەگرێتەوە.

٤٢. ئەگەر ڕاستی دەرکەوت وڕوون بۆوە، هیچ ڕێگایەک بیانویەک نامێنێ بۆ دژایەتی کردن و ڕەت کردنەوە: لَآ إِكْرَاهَ فِي ٱلدِّينِ قَد تَّبَيَّنَ ٱلرُّشْدُ مِنَ ٱلْغَيِّ فَمَن يَكْفُرْ بِٱلطَّٰغُوتِ وَيُؤْمِنۢ بِٱللَّهِ فَقَدِ ٱسْتَمْسَكَ بِٱلْعُرْوَةِ ٱلْوُثْقَىٰ لَا ٱنفِصَامَ لَهَا وَٱللَّهُ سَمِيعٌ عَلِيمٌ (البقرة: ٢٥٦) واتە: بە هیچ جۆرێک زۆر لێ کردن لە دیندا نی یە (بۆ هاتنە ناو ئیسلام) چونکە بەڕاستی لە یەک جیابۆتەوە ڕێنموونی و شارەزایی لە گومڕایی و سەر لێ شێواویی (ئەم ئایەتە تایبەتە بە ئەوانەی ئایینی ئاسمانیان هەیە)، ئینجا هەر کەس لە ڕێ ی بێ بڕوایی بگەڕێتەوە(بێ باوەڕ بێ بە هەر پەرستراوێک جگەلە خوا) وە بڕوا بهێنێ بەخوا ئەوە بێگومان بە توندی دەستی گرتووە بە دەستەگییرەیەکی قایمی بەهێزی وا (کە ئیسلام، یان ئیمانەکەیەتی) کە پچڕان و بەربوونی بۆ نی یە وە خوا بیسەری زانایە.





کەواتە پێویســت ناکا کەســی بەرامبەر ناچار بکەی مادام ڕاســتی بۆ ڕوون بۆتەوەو بیانوی نەما.

٤٣. سزاو پاداشت لە قەدەر مەشەقەت و شوێنەوارەکەیەتی، دەبینی نوێژ مەشەقەتی زۆر چونکە دووبارە دەبێتەوە و لەسەرماو گەرماو کاتی سەرقاڵی و کەسابەت دووبارە دەبێتەوە، بۆ نمونە کوشتنی بەناحەق تاوانێکی زۆر گەورەیە بۆیە سزاکەشی گەورەیە: وَمَن يَقْتُلْ مُؤْمِنًا مُّتَعَمِّدًا فَجَزَآؤُهُۥ جَهَنَّمُ خَٰلِدًا فِيهَا وَغَضِبَ ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَلَعَنَهُۥ وَأَعَدَّ لَهُۥ عَذَابًا عَظِيمًا (النســاء: ٩٣) واتە: وە هەر کەســێك ئیمانداریێك بەدەس ئەنقەس بکوژێت ئەوە تۆڵەی ئەو کەســە دۆزەخە بە هەمیشــەیی تیایدا ئەبێت و خوا خەشــمی لێگرتووە و نەفرینی لێ کردووە و سزایەکی گەورەی بۆ ئامادە کردووە.

٤٤. زۆر جار خوای گەورە نەفی شــتێک دەکا لەبەر نەبوونی ســودەکەی با بوونیشی هەبێ، چونکە کەسودی نەبوو وەک نەبێ وایە: صُمٌّۢ بُكْمٌ عُمْىٌ فَهُمْ لَا يَرْجِعُونَ (البقرة: ١٨) واتە: کەڕ، لاڵ، کوێر، بۆیە ناگەڕێنەوە.

لەراستیدا نەکەڕن نە کوێرن، نە لاڵن، بەڵام سود لەو ئەندامانە نابینن بۆیە وەک نەبن وایە.

٤٥. ئەگەر مرۆڤی مسوڵمان نیەتی کارێکی باشی هێنا بۆشی تەواو نەکرێ خوای گەورە پاداشتی تەواوی بۆ دەنوسێ: وَمَن يُهَاجِرْ فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ يَجِدْ فِى ٱلْأَرْضِ مُرَٰغَمًا كَثِيرًا وَسَعَةً وَمَن يَخْرُجْ مِنۢ بَيْتِهِۦ مُهَاجِرًا إِلَى ٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦ ثُمَّ يُدْرِكْهُ ٱلْمَوْتُ فَقَدْ وَقَعَ أَجْرُهُۥ عَلَى ٱللَّهِ وَكَانَ ٱللَّهُ غَفُورًا رَّحِيمًا (النساء: ١٠٠) واتە: وە هەر کەسێك کۆچ بکات لە ڕێی خوادا دەســتی دەکەوێت لە زەوی دا جێگە و ڕێگەی زۆر(کە دوژمن پێی ناخۆشــە) وە فراوانی(لە رۆزی ژیاندا) وە هەر کەســێك لە ماڵی خۆی دەرچێت وە کۆچ بکات بۆ لای خوا و پێغەمبەرەکەی پاشــان مردن پێی





بگات ئەوە بێگومان پاداشـتی ئەو کەسـە کەوتۆتە سـەر خواوە خوا هەمیشـە لێبوردەی بە بەزەیی یە.

ئەو کەســـە لەماڵەکەی دەرچو بۆ کۆچ و جیهاد لە پێناوی خوا بەڵام لەڕێگا مرد خوای گەورە ئەجری تەواوی بۆ نوسیوە.

٤٦. ئەگەر مسـولْمانان نەیانتوانی هەموویان بەکارە گرنگ و پێویسـتەکان هەسـتن ئەوە بەهەندێکیان پێی هەسـتن، چونکە ناکرێ کاری گرنگ پشـت گوێ بخرێ، ئەوە کەپێی دەڵێن فەرزی کیفـایە: وَمَا كَانَ ٱلْمُؤْمِنُونَ لِيَنفِرُواْ كَآفَّةً فَلَوْلَا نَفَرَ مِن كُلِّ فِرْقَةٍ مِّنْهُمْ طَآئِفَةٌ لِّيَتَفَقَّهُواْ فِى ٱلدِّينِ وَلِيُنذِرُواْ قَوْمَهُمْ إِذَا رَجَعُوٓاْ إِلَيْهِمْ لَعَلَّهُمْ يَحْذَرُونَ (التوبة: ١٢٢) واتە: وە نەدەبوو باوەڕداران تێکڕا هەموو دەرچن و بڕۆن (بۆ جیهاد) دەی با بڕۆن لە هەموو کۆمەڵێکیان چەند کەسێك بۆ ئەوەی لە ئاینەکەیان تێ بگەن و شـارەزابن بۆ ئەوەی هۆزەکەیان (شـارەزا بکەن و بترسێنن کاتێ گەڕانەوە (لە جیهاد) بۆ لایان بۆ ئەوەی ئەوان (شـارەزا ببن) بێدار ببنەوە.

٤٧. قورئانی پیرۆز لە هەموو شتێک دا چاکترین و ڕاسترین و جوانترینمان نیشـاندەدا: إِنَّ هَـٰذَا ٱلْقُرْءَانَ يَهْدِى لِلَّتِى هِىَ أَقْوَمُ وَيُبَشِّرُ ٱلْمُؤْمِنِينَ ٱلَّذِينَ يَعْمَلُونَ ٱلصَّـٰلِحَـٰتِ أَنَّ لَهُمْ أَجْرًا كَبِيرًا (الإسراء: ٩) واتە: بەڕاسـتی ئەم قورئانە ڕێنموونی دەکات بۆ ڕێبازو بەرنامەیەك کە ڕاسترینە و موژدەش دەدات بەو باوەڕدارانەی کە کردەوە چاکەکان دەکەن کە بە ڕاستی پاداشتی گەورەیان بۆ هەیە.

٤٨. گرنگی دان بەکات بەگشتی و کاتە دیاریکراوەکان قورئان ئێمەی لەسەر هاندەدا، سوێند دەخوا بە ڕۆژ، شەو، عەسر، چێشتەنگاو، بەرەبەیان، وە باسی حەج و کاتەکانی ڕەمەزان...





٤٩. قورئان ڕێگا لە شتی ڕێگا پێدراو موباح دەگرێ مادام سەر بکێشێ بۆحەرام: يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا تَقُولُواْ رَٰعِنَا وَقُولُواْ ٱنظُرْنَا وَٱسْمَعُواْ وَلِلْكَٰفِرِينَ عَذَابٌ أَلِيمٌ (البقرة: ١٠٤) واتە: ئەی ئەوانەی کە بڕواتان هێناوە مەڵێن(راعنا)، وە بڵێن(انظرنا) واتە پەلەمان لێ مەکە و چاوەڕوانیمان لەسەر بکەو ببیستن وە بۆ بێ بڕوایان هەیە سزای سەخت. وشەی (راعنا) بۆ هەیە لە (رعایە) وە هاتبێ ماناکەی باشە بۆ هەیە لە (رعونەوە) هاتبێ مانەکەی خراپە یان دوعایە بە خراپە، یان جنێوە بەزمانی جولەکەکان بۆیە مسوڵمانان ڕێگایان لێگیرا کە ئەو وشەیە بەکار بێنن، دەبێ بڵێ (أنظرنا) کە مەجال نیە بە واتای خراپ بەکار بێ.

٥٠. گوفتارو ڕەفتارەکان دەکرێ ببنە بەڵگەی کەسایەتی ڕەوشت: وَعِبَادُ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلَّذِينَ يَمْشُونَ عَلَى ٱلْأَرْضِ هَوْنًا وَإِذَا خَاطَبَهُمُ ٱلْجَٰهِلُونَ قَالُواْ سَلَٰمًا (الفرقان: ٦٣) واتە: بەندە تایبەتییەکانی خوای میهرەبان کەسانێکن بە ویقارو نەرمی دەڕۆن بەسەر زەوی دا (بێ لووت بەرزی و کەشخە و فیزکردن) وە کاتێ نەزان و نەفامەکان (بە وتەی ناشرین) لەگەڵیان بدوێن وتەیەك دەڵێن پێیان گوناه نەبێت.

ڕۆیشتنیان بە ئارامی و لەسەر خۆی دەکرێ بەڵگەو کەسایەتی و ڕەوشت بەرزیان بێ.

٥١. لەکاتێک لە شتێک گومانمان بۆ پەیدا دەبێ، دەبێ بگەڕێینەوە سەر شتە بەردەوام و ئەساسەکە: لَّوْلَآ إِذْ سَمِعْتُمُوهُ ظَنَّ ٱلْمُؤْمِنُونَ وَٱلْمُؤْمِنَٰتُ بِأَنفُسِهِمْ خَيْرًا وَقَالُواْ هَٰذَآ إِفْكٌ مُّبِينٌ (النور: ١٢) دەبوا کاتێ ئەو بوهتانەتان بیست پیاوان و ئافرەتانی ئیماندار گومانی چاکیان بە خۆیان ببردایە وە بیان وتایە ئەمە بوهتانێکی ئاشکراو ڕوونە.





چونکە قاعیدە ئەوەیە گومانی باش بە مســـوڵمان بەرین چ جای دایکمان عائشە خێزانی گەورەترین مرۆڤ.

٥٢. کەسێک لەبەر خوا دەست بەرداری شتێک بێ خوای گەورە باشتر بۆی قەرەبوو دەکاتەوە، دایکی موسا کە موسای خستە ناو ئاو بەفەرمانی خوا خوای گەورە باشتر لەخۆی بۆی پاراست، یوسف کەسجنی هەلبژارد بەسەر زینادا خوای گەورە زیاتر گەورەو بەرێزی کرد، وەک دایکی مەریەم بەتەمای کوڕ بوو بەلام خوای گەورە باشتر لەکوڕی پێدا لەو مەقامەدا کە مەڕیەم بوو.

٥٣. قورئـان وشــەکانی کۆکەرەوی واتـای زۆرن (جوامع الکلم) وەک ئەو ئایەتانە، کەمانای زۆریان لە خۆ گرتوە و بنچینەن:

- ✓ مَّنْ عَمِلَ صَٰلِحًا فَلِنَفْسِهِۦ وَمَنْ أَسَآءَ فَعَلَيْهَا وَمَا رَبُّكَ بِظَلَّٰمٍ لِّلْعَبِيدِ (فصلت: ٤٦)
- ✓ هَلْ جَزَآءُ ٱلْإِحْسَٰنِ إِلَّا ٱلْإِحْسَٰنُ (الرحمن: ٦٠)
- ✓ وَلَا يَجْرِمَنَّكُمْ شَنَـَٔانُ قَوْمٍ أَن صَدُّوكُمْ عَنِ ٱلْمَسْجِدِ ٱلْحَرَامِ أَن تَعْتَدُوا۟ ( المائدة:٢)
- ✓ وَتَعَاوَنُوا۟ عَلَى ٱلْبِرِّ وَٱلتَّقْوَىٰ وَلَا تَعَاوَنُوا۟ عَلَى ٱلْإِثْمِ وَٱلْعُدْوَٰنِ وَٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ إِنَّ ٱللَّهَ شَدِيدُ ٱلْعِقَابِ (المائدة: ٢)
- ✓ إِنَّ ٱللَّهَ يَأْمُرُ بِٱلْعَدْلِ وَٱلْإِحْسَٰنِ وَإِيتَآئِ ذِى ٱلْقُرْبَىٰ وَيَنْهَىٰ عَنِ ٱلْفَحْشَآءِ وَٱلْمُنكَرِ وَٱلْبَغْىِ يَعِظُكُمْ لَعَلَّكُمْ تَذَكَّرُونَ (النحل: ٩٠)
- ✓ مَنْ عَمِلَ صَٰلِحًا مِّن ذَكَرٍ أَوْ أُنثَىٰ وَهُوَ مُؤْمِنٌ فَلَنُحْيِيَنَّهُۥ حَيَوٰةً طَيِّبَةً وَلَنَجْزِيَنَّهُمْ أَجْرَهُم بِأَحْسَنِ مَا كَانُوا۟ يَعْمَلُونَ (النحل: ٩٧)
- ✓ فَمَن يَعْمَلْ مِثْقَالَ ذَرَّةٍ خَيْرًا يَرَهُۥ (الزلزلة: ٧) وَمَن يَعْمَلْ مِثْقَالَ ذَرَّةٍ شَرًّا يَرَهُۥ (الزلزلة: ٨)
- ✓ وَمَا تُقَدِّمُوا۟ لِأَنفُسِكُم مِّنْ خَيْرٍ تَجِدُوهُ عِندَ ٱللَّهِ هُوَ خَيْرًا وَأَعْظَمَ أَجْرًا وَٱسْتَغْفِرُوا۟ ٱللَّهَ إِنَّ ٱللَّهَ غَفُورٌ رَّحِيمٌۢ (المزمل: ٢٠)
- ✓ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓا۟ إِن جَآءَكُمْ فَاسِقٌۢ بِنَبَإٍ فَتَبَيَّنُوٓا۟ أَن تُصِيبُوا۟ قَوْمًۢا بِجَهَٰلَةٍ فَتُصْبِحُوا۟ عَلَىٰ مَا فَعَلْتُمْ نَٰدِمِينَ (الحجرات: ٦)





- قُلْ يَٰعِبَادِ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱتَّقُواْ رَبَّكُمْ لِلَّذِينَ أَحْسَنُواْ فِي هَٰذِهِ ٱلدُّنْيَا حَسَنَةٌ وَأَرْضُ ٱللَّهِ وَٰسِعَةٌ إِنَّمَا يُوَفَّى ٱلصَّٰبِرُونَ أَجْرَهُم بِغَيْرِ حِسَابٍ (الزمر: ١٠)
- وَأَمْرُهُمْ شُورَىٰ بَيْنَهُمْ (الشورى: ٣٨)
- إِنَّ ٱللَّهَ لَا يَظْلِمُ ٱلنَّاسَ شَيْـًٔا وَلَٰكِنَّ ٱلنَّاسَ أَنفُسَهُمْ يَظْلِمُونَ (يونس: ٤٤)
- وَٱلصُّلْحُ خَيْرٌ .... (النساء: ١٢٨)
- إِنَّ ٱللَّهَ لَا يُصْلِحُ عَمَلَ ٱلْمُفْسِدِينَ (يونس: ٨١)
- وَٱللَّهُ لَا يُحِبُّ ٱلْمُفْسِدِينَ (المائدة: ٦٤)
- يَوْمَ لَا تَمْلِكُ نَفْسٌ لِّنَفْسٍ شَيْـًٔا وَٱلْأَمْرُ يَوْمَئِذٍ لِّلَّهِ (الانفطار: ١٩)
- فَلَا تَدْعُواْ مَعَ ٱللَّهِ أَحَدًا (الجن: ١٨)
- فَلَا تَجْعَلُواْ لِلَّهِ أَندَادًا وَأَنتُمْ تَعْلَمُونَ (البقرة: ٢٢)
- وَلَا تَنسَوُاْ ٱلْفَضْلَ بَيْنَكُمْ إِنَّ ٱللَّهَ بِمَا تَعْمَلُونَ بَصِيرٌ (البقرة: ٢٣٧)
- فَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ مَا ٱسْتَطَعْتُمْ ...... (التغابن: ١٦)
- وَلَا تَبْخَسُواْ ٱلنَّاسَ أَشْيَآءَهُمْ وَلَا تَعْثَوْاْ فِي ٱلْأَرْضِ مُفْسِدِينَ (الشعراء: ١٨٣)
- أَلَا لِلَّهِ ٱلدِّينُ ٱلْخَالِصُ.... (الزمر: ٣)
- قَالَ يَٰقَوْمِ أَرَءَيْتُمْ إِن كُنتُ عَلَىٰ بَيِّنَةٍ مِّن رَّبِّي وَرَزَقَنِي مِنْهُ رِزْقًا حَسَنًا وَمَآ أُرِيدُ أَنْ أُخَالِفَكُمْ إِلَىٰ مَآ أَنْهَىٰكُمْ عَنْهُ إِنْ أُرِيدُ إِلَّا ٱلْإِصْلَٰحَ مَا ٱسْتَطَعْتُ وَمَا تَوْفِيقِيٓ إِلَّا بِٱللَّهِ عَلَيْهِ تَوَكَّلْتُ وَإِلَيْهِ أُنِيبُ (هود: ٨٨)



تەوەری پێنجەم:

## نەسخ لە قورئانی پیرۆزدا

گومان لەوەدا نییە کە مشـــتوو مڕێکی زۆر لە ســـەر نەســـخی قورئاندا هەیە لەمڕۆ دا، هەر چەند بە ڕێژە ژمارەی ئەوانە زۆرترن  کە باس لە نەسخی قورئان دەکەن بەڵام لە ڕووی بەڵگەو لۆژیکەوە ڕای ئەوانە بە هێزترە کە دەڵێن قورئان نەسخ نەبۆتەوە، هەر چەند ئەم کتابە بۆ ئەوە دانەنراوە کە تایبەت بێ بە بابەتی نەسخ بەڵام ئاماژە بە چەند خاڵێکی گرنگ دەکەم:

١. نەســـخ بە واتای  لابردن و گواســـتنەوە و پوچکردنەوە دێ(الإزالة والنقل والإبطال) ئەمە لە ڕووی زمانەوانیەوە، وە لە ڕووی زاراوەی ئەهلی تەفســـیر بەمـانـای: لابردنی حوکمێـک دێ کە بە دەقێکی پێشـــتر ئیســـپات بووە بە حوکمێکی تر کە لە دەقێکی دواتردا هاتووە(رفع حكم شرعی عملی جزئی ثبت بالنص بحكم شـــرعی عملی جزئی  ثبت بالنص ورد علی خلافه)، بە پێی ئەم پێناسـەیە دەبێ حوکمەکەی پێشـتر کاری پێ نەکرێ و تەواو لە کار کەوتبێ و ئیلغا بوبێتەوە، ئێمە لەو پێناسـە تێدەگەین کە دەبێ چەند مەرجێک هەبێ بۆ ئیسپات بوونی نەسخ لەوانە:

مەرجی یەکەم: دەبێ هەردووکیان دەق بن، کە ئێمە باســـی قورئان دەکەین مەبەســت ئەوەیە دەبێ هەردوکیان دەقی قورئان بێ، یان ئەگەر ســونەتبێ بە دەقی سونەتێکی تر نەسخ بێتەوە، دەنا بانگەشەی نەسخی قورئان بە سونەت کارەساتە و پێچەوانەی دەلیلی نەقڵی و ئەقڵیە.

مەرجی دووەم: دەبێ هەردووکیـان لە ڕووی ســـەنەدەوە ســـەلمێنراو بن وئیسپات بووبن.



مەرجی سێ یەم: دەبێ هەردووکیان حوکمی شەرعی بن واتە بابەتی هەواڵ و غەیب و بیرو باوەرو ئەخلاق نەبن، چونکە هیچ حیکمەتێک نییە خوای گەورە ئەوانە نەسخ کاتەوە.

مەرجی چوارەم دەبێ هەردووکیان کردەیی بن نەوەک ئیعتقادی وەک نوێژ، ڕۆژو، مامەڵە...

مەرجی چوارەم: دەبێ هەردووکیان جزئی بن، چونکە حوکمە گشتیەکانی قورئان نەسخ نابنەوە وەک بابەتی عەدالەت، دژ بوونی ستەم، بەرژەوەندی گشتی خەڵک...

مەرجی پێنجەم: دەبێ ئەم دوو دەقە لە مانادا دژ بن و بەیەکەوە هەڵنەکەن، چونکە ئەگەر دژ بەیەک نەبن پێویست بە نەسخ نییە.

٢. زانایانی پێشین ئەم زاراوانەیان بە واتای نەسخ بەکار هێناوە بەڵام مەبەستیان پێ ئیلغا کردنەوە و لابردن نەبووە وەک:

**بیان المجمل :**

واتە شتێک بە کورتی لە شوێنێک هاتووە بەڵام دواتر لە شوێنێکی تر ڕوونکراوەتەوە وەک ئەو ئایەتەی کە دەفەرموێ: لِّلَّهِ مَا فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِي ٱلْأَرْضِ وَإِن تُبْدُواْ مَا فِيٓ أَنفُسِكُمْ أَوْ تُخْفُوهُ يُحَاسِبْكُم بِهِ ٱللَّهُ فَيَغْفِرُ لِمَن يَشَآءُ وَيُعَذِّبُ مَن يَشَآءُ وَٱللَّهُ عَلَىٰ كُلِّ شَيْءٖ قَدِيرٌ (البقرة: ٢٨٤) لەم ئایەتە وا دەر دەکەوێ کە مرۆڤ هەرچی بە دڵیدا بێ لێپێچینەوەی لەسەر دەکرێ بەڵام لە ئایەتەکەی دواتر و شوێنەکانی تریش ڕوونکراوەتەوە کە مرۆڤ لەسەر ئەوە حیسابی لە گەڵ دەکرێ کە لە دڵدا کردویەتییە بڕیارِ و چاوەڕوانی دەرفەت دەکا بۆ ئەنجامدانی، لَا يُكَلِّفُ ٱللَّهُ نَفْسًا إِلَّا وُسْعَهَا لَهَا مَا كَسَبَتْ وَعَلَيْهَا مَا ٱكْتَسَبَتْ رَبَّنَا لَا تُؤَاخِذْنَآ إِن نَّسِينَآ أَوْ أَخْطَأْنَا رَبَّنَا وَلَا تَحْمِلْ عَلَيْنَآ إِصْرًا كَمَا حَمَلْتَهُۥ عَلَى ٱلَّذِينَ مِن قَبْلِنَا رَبَّنَا وَلَا





تُحَمِّلْنَا مَا لَا طَاقَةَ لَنَا بِهِۦ وَٱعْفُ عَنَّا وَٱغْفِرْ لَنَا وَٱرْحَمْنَآ أَنتَ مَوْلَىٰنَا فَٱنصُرْنَا عَلَى ٱلْقَوْمِ ٱلْكَـٰفِرِينَ (البقرة: ﴿٢٨٦﴾) ئەم ئـایەتە لە هەمـان ســورەت ڕوونی دەکاتەوە کە ئەو شـتانەی لە توانای مرۆڤ بەدەرن مرۆڤ لەسـەری لێپێچانەوەی لە گەڵ ناکرێ و لەسەری سزا نادرێ، ئەمە هیچ پێویستی بە بانگەشەی نەسخ نیە، زۆر شت لە قورئاندا بە کورتی هاتووە بەڵام دواتر ڕوونکراوەتەوە.

**تخصیص العام :**

واتە تایبەتکردن، مەبەسـت ئەوەیە لە شـوێنێک حوکمێک بە گشـتی هاتووە وا دەزانی هەموو تـاکەکان دەگرێتەوە کە بۆ ئەو حوکمە گونجـاون بەڵام دواتر لە دەقێکی تردا بۆت ڕووندەبێتەوە کە مەبەستی هەموو تاکەکان و حاڵەتەکان نەبووە وەک ئەو ئـایەتەی کە دەفەرموێ: يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ لَا تَدْخُلُوا۟ بُيُوتًا غَيْرَ بُيُوتِكُمْ حَتَّىٰ تَسْتَأْنِسُوا۟ وَتُسَلِّمُوا۟ عَلَىٰٓ أَهْلِهَا ذَٰلِكُمْ خَيْرٌ لَّكُمْ لَعَلَّكُمْ تَذَكَّرُونَ (النور: ﴿٢٧﴾) ئەی ئەو کەســانەی بڕواتان هێناوە مەچنە هیچ ماڵێك جگە لە ماڵەکانی خۆتـان هەتا پرس دەکەن (بە خـاوەنەکانیـان) وە (دوای ئەوەی مۆڵەت دران) سەلام بکەن لە خاوەن ماڵەکە ئەوە چاکترە بۆتان بۆ ئەوەی پەند و ئامۆژگاری وەرگرن.

بەڵام لە ئایەتی دواتر باســی حاڵەتی ترمان بۆ دەکا کە بە بێ ئیزن دروســتە بچیە هەندێک شــوێن لێرەدا پێویســت ناکا پەنا بۆ نەســخ بەری بەڵکو ئەو حوکمە هەر مەقسود نەبووە کە دواتر باسی دەکا کە ئەم ئایەتەیە: لَّيْسَ عَلَيْكُمْ جُنَاحٌ أَن تَدْخُلُوا۟ بُيُوتًا غَيْرَ مَسْكُونَةٍ فِيهَا مَتَـٰعٌ لَّكُمْ وَٱللَّهُ يَعْلَمُ مَا تُبْدُونَ وَمَا تَكْتُمُونَ (النور: ﴿٢٩﴾)





هیچ گوناهێکتان لەسەر نی یە (گوناهبار نابن) کە بچنە ئەو ماڵانەی کەسی تیا نیشـــتەجێ نی یە و کەل و پەلی خۆتانی تیا بێت (وەك ئوتێل) وە خوا دەزانێ بەوەی ئاشکرای دەکەن و بەوەی دەیشارنەوە.

**تقییدالمطلق :**

دەبینی دەقێک لە شـــوێنێک بە ڕەهـایی هـاتووە بەڵام لە شـــوێنێکی تر بەسـتراوەتەوە بە حاڵەتێکەوە یان بە سـیفەتێکەوە خوێنەر وا دەزانێ نەسـخە یان زانایان پێ یان وتوە نەســـخ بەڵام مەبەســـتیان پێ تەقیید بووە نەوەک نەسخ وەک ئەو ئایەتەی کە دەفەرموێ: يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱتَّقُواْ ٱللَّهَ حَقَّ تُقَاتِهِۦ وَلَا تَمُوتُنَّ إِلَّا وَأَنتُم مُّسۡلِمُونَ (آل عمران: ١٠٢) ئەی ئەوانەی کە بڕواتان هێناوە بترسن لە خوا ترسانێک کە شیاوێتی وە مەمرن هەر بە موسوڵمانی نەبێ.

لێرەدا تەقوا بە ڕەهای هاتوە بەڵام لە شـوێنی تر بەسـتراوەتەوە بە توانای مرۆڤ وەک دەفەرموێ: فَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ مَا ٱسۡتَطَعۡتُمۡ وَٱسۡمَعُواْ وَأَطِيعُواْ وَأَنفِقُواْ خَيۡرٗا لِّأَنفُسِكُمۡۗ وَمَن يُوقَ شُحَّ نَفۡسِهِۦ فَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡمُفۡلِحُونَ (التغابن: ١٦)

کەوا بوو لەخوا بترسـن ئەوەندەی کە دەتوانن وە گوێڕایەڵ و ملکەچی بن وە ماڵ ببەخشـن کە بۆ خۆتان چاکترە وە ئەوەی پارێزراو بێ لە چرووکی نەفسی خۆی هەر ئەوانن سەرکەوتوو ڕزگار.

لێرەدا پێویسـت ناکا پەنا بۆ نەسخ ببردرێ، چونکە دەقی یەکەم هانمان دەدا تا ئەوپەر پارێزکاری بکەین .

بەڵام لە دەقی دووەمدا دەفەرموێ بە پێی توانا، هیچ دژایەتیەک لە نێوانیاندا نیە چونکە خوای گەورە خۆی دەزانێ کە ئەو تەقوایەیی شـــایەن بە زاتی خۆیەتی بە کەس ناکرێ، بەڵام دەبێ تا ئەوپەڕ هەوڵی خۆمان بدەین.



االتوقيت فى النص :

جاری وایە دەقێک لە شـــوێنێکدا هاتووە خۆی کاتداری کردووە، وە دواتر حوکمەکەی تر باس دەکا لە شـوێنێکی تر وەک ئەو ئایەتەی سـورەتی النسـاء کە دەفەرموێ: وَٱلَّٰتِي يَأۡتِينَ ٱلۡفَٰحِشَةَ مِن نِّسَآئِكُمۡ فَٱسۡتَشۡهِدُواْ عَلَيۡهِنَّ أَرۡبَعَةٗ مِّنكُمۡۖ فَإِن شَهِدُواْ فَأَمۡسِكُوهُنَّ فِي ٱلۡبُيُوتِ حَتَّىٰ يَتَوَفَّىٰهُنَّ ٱلۡمَوۡتُ أَوۡ يَجۡعَلَ ٱللَّهُ لَهُنَّ سَبِيلٗا (النساء: ١٥) ئەوانەی کە کاری زۆر پیس و ناشرین(زینا) دەکەن لە ئافرەتان(ی بڕوادار) تان ئەوە چوار شـایەت لە خۆتان لەسـەریان بگرن ئینجا ئەگەر شـایەتییان دا ئەوە ئەو(ژنە زیناکار) انە بەند بکەن لە ماڵەکانتاندا هەتا(فریشتەی) مەرگ گیانیان دەکێشـــێت یـان خوا ڕێگـایـەک (ی ڕزگـار بوون) یـان بۆ دائـەنێ ، ئـەم ڕێگـای ڕزگـارییە لە ســـورەتی نوردا هاتوە وەک خوای گەورە دەفەرموێ: ٱلزَّانِيَةُ وَٱلزَّانِي فَٱجۡلِدُواْ كُلَّ وَٰحِدٖ مِّنۡهُمَا مِاْئَةَ جَلۡدَةٖۖ وَلَا تَأۡخُذۡكُم بِهِمَا رَأۡفَةٞ فِي دِينِ ٱللَّهِ إِن كُنتُمۡ تُؤۡمِنُونَ بِٱللَّهِ وَٱلۡيَوۡمِ ٱلۡأٓخِرِۖ وَلۡيَشۡـــهَدۡ عَذَابَهُمَا طَآئِفَةٞ مِّنَ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ (النور: ٢) ژن و پیـاوی زیناکەر هەر یەکێکیان سـەد دار (شـەلاق) یان لێ بدەن وە بەزەیی هاتنەوەتان پێیاندا (ژن و پیاوی زیناکەر) نەتان گرێ لە (جێ بەجێ کردنی) فەرمانی خوا ئـەگـەر ئێوە بـاوەڕتـان هـەیـە بـە خواو بـەڕۆژی دوایی وە بـا ئـامـادەی بینینی سزادانی ئەو دووانە بن کۆمەڵێك لە باوەڕداران.

التدرج بالأحكام :

واتە ڕەچاوی کردنی حاڵی کۆمەڵگا لە حاڵێکەوە بۆ حاڵەتێکی تر، وەک ئەو ئایەتانەی باســی ســەبرو خۆڕاگری دەکەن لە بەرامبەر بێباوەڕان ، بەڵام دواتر فەرمان دەکا بە بڕواداران کە ستەم قەبوڵ نەکەن و ڕووبەڕووی ببنەوە، ئەمانە هیچ دژایەتیەکـان لە نێوانـدا نییە چونکە ئەویـان قونـاغێـک بووە، ئەوی تر قۆناغێکی تر بووە، وە دەکرێ هەردوو قۆناغەکە لە هەر ساتێکدا دووبارە ببنەوە، هەر بۆیە دەبینی بە داخەوە زۆرێک لە موفەسیرەکان هەموو ئەو ئایەتانەی کە



باســی  پشــتکردن، خۆڕاگری، لێبوردەیی ... دەکەن دەڵێن نەســخ بۆتەوە بە ئایەتی سەیف، بەڵام ئەمە ڕاست نیە و بێ مانایەو هیچ پاساوێکی شەرعی و ژێری نیە.

**التخفيف :**

سوک کردنی هەندێک لە حوکمەکان، کە هەندێک پێ یان وایە ئەمە نەسخە لە کاتێکدا نەسخ نیە، چونکە ئەگەر نەسخ بێ نابێ کار بە حوکمەکەی پێشتر بکەی لە کاتێکدا دەبینین وا نیيە، وەک ئەو چەند ئایەتانەی سورەتی (الانفال) يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّبِيُّ حَرِّضِ ٱلْمُؤْمِنِينَ عَلَى ٱلْقِتَالِ إِن يَكُن مِّنكُمْ عِشْرُونَ صَٰبِرُونَ يَغْلِبُوا۟ مِا۟ئَتَيْنِ وَإِن يَكُن مِّنكُم مِّا۟ئَةٌ يَغْلِبُوٓا۟ أَلْفًا مِّنَ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ بِأَنَّهُمْ قَوْمٌ لَّا يَفْقَهُونَ (الأنفال: ٦٥) ئەی پێغەمبەر(صــلى الله عليه وســلم) هانی بڕواداران بدە لەســەر جەنگ کردن(لەگەڵ دوژمناندا) ئەگەر لە ئێوەدا ببێ بیســت کەســی خۆڕاگر زاڵ دەبن بەسەر دووسەد کەس(ی بێ باوەڕ) دا وە ئەگەر سەد کەس لە ئێوە هەبێ زاڵ دەبن بەســەر هەزار کەس دا لە ئەوانەی بێ باوەڕن بەهۆی ئەوەی بەڕاســتی ئەوانە کۆمەڵێکن نافامن.

دواتر دەفەرموێ: ٱلْـَٰٔنَ خَفَّفَ ٱللَّهُ عَنكُمْ وَعَلِمَ أَنَّ فِيكُمْ ضَعْفًا فَإِن يَكُن مِّنكُم مِّا۟ئَةٌ صَابِرَةٌ يَغْلِبُوا۟ مِا۟ئَتَيْنِ وَإِن يَكُن مِّنكُمْ أَلْفٌ يَغْلِبُوٓا۟ أَلْفَيْنِ بِإِذْنِ ٱللَّهِ وَٱللَّهُ مَعَ ٱلصَّٰبِرِينَ (الأنفال: ٦٦) ئێستا خوا فەرمانەکەی سووك کرد لە لەسەرتان وەزانی کە لاوازیتان تێدایە جا ئەگەر لە ئێوەدا ببێ ســەد کەســی خۆڕاگر زاڵ دەبن بەسەر دووسەد کەس(ی بێ باوەڕ) دا وە ئەگەر هەزار کەس لە ئێوە هەبن زاڵ دەبن بەسەر دوو هەزار کەس دا بە فەرمانی خوا وە خوا لەگەڵ خۆڕاگراندایە.

ئەگەر ئایەتی پێشوو نەسخ بێ دروست نییە کاری پێبکەی بەڵام وانییە، ئایا حەرامە مسوڵمان بەرامبەر دە کافر شەڕبکاو مەیدان چۆڵنەکا؟!





**التعليل:**

واتا شـــتێک بەســـتراوەتەوە بە هۆکارێکەوە هەر کاتێک هۆکارەکە هەبوو حـوکـمەکە دەبـێ، وە ئەگەر هـۆکـارەکە نەبـوو حـوکـمەکە نـابـێ وەک ئەو فەرمودانەی پێغەمبەر علیه الصلاة والسلام کە لە سـەرەتادا نەهی کردووە لە ســەردانی قەبرســتان بەڵام دوایی ڕێگای داوە، یان نەهی لە ئافرەتان کردووە ســەردانی قەبران بکەن بەڵام لە دەقی تردا ڕێگای داون، یا خۆد نەهی کردووە لە داکردنی گۆشـتی قوربانی دواتر ڕێگای دا، بەوانە ناوترێ نەسـخ، چونکە ئەو نەهیانە هۆکاریان هەیە .

لەوەدا کە نەهی کراوە ســەردانی قەبران بکرێ چونکە خەڵـک لە زەمەنی بتپەرســتیەوە نزیک بوون، دواتر کە ڕێگا دراوە چونکە ئەو مەترسـیە لە سـەر هاوەڵان نەماوە.

ئەگەر ئافرەتان ڕێگری و نەفرینیان لێکراوە ســەردانی قەبران بکەن ئەوە لە بەر ئەوە بووە زیـادەڕەویـان کردوە و هـاوار و فیغـانیـانکردوە و مـافی مێردو مناڵیان بە زایا داوە، بەڵام کە ڕێگا دراوە هۆکار ئەوە بووە ئەو کەســانە هەمان ڕەفتار دووبارە ناکەنەوە.

ئێسـتاش هەر ئافرەتێ ئەو کارە بێ شـەرعیانە بکا لێی قەدەغەیە، بەڵام کەوا نەکا ڕێگا پێدراوە.

ئەوکاتە کە ڕێگا نەدراوە گۆشـــتی قوربانی هەڵبگیرێ چونکە کۆمەڵگا فەقیر بووە، کە دواتر ڕێگادراوە لە بەر ئەوە بووە هەژاران کەمتر بوون، ئەگەر ئێستاش هەژاری باڵ بکێشـــێ بەســـەر خەڵکدا دروســـت نییە گۆشـــت بشـــاریەوەو هەڵـیبـگـری، کەواتە بەو جـۆرە حـوکـمـانە نـاوتـرێ نەســـخ بەڵـکو ئەوانە بەســـتراونەتەوە بە هۆکـاری خۆیـانەوە ئەگەر هۆکـارەکـان هەبوون حوکمەکە دەگەڕێتەوە وەک زانایان فەرموویانە(الحکم یدور مع علته وجودا وعدما)





بۆیە گرنگە ئەم زاراوانە لە نەســخ جیا بکەینەوە بە واتای ئیلغاکردنەوەی حوحکمەکەی پێشتر، بەڵکو ئەمانە واتایەکانیانن وەک باسمانکرد.

3 .حیکمەت لە بوونی نەسخدا چیە :

بەداخەوە لە وەڵامی ئەو پرســیارەدا پاســاوی زۆر لاواز باســکراوە کە ناکرێ پشتیان پێ ببەسترێ، لە دیارترینی ئەو پاساوانە دوو شتە:

یەکەم: بۆ مەسڵەحەتی بەندەکانە، وەک ئەوەی کە لە باسی عەرەق و ڕیبادا گوتراوە وەک نمونە:

دەوترێ ئەگەر لەســەرەتا مەی قەدەغەکرابا ئەوە لەســەر هاوەڵان قورس دەکەوت، بۆیە خوای گەورە قۆناغ بە قۆناغ لەســەری حەرامکردن، وە مرۆڤ ســروشــتی وایە دەبێ پێ بە پێ لەگەڵی بڕۆی بۆ ئەوەی بڕیارو یاســاکان وەربگرێ و قەبوڵ بکا. وەک ئەم ئایەتە پیرۆزانە کە باســی عەرەق دەکەن بۆ نمونە :

وَمِن ثَمَرَٰتِ ٱلنَّخِيلِ وَٱلۡأَعۡنَٰبِ تَتَّخِذُونَ مِنۡهُ سَكَرٗا وَرِزۡقًا حَسَنًاۚ إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَأٓيَةٗ لِّقَوۡمٖ يَعۡقِلُونَ (النحل: ٦٧) وە لە بەرو بوومەکانی دار خورما و ڕەزەکانیش (خواردنەوەی) سەر خۆشکەری لێ دروست دەکەن وە ڕۆزی و بژێوی پاك و چاکیشی (لێ دروست دەکەن وەك مێوژ و دۆشاو) بەڕاستی لەوەدا نیشانە هەیە بۆ کەسانێك کە تێدەگەن.

يَسۡـَٔلُونَكَ عَنِ ٱلۡخَمۡرِ وَٱلۡمَيۡسِرِۖ قُلۡ فِيهِمَآ إِثۡمٞ كَبِيرٞ وَمَنَٰفِعُ لِلنَّاسِ وَإِثۡمُهُمَآ أَكۡبَرُ مِن نَّفۡعِهِمَاۗ وَيَسۡـَٔلُونَكَ مَاذَا يُنفِقُونَۖ قُلِ ٱلۡعَفۡوَۗ كَذَٰلِكَ يُبَيِّنُ ٱللَّهُ لَكُمُ ٱلۡأٓيَٰتِ لَعَلَّكُمۡ تَتَفَكَّرُونَ (البقرة: ٢١٩) پرســیارت لێ دەکەن دەربارەی عەرەق و قومار بڵێ: لەم دوانەدا گوناهی گەورەو چەند قازانجێک هەیە بۆ خەڵکی بەڵام گوناهەکەیان





گەورەترە لە قازانجەکەیان وە پرسـیارت لێ دەکەن چی ببەخشـن بڵێ: ئەوی لێتان زیادە، ئاوەها خودا بەڵگەکان ڕوون دەکاتەوە بۆتان تا بیربکەنەوە.

﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا تَقْرَبُواْ ٱلصَّلَوٰةَ وَأَنتُمْ سُكَٰرَىٰ حَتَّىٰ تَعْلَمُواْ مَا تَقُولُونَ وَلَا جُنُبًا إِلَّا عَابِرِي سَبِيلٍ حَتَّىٰ تَغْتَسِلُواْ وَإِن كُنتُم مَّرْضَىٰٓ أَوْ عَلَىٰ سَفَرٍ أَوْ جَآءَ أَحَدٌ مِّنكُم مِّنَ ٱلْغَآئِطِ أَوْ لَٰمَسْتُمُ ٱلنِّسَآءَ فَلَمْ تَجِدُواْ مَآءً فَتَيَمَّمُواْ صَعِيدًا طَيِّبًا فَٱمْسَحُواْ بِوُجُوهِكُمْ وَأَيْدِيكُمْ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ عَفُوًّا غَفُورًا﴾ (النساء: ٤٣) ئەی کەسـانێ کە بڕواتان هێناوە نزیکی نوێژ مەبنەوە کاتێك ئێوە سـەرخۆش بن هەتا بزانن چی دەڵێن وە هەروەها نزیکی(جێگای) نوێژ مەبنەوە لە کاتێکدا لەشـتان گرانە مەگەر تێپەڕبن (بە مزگەوت دا) هەتا خۆتان دەشۆن وە ئەگەر ئێوە نەخۆش بوون یان لەسەفەردا بوون یان کەسـێك لە ئێوە هاتەوە لە شـوێنی دەسـت بەئاو گەیاندنەوە یان جووت بوون لەگەڵ خێزانەکانتاندا(یا لەیەك کەوتن لەگەڵ ئافرەتانی نامەحرەمدا) ئینجا ئاوتان دەسـت نەکەوت ئەوە بە خۆڵێکی پاك تەیەموم بکەن جا بەو تۆزو خۆڵە ڕووخسار و دەستەکانتان تەیەموم بکەن بەڕاستی خوا هەمیشە سڕەرەوەی تاوانە و لێبووردەیە.

﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِنَّمَا ٱلْخَمْرُ وَٱلْمَيْسِرُ وَٱلْأَنصَابُ وَٱلْأَزْلَٰمُ رِجْسٌ مِّنْ عَمَلِ ٱلشَّيْطَٰنِ فَٱجْتَنِبُوهُ لَعَلَّكُمْ تُفْلِحُونَ﴾ (المائدة: ٩٠) ئەی ئەوانەی بڕواتان هێناوە بێگومان ئارەق و قومار و ئەو بەردانەی کە کراون بە بت و ئەو پارچە دارانەی( کە بەکارئەهێنرێن بۆ دیاری کردنی بەش و چارەنووس) ئەوانە پیسـن و لە کردەوەی شەیتانن کەواتە دوور کەونەوە لێ ی تا ڕزگاربن.

﴿إِنَّمَا يُرِيدُ ٱلشَّيْطَٰنُ أَن يُوقِعَ بَيْنَكُمُ ٱلْعَدَٰوَةَ وَٱلْبَغْضَآءَ فِي ٱلْخَمْرِ وَٱلْمَيْسِرِ وَيَصُدَّكُمْ عَن ذِكْرِ ٱللَّهِ وَعَنِ ٱلصَّلَوٰةِ فَهَلْ أَنتُم مُّنتَهُونَ﴾ (المائدة: ٩١) بێگومان شەیتان هەر ئەوەی ئەوێ کە دوژمنایەتی و کینە و ڕق بخاتە ناوتانەوە بەهۆی ئارەق و قومارەوە وە





بەرگریتان بکات لە یاد و باسی خوا و لە نوێژ کردن دەی ئایا ئێوە واز دەهێنن(لەو خراپان) ە.

ئایەتی یەکەم باس لەوە دەکا خەڵک لە بەرهەمی ترێ و خورما دوو شت دروست دەکەن یەکەم: شتێک کە مایەیی بێهۆشی و سەرخۆشە، دووەم شتێک کە مایەیی خۆشی و سودبەخشیە وەک دۆشاو و سرکە، باشە ئەوە بۆ نەسخ بێتەوە، خۆ هیچی تێدا نییە باسی حەلاڵ و حەڕامە، ئەمکارە ئێستاش هەر بەردەوامە خەڵک ئەو شتانە دروست دەکەن.

ئایەتی دووەم باسی ئەوە دەکا کە ئارەق قومار زیانیان پترە لە سودیان خۆ ئەم ڕاستیە نە گۆڕاوە بۆ نەسخ بێتەوە؟

ئایەتی سێ یەم باسی لەوە دەکا کە کە دەبێ مسوڵمانەکان لە کاتی نوێژدا سەر خۆش نەبن دیسان باسی حەلاڵ و حەرام لە ئارادا نییە.

لە دوو ئایەتەکەی سورەتی المائدە بە یەکجاری قەدەغەکرا، بۆیە هیچ تێگیرانێک لە ئارادا نییە هەتا پەنا بۆ نەسخ بەرین.

لە ڕاستیدا ئەو تەحلیل و پاساوە ئەگەر لێی ورد بیەوە هەر زۆریش مەترسیدارە نەوەک لاواز بۆ؟

چونکە ئەگەر خوای گەورە ڕەچاوی حاڵەتی هاوەڵانی کردبێ لە گەڵ بوونی وەحی و بوونی پێغەمبەری ئازیز، ئەی بۆ ڕەچاوی زروفی مرۆڤی ئێستا ناکا کە دەیان و سەدان هۆکاری گومڕابوونی لە سەر ڕێگادا وەستاوە؟! ئەدی چ دەکەی لە گەنجێک لە مرۆدا تا بینە قاقای لە مەی و تریاک و نێرگەلەو ... نقوم بووە؟ ئایا پێویستی بە خاترگرتن و ڕەچاو کردنی زروفی تایبەتی خۆی نییە؟

ئەدی چ دەکەی لە کەسێک تازە مسوڵمان بووە کە هەموو تاوانەکانی، یان زۆربەیانی تێدا هەن، ئایا نابێ پاساوی قەبوڵ بکرێ، بەس یەکێک پێم بڵێ





جیاوازی ئەم دوو کەسایەتییە چییە! ئەوەی وەحی بۆ دادەبەزێ و لە خزمەتی پێغەمبەرێکدایە بەلاَم ئەوی تر لە زەمانێکدا دەژی کە ئەمانەی نییە و خراپەش لەبەردەمیا ئاسانتر بووە، بۆ خاتری ئەویان دەگیرێ و زروفی ڕەچاو دەکرێ، بەلاَم ئەمیان پێویستی پێ نییە و حساب بۆ حاڵەت و زەمانی ناکرێ؟!

دووەم: دەڵێن ئەگەر نەڵێین نەســخ هەیە ئەوە مانای وایە دینەکانی تر هەرباقی ماون و بە ئیســلام نەســخ نە بونەوە ئەوەش پێچەوانەی قوڕئان و سونەت و واقع ە.

جارێ زۆر هەڵەیە بڵێی دینەکانی تر نەســخ بوونەوە، چونکە پێچەوانەی قوڕئانی پیرۆزە، قوڕئان هاتووە بۆ بە ڕاســت دانان و پشــتیوانی دینەکانی تر نەوەک نەســخ کردنەوە، ئەوە لە چەندین ئایەتدا ڕوونکراوەتەوە وەک دەفەرموێ: قُلْ مَن كَانَ عَدُوًّا لِّجِبْرِيلَ فَإِنَّهُۥ نَزَّلَهُۥ عَلَىٰ قَلْبِكَ بِإِذْنِ ٱللَّهِ مُصَــدِّقًا لِّمَا بَيْنَ يَدَيْهِ وَهُدًى وَبُشْرَىٰ لِلْمُؤْمِنِينَ (البقرة: ٩٧) ئەی موحەممەد(صلى الله عليه وسلم) بڵێ: هەر کەسێک دوژمنی جوبرەئیل بێت(ئەوە دوژمنی خوایە) چونکە ئەو بە فەرمانی خوا قورئانی هێناوەتە خوارەوە بۆ سەر دڵی تۆ بەپشتیوانی نامەکانی پێش خۆی وە بەڕێنموونیی کەرو مژدە دەر بۆ بڕواداران.

وە خوای گەورە دەفەرموێ: نَزَّلَ عَلَيْكَ ٱلْكِتَـٰبَ بِٱلْحَقِّ مُصَــدِّقًا لِّمَا بَيْنَ يَدَيْهِ وَأَنزَلَ ٱلتَّوْرَىٰةَ وَٱلْإِنجِيلَ (آل عمران: ٣)

ناردوویە تیە خوارەوە بۆت قورئان بەڕاســتی و دروســتی، بەڕاســت دانەری هەموو ئەو (کتێب) انە یە لەپێشــیدا بوون وە تەورات و ئینجیلی ناردە خوارەوە.

وە خوای گەورە دەفەرموێ: وَأَنزَلْنَآ إِلَيْكَ ٱلْكِتَـٰبَ بِٱلْحَقِّ مُصَــدِّقًا لِّمَا بَيْنَ يَدَيْهِ مِنَ ٱلْكِتَـٰبِ وَمُهَيْمِنًا عَلَيْهِ فَٱحْكُم بَيْنَهُم بِمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ وَلَا تَتَّبِعْ أَهْوَآءَهُمْ عَمَّا جَآءَكَ مِنَ





ٱلۡحَقِّ لِكُلّٖ جَعَلۡنَا مِنكُمۡ شِرۡعَةٗ وَمِنۡهَاجٗا وَلَوۡ شَآءَ ٱللَّهُ لَجَعَلَكُمۡ أُمَّةٗ وَٰحِدَةٗ وَلَٰكِن لِّيَبۡلُوَكُمۡ فِي مَآ ءَاتَىٰكُمۡۖ فَٱسۡتَبِقُواْ ٱلۡخَيۡرَٰتِۚ إِلَى ٱللَّهِ مَرۡجِعُكُمۡ جَمِيعٗا فَيُنَبِّئُكُم بِمَا كُنتُمۡ فِيهِ تَخۡتَلِفُونَ (المائدة: ٤٨) وە ئەم قورئانەمان ناردە خوارەوە بۆ تۆ بە حەق و ڕاستی و کتێبەکانی پێش خۆی بەڕاست دەزانی و پشتیوانیان لێ دەکات و چاودێریانە کەواتە حوکم و بڕیار بدە لە ناو نامەدارەکاندا بەوەی خوا ناردوویەتیە خوارەوە وە شوێن هەواو هەوەسی ئەوان مەکەوە لانەدەی لەو حوکم و بڕیارە هەق و ڕاستەی کە بۆت هاتووە دامان ناوە بۆ هەر ئوممەتێك لە ئێوە شەریعەت و ڕێگەیەکی ڕوون وە ئەگەر خوا بیویستایە ئێوەی ئەکرد بەیەك ئوممەت و کۆمەڵ بەڵام(نەی کردوون) بۆ ئەوەی تاقیتان بکاتەوە لەو شەریعەت و یاسایانەی کە پێ ی بەخشیوون کەواتە پێشبڕکێ بکەن بۆ ئەو شتانەی کە چاکن گەڕانەوەتان هەر بۆ لای خوایە بە گشتی ئینجا هەواڵتان پێ دەدا بەوەی کە لەجیهاندا جیاواز بوون تیایدا.

خوای گەورە نەیفەرموە بە دوو دینی وان مەکەوە، فەرمویەتی بە دووی ئارەزوی ئەوان مەکەوە.

وَأَنِ ٱحۡكُم بَيۡنَهُم بِمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ وَلَا تَتَّبِعۡ أَهۡوَآءَهُمۡ وَٱحۡذَرۡهُمۡ أَن يَفۡتِنُوكَ عَنۢ بَعۡضِ مَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ إِلَيۡكَۖ فَإِن تَوَلَّوۡاْ فَٱعۡلَمۡ أَنَّمَا يُرِيدُ ٱللَّهُ أَن يُصِيبَهُم بِبَعۡضِ ذُنُوبِهِمۡۗ وَإِنَّ كَثِيرٗا مِّنَ ٱلنَّاسِ لَفَٰسِقُونَ (المائدة: ٤٩) وە(فەرمانمان پێ کردی) کە حوکم بکە لە نێوانیاندا بەوەی کە خوا ناردوویەتیە خوارەوە و شوێن حەزو ئارەزوویان نەکەوی وە وریا بە لێیان لەوەی بت ترازێنن لە هەندێ لەوەی خوا ناردوویەتیە خوارەوە بۆت ئینجا ئەگەر ئەوانە ڕویان وەرگێڕاو سەرپێچیان کرد ئەوە بزانەو دڵنیابە خوا ئەیەوێ بەهۆی هێندێ لە تاوانەکانیانەوە سزایان بدات و تووشی زیانیان بکات بێگومان زۆر لە ئادەمی یەکان سەرکەشن و لە سنووری خوا دەرچوون.





وە خوای گەورە پێمان دەڵێ دینی پێغەمبەران یەکە: شَرَعَ لَكُم مِّنَ ٱلدِّينِ مَا وَصَّىٰ بِهِۦ نُوحًا وَٱلَّذِيٓ أَوْحَيْنَآ إِلَيْكَ وَمَا وَصَّيْنَا بِهِۦٓ إِبْرَٰهِيمَ وَمُوسَىٰ وَعِيسَىٰٓۖ أَنْ أَقِيمُواْ ٱلدِّينَ وَلَا تَتَفَرَّقُواْ فِيهِۚ كَبُرَ عَلَى ٱلْمُشْرِكِينَ مَا تَدْعُوهُمْ إِلَيْهِۚ ٱللَّهُ يَجْتَبِيٓ إِلَيْهِ مَن يَشَآءُ وَيَهْدِيٓ إِلَيْهِ مَن يُنِيبُ (الشــورى: ١٣) ئەو ئایینەی بۆ داناوون کە فەرمانی داوە بە نووح و ئەوەش نیگامان کردووە بۆ تۆو ئەوەش کە فەرمانمان داوە بە ئیبراهیم و مووسا و عیسا کە لەسەر ئەو ئایینە بن بە ڕێك و ڕاستی و جیاوازی تێدا مەکەن زۆر قورس و گرانە بە لای هاوبەش دانەرانەوە ئەوەی ئەوانی بۆ بانگ دەکەیت خوا هەر کەسی بوێ هەڵی دەبژێرێ بۆ (موسوڵمان بوون) لای خۆی وە کەسێك ڕێنموونیی دەکات بۆ لای خوا بگەڕێتەوە.

بەڵکو لەوەش زیاتر بەڵێن لە هەموو پێغەمبەران وەرگیراوە کە ئیمان بە یەکتر بێینن و پشتیوانی یەکتربن نەوەک پاڵ بە یەکتر وەنێن وەک دەفەرموێ: وَإِذْ أَخَذَ ٱللَّهُ مِيثَٰقَ ٱلنَّبِيِّـۧنَ لَمَآ ءَاتَيْتُكُم مِّن كِتَٰبٍ وَحِكْمَةٍ ثُمَّ جَآءَكُمْ رَسُولٌ مُّصَدِّقٌ لِّمَا مَعَكُمْ لَتُؤْمِنُنَّ بِهِۦ وَلَتَنصُرُنَّهُۥۚ قَالَ ءَأَقْرَرْتُمْ وَأَخَذْتُمْ عَلَىٰ ذَٰلِكُمْ إِصْرِيۖ قَالُوٓاْ أَقْرَرْنَاۚ قَالَ فَٱشْهَدُواْ وَأَنَا۠ مَعَكُم مِّنَ ٱلشَّٰهِدِينَ (آل عمران: ٨١) بهێنەوە یادیان کاتێک کە خوا پەیمانی وەرگرت لە پێغەمبەران کە هەرچیم دانێ لە نامەو حیکمەت (شەریعەت) لە پاشان پێغەمبەرێکتان بۆ هات بە بڕوا هێنەر بەو نامەی کەلە لاتانە دەبێ بڕوای پێ بهێنن وە یارمەتی بدەن خوا فەرمووی : ئایا دانتان نا بەم پەیمانەدا؟ وە لەسەر ئەوە پەیمانی منتان وەرگرت پێغەمبەران وتیان: بەڵێ دانمان پیا ناو پەیمانمان بەست خوا فەرمووی کەواتە ئێوە بەشاهید بن وە منیش لەگەڵ ئێوە یەکێکم لە شاهیدان.

بۆیە ئەم بانگەشەیە ڕاست نیە دینەکانی تر نەسخ بوبنەوە، بەڵکو دینەکانی تر شێوان و گۆڕانیان بەسەردا هاتوە نەوەک نەسخ بوونەوە.





٤. لەوانەیە یەکێک بڵێ ئەوەنیە خوای گەورە دەفەرموێ: وَمَن يَبْتَغِ غَيْرَ ٱلْإِسْلَٰمِ دِينًا فَلَن يُقْبَلَ مِنْهُ وَهُوَ فِى ٱلْءَاخِرَةِ مِنَ ٱلْخَٰسِرِينَ (آل عمران: ﴿٨٥﴾) هەر کەسێک دوای دینێک بکەوێت جگە دینی ئیسلام ئەوە لێ ی وەر ناگیرێ وە ئەو لە ڕۆژی دوایی دا لە زەرەرمەندانە.

وە دەفەرموێ: ٱلْيَوْمَ أَكْمَلْتُ لَكُمْ دِينَكُمْ وَأَتْمَمْتُ عَلَيْكُمْ نِعْمَتِى وَرَضِيتُ لَكُمُ ٱلْإِسْلَٰمَ دِينًا فَمَنِ ٱضْطُرَّ فِى مَخْمَصَةٍ غَيْرَ مُتَجَانِفٍ لِّإِثْمٍ فَإِنَّ ٱللَّهَ غَفُورٌ رَّحِيمٌ (المائدة: ﴿٣﴾)

کەواتە دین بەس دینی ئیسلامە ، بێجگە لە ئیسلام هیچ دینێکی تر قەبوڵ نیە، کەواتە دینەکانی غەیری ئیسلام نەسخ بونەوە.

وەڵامی ئەو پرسیارە بەو شێوەیەیە:

ئایا قوڕئان ئیسلامە یان نا؟

کەس گومانی لە ڕاستی قوڕئان نیە چونکە هەرکەس گومانی لەوە هەبێ مسوڵمان نیە.

ئایا قوڕئان پڕی نیە لە باسی شەریعەتەکانی پێشوو؟ بێگومان بەڵێ ، باسی ئادەم و نوح و ئیبراهیم و هودو سالح و شوعەیب و موساو عیساو داود و سولەیمان و زەکەریاو یەحیا... کراوە وە باسی دینەکە شیان کراوە، ئایا خوای گەورە دەربارەی وان چی فەرموە؟ ئایا فەرموویەتی نەسخ بونەوەو شوێنیان مەکەون یان فەرموویەتی:

- ✓ فَٱقْصُصِ ٱلْقَصَصَ لَعَلَّهُمْ يَتَفَكَّرُونَ (الأعراف: ﴿١٧٦﴾)
- ✓ لَقَدْ كَانَ فِى قَصَصِهِمْ عِبْرَةٌ لِّأُو۟لِى ٱلْأَلْبَٰبِ مَا كَانَ حَدِيثًا يُفْتَرَىٰ وَلَٰكِن تَصْدِيقَ ٱلَّذِى بَيْنَ يَدَيْهِ وَتَفْصِيلَ كُلِّ شَىْءٍ وَهُدًى وَرَحْمَةً لِّقَوْمٍ يُؤْمِنُونَ (يوسف: ﴿١١١﴾)





- ✓ ﴿وَكُلًّا نَّقُصُّ عَلَيْكَ مِنْ أَنۢبَآءِ ٱلرُّسُلِ مَا نُثَبِّتُ بِهِۦ فُؤَادَكَ وَجَآءَكَ فِى هَٰذِهِ ٱلْحَقُّ وَمَوْعِظَةٌ وَذِكْرَىٰ لِلْمُؤْمِنِينَ﴾ (هود: ١٢٠)
- ✓ ﴿أُو۟لَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ هَدَى ٱللَّهُ فَبِهُدَىٰهُمُ ٱقْتَدِهْ قُل لَّآ أَسْـَٔلُكُمْ عَلَيْهِ أَجْرًا إِنْ هُوَ إِلَّا ذِكْرَىٰ لِلْعَٰلَمِينَ﴾ (الأنعام: ٩٠)

ئێمە فەرمانمان پێکراوە بیر بکەینەوە لە بەسەر هاتی ڕابردوان، دەبێ پەندی لێوەربگرین، دەبێ ئیمان و ئیرادەمان بە وان بە هێز بکەین، دەبێ شوێن پێ یان هەڵبگرین و فەرمانەکانیان جێبەجێ بکەین ، لێرەدا بابەتەکە نەسخ نیە.

بەڵام ڕاستیەک هەیە دەبێ بیزانین ئەویش ئەوەیە ئێمە دڵنیانین لە نەشێوێندرانی پەیامەکانی ئەوان؟ وە بە دڵنایی گۆڕین و شێواندن بووە، بۆیە ئێمە دەبێ بە وریایی مامەڵە بکەین لە گەڵ دینەکانی تردا.

5 . (شرع من قبلنا شرع لنا مالم يخالف شرعنا) : شەریعەتەکانی پێش ئێمە شەریعەتی ئێمەشن مادام پێچەوانەی شەرعی ئێمە نەبێ، بۆچی پێچەوانە دەبێ چونکە شێوێندراون.

ئەوەی کە لە شەریعەتەکانی پێش ئێمەدا هاتوە لە گەڵ شەریعەتی ئیسلامدا سێ حاڵەتی هەیە:

- ✓ موافیقی شەریعەتی ئێمەیە، ئەوە بێ گومان و دوو دڵی وەری دەگرین.
- ✓ یان پێچەوانەو دژی شەریعەتی ئیسلامە ئەوە بێ دوودڵی وەری ناگرین.
- ✓ یان هیچیان نیە ئەوکات ڕەفزی ناکەین نەوەک ڕاست بێ، پشتیوانی ناکەین نەوەک ڕاست نەبێ ، ئەگەر لە بواری عەقائیدو ئەحکام نەبێ دەکرێ سودی لێوەربگیرێ وەک بابەتی ئامۆژگاری و بابەتی مێژوویی.





٦ . ئایەتی قورئان لە ڕووی وشەو واتاوە لە خواوەیەو موتەواترە و گومانی تێدا نیە ،کەواتە ئەوەی قورئان نەسخ دەکاتەوە دەبێ یەقین بێ و گومانی تێدا نەبێ، کەواتە سونەت ناتوانێ قورئان نەسخ کاتەوە.

7 .هیچ ئایەتێک لە قورئانی پیرۆزدا نیە یەکدەنگی هەبێ لەسەر نەسخ بونەوەی ئەگەر هەیە با کەسێک پێمان بڵێ.

تێگەیشتن لە ئایەتەکانی نەسخ واتە ئەو ئایەتانەی کە دەکرێ ببنە بەڵگە بۆ مەشروعیەتی نەسخ:

یەک: مَا نَنسَخْ مِنْ ءَايَةٍ أَوْ نُنسِهَا نَأْتِ بِخَيْرٍ مِّنْهَآ أَوْ مِثْلِهَآ أَلَمْ تَعْلَمْ أَنَّ ٱللَّهَ عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ قَدِيرٌ (البقرة: ١٠٦)

کۆمەڵێک ڕاڤە ڕاڤە بۆ ئەم ئایەتە کراوە :

مَا نَنسَخْ مِنْ ءَايَةٍ أَوْ نُنسِهَا نَأْتِ بِخَيْرٍ مِّنْهَآ أَوْ مِثْلِهَآ أَلَمْ تَعْلَمْ أَنَّ ٱللَّهَ عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ قَدِيرٌ (البقرة: ١٠٦) ئەگەر ئایەتێک (لە ئایەتەکانی قورئان) بسڕینەوە یان پشتگوێی بخەین یەکێکی تری باشتر لەو ، یان وەک ئەو دەهێنین ئایا نازانییت خوا بەسەر هەموو شتێکدا بەدەسەڵاتە.

مَا نَنسَخْ مِنْ ءَايَةٍ أَوْ نُنسِهَا نَأْتِ بِخَيْرٍ مِّنْهَآ أَوْ مِثْلِهَآ أَلَمْ تَعْلَمْ أَنَّ ٱللَّهَ عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ قَدِيرٌ (البقرة: ١٠٦) هەر ئایەتێک لە کار بخەین یان لە بیری ببەینەوە، ئایەتێکی لەو باشتر یان هەر وەک ئەوی ئەخەینە جێ. مەگەر نەتزانیوە خودا هەموو کارێکی پێ دەکرێ.

مَا نَنسَخْ مِنْ ءَايَةٍ أَوْ نُنسِهَا نَأْتِ بِخَيْرٍ مِّنْهَآ أَوْ مِثْلِهَآ أَلَمْ تَعْلَمْ أَنَّ ٱللَّهَ عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ قَدِيرٌ (البقرة: ١٠٦) هەر ئایەتێکبسڕینەوە، یان بیخەینە بارودۆخی فەرامۆشییەوە و





پشتگوێی بخەین، چاکتر لەو، یان وێنەی ئەو دەخەینە ڕوو، مەگەر نەتزانیوە کە خوا دەسەڵاتی بەسەر هەموو شتێکدا هەیە؟

مَا نَنسَخْ مِنْ ءَايَةٍ أَوْ نُنسِهَا نَأْتِ بِخَيْرٍ مِّنْهَآ أَوْ مِثْلِهَآ أَلَمْ تَعْلَمْ أَنَّ ٱللَّهَ عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ قَدِيرٌ (البقرة: ١٠٦) (مَا نَنْسَخْ مِنْ آيَةٍ) ئێمە هیچ ئایەتێك نەسخ ناکەین و حوکمەکەی بەتاڵ ناکەینەوە یان لای نابەین یان نایگۆڕین. وە نەسخ لە قورئانی پیرۆزدا هەیە چەندەها ئایەت هەیە لە قورئاندا نەسخ بۆتەوەو حوکمەکەی سڕاوەتەوە کە لە شوێنی خۆیدا ئاماژەیان پێ دەکەین (أَوْ نُنْسِهَا) یان لەبیرتانی نابەینەوە ئیتر بە خوێندنەوەی بێ یاخود بە حوکمەکەی بێ، یان دوایناخەین (نَأْتِ بِخَيْرٍ مِنْهَا أَوْ مِثْلِهَا) ئەوا باشتر لەو ئایەتە سەبارەت بە خەڵك حوکمێکی باشتریان بۆ دێنین لەبەر بەرژەوەندی خەڵکی وە سوکترو ئاسانترو گونجاوتر یاخود هاوشێوەی ئەوە (أَلَمْ تَعْلَمْ أَنَّ اللَّهَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ) ئایا نازانی کە خوای گەورە تواناو دەسەڵاتی بەسەر هەموو شتێکدا هەیە.

مَا نَنسَخْ مِنْ ءَايَةٍ أَوْ نُنسِهَا نَأْتِ بِخَيْرٍ مِّنْهَآ أَوْ مِثْلِهَآ أَلَمْ تَعْلَمْ أَنَّ ٱللَّهَ عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ قَدِيرٌ (البقرة: ١٠٦)

نەسخ و لە کارخستن لە قورئاندا: جوولەکە و هاوەڵدارەکان دەیانگوت: سەیری موحەممەد ناکەن چۆن ئەمڕۆ شتێك ئەڵێ و، سبەێنێ شتێکی تر؟! خوای گەورە لەوەڵامیاندا فەرمووی: {ماننسخ من آية أو ننسها} ئێمە لە قورئاندا هەر ئایەتێك بسڕینەوەو لەکاری بخەین، یان فەرامۆشی بکەین و لەبیری ببەینەوە {نأت بخير منها أو مثلها} ئێمە لەباتی ئەوە، ئایەتێکی چاکتر و ئاسانتر یان هەر وەکو ئەو دەخەینە جێی، تا لە پاشە ڕۆژدا ببێ بەمایەی پاداشتی گەورە تر و زیاتر، (تەبەریی) بۆ لەکارخستنی ئایەتەکان وگۆرینیان، چەند نموونەیەك دێنێتەوە:





یەکەم: گۆڕینی قورس بۆ ئاسان، وەك لابردن و سڕینەوەی شەونوێژ لەسەر موسڵمانان.

دووەم: گۆڕینی ئاسان بۆ قورس، وەك گۆڕینی چەند رۆژێ ڕۆژوو کە لەسەرەتاوە هەبوو بۆ ڕۆژووی مانگێکی رەبەق، ئەمە هەرچەندە قورسترە، بەڵام لەرووی پاداشتەوە گەورەتر و باشترە.

سێیەم: گۆڕین و سڕینەوەی بڕیارێك بۆ بڕیارێکی تر وەکو خۆی، وەك گۆڕینی رووگە لە (بيت المقدس)ـەوە بۆ(کەعبە). خوای گەورە سەیری بەرژەوەندی خەڵکی خۆی دەکا، چاك دەزانێت کە ئەمڕۆ بڕیارێك زۆر لەبارو گونجاوە، بەڵام بۆسبەینێ نەگونجاوە، ئەوسا ئەویش بە فەزڵی خۆی ئەیسڕێتەوە، چونکە: {ألم تعلم أن الله على كل شيء قدير} مەگەر نەتزانیوە کە خوای گەورە بەسەر هەموو شتێکدا بەتواناو دەسەڵاتدارەو هەرچیش بکات ئەیکات، ئەمڕۆ بڕیارێکە، بۆ سبەینێ بریارێکی ترە.

مَا نَنسَخْ مِنْ ءَايَةٍ أَوْ نُنسِهَا نَأْتِ بِخَيْرٍ مِّنْهَآ أَوْ مِثْلِهَآ أَلَمْ تَعْلَمْ أَنَّ ٱللَّهَ عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ قَدِيرٌ

(البقرة: ١٠٦) ئەم ئایەتەکێ ناگوهۆڕین یان ژ سەر دل وهزرا خەلکی نابەین حەتا یەکا ژ وێ ب مفاتر یان یەکا وەکی وێ د بارلێکرن وخێرێ دا بۆ هەوە نەئینین، وهەر یەکێ حکمەتەك تێدا هەیە، ئەرێ ما تە وئوممەتا تە نەزانییە هندی خودێیە یێ خودان شیانە وتشتەك وی بێزار ناکەت.

زۆربەی ڕاڤەکارانی قورئـان چ کوردو چ عەرەب ئەو ئـایەتەیـان بە مـانـای نەسخی ئایەت تەفسیر کردوە، وە مەبەستیشیان ئایەتی قورئانە، بەڵام ئەگەر بە پێی سـیاق و بەپێی وشـەی ئایەت و بە پێی واقعی قورئانیش بێ ئەوە بە مانای نەسخی ئایەت نایا.

یەکەم: بە پێی سـیاق و بە پێی پێش و ئایەتەکانی دواتر بێ گونجاو نیە بۆ نەسـخی ئایەتی قورئان چونکە ئایەتەکەی پێشـترو دواتر باسـی جولەکەو





هاوبەش پەرستەکان دەکا  وە نزیکەی تا ئایەتی ١٤١ باسەکە هەمووی  لەسەر جولەکەیە ئەوان ئینکاریان دەکرد کە دینێکی ترو پێغەمبەرێکی تر بێ، ئەوان دانیان بە عیسا ش دانەدەنا وەک پێغەمبەر لە کاتێکدا لە نەوەکانی ئیسرائیل بوو، جا چۆن دان دەنێن بە قورئان و پێغەمبەری ئیسلام !؟ ئەمە دوورە.

مَّا يَوَدُّ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ مِنْ أَهْلِ ٱلْكِتَـٰبِ وَلَا ٱلْمُشْرِكِينَ أَن يُنَزَّلَ عَلَيْكُم مِّنْ خَيْرٍ مِّن رَّبِّكُمْ وَٱللَّهُ يَخْتَصُّ بِرَحْمَتِهِۦ مَن يَشَآءُ وَٱللَّهُ ذُو ٱلْفَضْلِ ٱلْعَظِيمِ (البقرة: ١٠٥) حەزناکەن ئەوانەی کەبێ بڕوان لە خاوەن نامە و هاوبەش پەیداکەرەکان کە هیچ شتێکی باشتان لەخواوە بۆ بنێردرێتە خوارەوە بەڵام خواش بەخششی خۆی بۆ کەسێک کەبیەوێ تەرخان دەکات و خوا خاوەنی چاکەی گەورەیە .

کەواتە ئەگەر خوای گەورە بیەوێ شەریعەتێک یان موعجیزەیەک  لابەرێ و یان لە بیری خەڵکی باتەوەو فەرامۆشی بکا  دەتوانێ لە جێی ئەو موعجیزەو شەریعەتێک بۆ کەسێکی تر بنێرێ

ئەگەر تەماشای ئایەتەکانی دواتریش  و کۆتایی هەمان ئایەتیش بکەین بکەین بۆمان دەردەکەوێ بابەتەکە پەیوەستە بە موعجیزەو شەریعەتی یەهودەوە نەوەک ئایەتی قورئان

( أن الله على كل شئ قدير) زیاتر گونجاوە لە گەڵ موعجیزە نەوەک ئایەت ، ئەگەر باسی ئایەت با دەیفەرموو (عليم حكيم) چونکە ئەگەر سەرنجی قورئانی پیرۆز بدەی لەگەڵ باسی ئەحکام باسی علم و حیکمەت دە کا مەگەر بۆ هەرەشە وشەی تری بە کار هێنابێ.

أَلَمْ تَعْلَمْ أَنَّ ٱللَّهَ لَهُۥ مُلْكُ ٱلسَّمَـٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ وَمَا لَكُم مِّن دُونِ ٱللَّهِ مِن وَلِيٍّ وَلَا نَصِيرٍ (البقرة: ١٠٧)





أَمْ تُرِيدُونَ أَن تَسْـَٔلُواْ رَسُولَكُمْ كَمَا سُئِلَ مُوسَىٰ مِن قَبْلُ وَمَن يَتَبَدَّلِ ٱلْكُفْرَ بِٱلْإِيمَٰنِ فَقَدْ ضَلَّ سَوَآءَ ٱلسَّبِيلِ (البقرة: ١٠٨)

وَدَّ كَثِيرٌ مِّنْ أَهْلِ ٱلْكِتَٰبِ لَوْ يَرُدُّونَكُم مِّنۢ بَعْدِ إِيمَٰنِكُمْ كُفَّارًا حَسَدًا مِّنْ عِندِ أَنفُسِهِم مِّنۢ بَعْدِ مَا تَبَيَّنَ لَهُمُ ٱلْحَقُّ فَٱعْفُواْ وَٱصْفَحُواْ حَتَّىٰ يَأْتِيَ ٱللَّهُ بِأَمْرِهِۦٓ إِنَّ ٱللَّهَ عَلَىٰ كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ (البقرة: ١٠٩)

ئەو ئایەتانە زۆر بە ڕوونی دیارن کە باسی جولەکەیە و باسی موسایە، وە موسا سەلامی خوای لەسەر بێ موعجیزەی زۆری بووە، عیساش سەلامی خوای لەسەر بێ هەروابووە بەڵام جولەکە دان نانێن بە عیسا، وە ئەوانەش لە مەدینە بوون جولەکە بوون نەوەک مەسیحی، وە ئەوانەی دژایەتی پێغەمبەریان کرد دیسان جولەکە بوون نەوەک گاور.

وە ئەگەر تەماشای لایەنی نەحوی بکەین وشەی (ما) بۆ شرط بەڵام تحقق الوقوع نیە بە پێچەوانەی (إذا) وەک سعد الدینی تەفتازانی دەڵێ: سکاڵا بۆلای خوایە لە دەست ڕۆژگا کاتێک خراپە دەکا (إذا أساء) لەسەر خراپەکەی بەردەوامە، بەڵام ئەگەر چاکەیەکی کرد (وإن أحسن) یەکسەر پەشیمان دەبێتەوە.

وە مەرج نیە هەرکات شەرت هەبوو وەڵامی شەرتەکە هەبێ ، بۆیە ناکرێ ئەو ئایەتە بکرێ بە بەڵگە وەک فەخری ڕازی و زومەخشەری و زوریتریش وتویانە.

وشەی ئایەت کە لێرەداو لە زۆربەی قوڕئاندا بەکار هاتووە ئەگەر بەتاک هاتبێ واتە بە (آية) بە زۆری بە مانای غەیری ئایەتی قوڕئان هاتووە ئەگەر خشتەیەک بکەین بۆ مانای (آية) بە تاک ئەم ڕاستیەمان بۆ ڕوون دەبێتەوە هەر لەسەر سورەتی بەقەرە نە هاتووە (آية) بە واتای ئایەتی قوڕئان .





دووەم ئایەت: وَإِذَا بَدَّلْنَآ ءَايَةً مَّكَانَ ءَايَةٍ وَٱللَّهُ أَعْلَمُ بِمَا يُنَزِّلُ قَالُوٓاْ إِنَّمَآ أَنتَ مُفْتَرٍۭ ۚ بَلْ أَكْثَرُهُمْ لَا يَعْلَمُونَ ﴿١٠١﴾ نحل

لەسەر ئەو ئایەت چەند ڕوونکردنەوەیەک:

١. ئایەتەکە بۆ خۆی مەکی یە، ئایا ئایەتی مەکی کە باسی بیرو باوەرو ئەخلاق و سەر بوردەی ئومەتانە پێویست بە نەسخ دەکا؟!

٢. ئەگەر مەبەستی نەسخ با دەیفەرموو (إذا بدلنا آية بآية ) نەوەک (مكان آية).

٣. وە ئەگەر یش مەبەست پێ ئایەت بێ ئەوە لە گەڵ شەریعەتەکانی پێشوتر گونجاوترە نەوەک ئایەتی قوڕئان.

**سێ یەم باسی( محو)**

يَمْحُواْ ٱللَّهُ مَا يَشَآءُ وَيُثْبِتُ وَعِندَهُۥٓ أُمُّ ٱلْكِتَٰبِ (الرعد: ﴿٣٩﴾) تەفسیری ڕامان ئەوای مانا لێک داوەتەوە :

يَمْحُواْ ٱللَّهُ مَا يَشَآءُ وَيُثْبِتُ وَعِندَهُۥٓ أُمُّ ٱلْكِتَٰبِ (الرعد: ﴿٣٩﴾)

لەناودان و هێڵانەوە بەدەس خوایە: {يمحو الله ما يشاء} هەرچی لەو بڕیارە کاتیانەیە کەخوا پێشتر بۆپێغەمبەرانی ناردووە، هەرکامێکیانی ویستبێ لای بدا، ئەوا لایداوەو سڕییویەتەوە {ويثبت} و هەرشتێکیشی ویستبێ بیهێڵێتەوە، ئەوا بۆکاتی دیاریکراوی خۆی هێشتوویەتەوەو نەیگۆڕیوە (ئیبن عەبباس) و (موجاهید) دەڵێن: بێجگە لەژیان و مردن، خۆش بەختی و بەدبەختی ئیتر هەر شتێکی تر کەخۆی حەزبکا دەیسڕێتەوە، بەڵام ئەوجۆرە شتانە قەڵەمی ئەزەلی بەسەریاندا تێپەڕییوەو ناسڕێنەوە {و عنده أم الكتاب} وە دایك و سەرچاوەی هەموو کتێبە ئاسمانیەکان و (لوح المحفوظ) لای





خوای گەورەیە، کەوابوو هیچ کەسـێك بۆی نییە دەسـکاری هیچ بڕیارو حوکمێکی خوا بکاو شتێکی تر بخاتە شوێنی.

کەواتە بابەتە باسی ئایەتی قورئان نیە بەڵکو لە وە فراوانترە وەک:

- ✓ لابردنی پێغەمبەرێک و هێنانی یەکی تر.
- ✓ هێنانی شەریعەتێک و لابردنی یەکێکی تر.
- ✓ مراندنی کەسێک و زیندو کردنەوەی کەسێکی تر.
- ✓ بڕینی ڕۆزی کەسێکی ترو پێدانی ڕۆزی بە کەسێکی تر.
- ✓ لابردنی ئەو زانیاریانەی لای فریشـتەکانەو گۆرینی بە زانیاریەکی تر بەڵام لە لەوحی مەحفوز نـاگۆڕێ هەر وەک خۆیەتی،کەواتە تەفسـیرکردنی (مەحو، إثبات) بە مانای نەسخی ئایەت هیچ پاساوێکی نیە.

ئایا هیچ ئایەتێکمان هەیە کاری پێنەکرێ و نەسخ بوبێتەوە؟

زانایان لەسەر یەک ئایەت یەکدەنگ نین کە بڵێن ئەو ئایەتە کاری پێناکرێ.

ئەوانەی باسی نەسخ دەکەن زۆر زیادە ڕەویان کردوە لە ژمارەی ئایەتە نەسخ کراوەکان لای هەندێکیان لە دوو سەد ئایەت تێدەپەرێ.

حوکمی ئایەتەکانی خوا لە خواوە هاتون و جێگای دڵنیایین ئەو یەقینە بە یەقین نەبێ لاناچێ، وەک وتیشمان لەسەر یەک ئایەت زانایان یەک دەنگ نین، بۆیە بڕیارێکی قورسە بڵێین ئەو ئایەتە خواییە هیچ کاری پێناکرێ لە کاتێکدا وانیە.

ئەگەر بەکردەیی بچینە خزمەتی ئایەتەکان دەبینین کە ئایەتە بەناو نەسخ کراوەکان ماناو مەبەستی زۆر ڕوونیان هەیەو پێویست بە پەنابردنە بەر نەسخ ناکا وەک ئەو ئایەتانە:

١. وَلِلَّهِ ٱلۡمَشۡرِقُ وَٱلۡمَغۡرِبُ فَأَيۡنَمَا تُوَلُّواْ فَثَمَّ وَجۡهُ ٱللَّهِ إِنَّ ٱللَّهَ وَٰسِعٌ عَلِيمٌ (البقرة: ١١٥)





ڕۆژهەڵات وڕۆژ ئاوا هەر بۆخوایە کەواتە ڕووبکەنە هەر لایەک(لە نوێژی سوننەتدا) ئەوە ڕووگەی خوا لەوێیە بێگومان خوا(بەزەیی و میهرەبانی) فراوانەو زانایە.

ئایا ئەو ئایەتە نەسخ بۆتەوە؟ واتە ماناکەی ئەوەیە کە نەتوانین کاری پێ بکەین بۆمان نەبێ کاری پێبکەین؟

- ✓ ئایەتەکەی پێشتر باسی ئەوانە دەکا کە مەنعی مسوڵمانان دەکەن لە قیبلە، خوای گەورەش دەفەرموێ ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوا هی خوایە ڕوو لەهەر جێگایەک بکەن خوا لەوێیە، واتە پەیوەندی ئێوە بە خوا نەبەستراوەتەوە بە شوێنێکی تایبەت دەتوانن هەر کات ڕوو لە خوای گەورە بکەن.
- ✓ باشە ئایەتە دەفەرموێ: (ولله المشرق والمغرب) باشە چۆن دەکرێ ئەوە نەسخ بێتەوە؟!
- ✓ ناکرێ بەشێکی ئایەت نەسخ بێتەوەو بەشێکی نەسخ نە بێتەوە، باشە بەکام ئایەتە نەسخ بۆتەوە ؟ ڕوون نیە چەندین بۆچون هەیە.
- ✓ بە پێی هۆکاری دابەزینەکان بێ دەکرێ ئەمە بۆ نوێژی سونەت بێ.
- ✓ دەکرێ بۆ ئەوکاتە بێ قیبلە بزر دەبێ، بۆیە هیچ پێویستیەک نیە بۆ پەنا بردن بۆ نەسخ.

٢. كُتِبَ عَلَيْكُمْ إِذَا حَضَرَ أَحَدَكُمُ ٱلْمَوْتُ إِن تَرَكَ خَيْرًا ٱلْوَصِيَّةُ لِلْوَٰلِدَيْنِ وَٱلْأَقْرَبِينَ بِٱلْمَعْرُوفِ حَقًّا عَلَى ٱلْمُتَّقِينَ (البقرة: ١٨٠) پێویست کراوە لەسەرتان کاتێک یەکێکتان لەسەرەمەرگدا بوو ئەگەر ماڵی لەپاش بەجێما وەسێت کردن بەباشی بۆ دایک و باوک وخزمان(ێک کە کە لە پوریان بەرنەکەوێ) بەجوانی وڕێکو پێکی ؟ پێویست کراوە لەسەر پارێزکاران .





دەڵێن زانایان یەکدەنگن کە وەسیەت واجب نیە، وە باوک و دایک میرات دەبەن نابێ وەسیەتیان بۆ بکرێ، کەواتە ئەو ئایەتە نەسخ بۆتەوە، یان بە ئایەتەکانی میرات، یان بە بەفەرمودەی پێغەمبەر کە دەفەرموێ : اللَّهَ قَدْ أَعْطَى كُلَّ ذِي حَقٍّ حَقَّهُ، فَلَا وَصِيَّةَ لِوَارِثٍ ".رواه ابوداود،٢٨٧٠حكم الحديث: حسن صحيح

وەڵام :

- ❖ جارێ ڕوون نیە ئەو ئایەتە بە چی نەسخ بۆتەوە ئایا بە ئایەتەکانی میرات یان بە فەرمودەکە.
- ❖ ئەگەر بە ئایەتەکان بێ مەرجە بزانین کامەیان پێش کامەیان دابەزیوە دیارە کە نازانرێ و دڵنیا نین، وە ناتوانین دەستبەرداری ئایەتی خوا بین بە گومان.
- ❖ ئەگەر بە فەرمودەکە بێ ناگونجێ چونکە قوڕئان بە فەرمودە نەسخ نابێتەوە، چونکە فەرمودە نە وەک قوڕئانە نە باشترە.
- ❖ وە فەرمودەکە ئاحادە دیسان ناکرێ دەقی قوڕئان بە سونەتی ئاحاد نەسخ کەینەوە.
- ❖ لە پاشان نازانین فەرمودەکە ئایا پێش ئایەتەکە وتراوە یان دوای ئایەتەکە.
- ❖ دەکرێ ئەم وەسیەتە بۆ ئەو دایک و بابانە بێ کە میرات نابەن بە هۆی کوشتن، یان جیاوازی دین یان بەندایەتی.
- ❖ وە دەکرێ بۆ ئەو دایک و باب و خزمانە بن کە لاوازو هەژارن، وە میراتەکەش ئەوەندە زۆر نەبێ.
- ❖ وە دەکرێ ئەم ئایەتە تخصیص بێ بۆ ئایەتەکانی میرات و وەسیەت کە لە سورەتی( النساء) دا هاتوە.
- ❖ وە ئێمە تەنیا فەرمودەمان هەیە کە مەنعی باوک ودایک و خاوەن میراتەکان دەکا لە وەسیەت بەڵام قوڕئان ئیسپاتی دەکا، ئایا کامەیان ئەولاترن بە کارپێکردن؟!





- ❖ وە ناشکرێ بە ئیدعای ئیجماع ئەو ئایەتە نەسخ کەینەوە چونکە کۆدەنگی هەر بۆ خۆی بە پێی پێناسەکە هەر وجودی نیە چ جای ببێتە ناسخ.
- ❖ وە زانایانی زۆر لە گەڵ ئەوەدا نین کە ئەم ئایەتە نەسخ بێ، وە چەندین لێکدانەوەی تریش دەکرێ بۆ ئایەتەکە بکرێ بۆیە نابێ پەنا بۆ نسخ بەرین، چونکە نەسخ ئیلغا کردنەوەی حوکمی خوایە  کە ئەمە بە بێ بەڵگەی یەقینی نابێ.

٣. وَعَلَى ٱلَّذِينَ يُطِيقُونَهُۥ فِدْيَةٌ طَعَامُ مِسْكِينٍ فَمَن تَطَوَّعَ خَيْرًا فَهُوَ خَيْرٌ لَّهُۥ وَأَن تَصُومُواْ خَيْرٌ لَّكُمْ إِن كُنتُمْ تَعْلَمُونَ (البقرة: ١٨٤)

دەوترێ ئەو ئایەتە نەسخ بۆتەوە بە ئایەتەکەی دواتر، ئەو ئایەتە دەفەرموێ لە سەر ئەو کەسانەی کە دەتوانن بە ڕۆژو بن بە زەحمەت با فیدیە بدەن خواردن بە هەژاران ، وە کەسێک زیاتر بدا باشترە ، وە ئەگەر بە ڕۆژوو بن بۆ ئێوە باشترە. فَمَن شَهِدَ مِنكُمُ ٱلشَّهْرَ فَلْيَصُمْهُ وَمَن كَانَ مَرِيضًا أَوْ عَلَىٰ سَفَرٍ فَعِدَّةٌ مِّنْ أَيَّامٍ أُخَرَ يُرِيدُ ٱللَّهُ بِكُمُ ٱلْيُسْرَ وَلَا يُرِيدُ بِكُمُ ٱلْعُسْرَ وَلِتُكْمِلُواْ ٱلْعِدَّةَ وَلِتُكَبِّرُواْ ٱللَّهَ عَلَىٰ مَا هَدَىٰكُمْ وَلَعَلَّكُمْ تَشْكُرُونَ (البقرة: ١٨٥)

ئەو ئایەتە باس لە وە دەکا هەرکەسێک لە  مانگی  ڕەمەزاندا ئامادە بوو دەبێ بە ڕۆژوو بێ، دەوترێ بەم ئایەتە ئایەتەکەی تر نەسخ بۆتەوە کە مرۆڤ ئازاد دەکا لە نێوان بە ڕۆژو بوون و فیدیە داندا، لە ڕاستیدا ئەم بۆچونە هەڵەیە بۆچی

یەکەم: ئایەتی قورئانی پیرۆز هەتا بکرێ دەبێ لە ئیلغا کردنەوە بپارێزرێ.

دووەم: ئیبن عەباس دەفەرموێ ئەم ئایەتە نەسخ نیە بەڵکو لە هەقی ئەو کەسانەیە کە پیربوون و شیر ددەن و دووگیانن کە نارەحەت دەبن بە ڕۆژو گرتن، ئەوان دەتوانن بە ڕۆژوبن وە دەتوانن بە ڕۆژو نەبن و فیدیە بدەن.





سێ یەم: خوای گەورە لەگەڵ ئایەتەکەی دواتردا کە پێی دەڵێن ناسخ دەفەرموێ : يريد الله بكم اليسر ولا يريد بكم العسر، ئەوە لە بەلاغەو جوانی قورئان ناوەشێتەوە بڵێ بۆم ئاسان کردون بە لاَم قورسی بکا.

٤. وَقَٰتِلُواْ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ ٱلَّذِينَ يُقَٰتِلُونَكُمْ وَلَا تَعْتَدُوٓاْ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يُحِبُّ ٱلْمُعْتَدِينَ (البقرة: ١٩٠) جەنگ بکەن لەڕێ ی خوادا لەگەڵ ئەوانەی جەنگتان لەگەڵدا دەکەن وە دەست درێژی مەکەن بەڕاستی خودا دەست درێژی کەرانی خۆش ناوێت.

ئایا ئەو ئایەتە نەسخ بۆتەوە؟ بە چ ئایەتێک نەسخ بۆتەوە دیار نیە.

وە جێگای سەر سوڕمانە دەبێ ئەو ئایەتە بۆ نەسخ بێتەوە کە دەیان ئایەت هەمان مانا دەگەیەنێ، هەر ئایەتەکانی دواتر هەمان مانا دەگەیەنن: ٱلشَّهْرُ ٱلْحَرَامُ بِٱلشَّهْرِ ٱلْحَرَامِ وَٱلْحُرُمَٰتُ قِصَاصٌ فَمَنِ ٱعْتَدَىٰ عَلَيْكُمْ فَٱعْتَدُواْ عَلَيْهِ بِمِثْلِ مَا ٱعْتَدَىٰ عَلَيْكُمْ وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ وَٱعْلَمُوٓاْ أَنَّ ٱللَّهَ مَعَ ٱلْمُتَّقِينَ (البقرة: ١٩٤) مانگی ئاگربەست بەرانبەر بە مانگی ئاگربەست شکاندنی هەر ڕێزێکیش تۆڵەی هەیە جا هەر کەسێک دەست درێژی کردە سەرتان ئێوەش دەست درێژی بکەنە سەری بەوێنەی دەست درێژ کردنەکەی ئەو بۆ ئێوە وە لەخوا بترسن وە بزانن کەخوا لەگەڵ پارێزکارانە.

٥. يَسْـَٔلُونَكَ عَنِ ٱلشَّهْرِ ٱلْحَرَامِ قِتَالٍ فِيهِ قُلْ قِتَالٌ فِيهِ كَبِيرٌ وَصَدٌّ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِ وَكُفْرٌۢ بِهِۦ وَٱلْمَسْجِدِ ٱلْحَرَامِ وَإِخْرَاجُ أَهْلِهِۦ مِنْهُ أَكْبَرُ عِندَ ٱللَّهِ وَٱلْفِتْنَةُ أَكْبَرُ مِنَ ٱلْقَتْلِ وَلَا يَزَالُونَ يُقَٰتِلُونَكُمْ حَتَّىٰ يَرُدُّوكُمْ عَن دِينِكُمْ إِنِ ٱسْتَطَٰعُواْ وَمَن يَرْتَدِدْ مِنكُمْ عَن دِينِهِۦ فَيَمُتْ وَهُوَ كَافِرٌ فَأُوْلَٰٓئِكَ حَبِطَتْ أَعْمَٰلُهُمْ فِي ٱلدُّنْيَا وَٱلْءَاخِرَةِ وَأُوْلَٰٓئِكَ أَصْحَٰبُ ٱلنَّارِ هُمْ فِيهَا خَٰلِدُونَ (البقرة: ٢١٧) پرسیارت لێ دەکەن دەربارەی مانگی حەرام جەنگ کردن تیایدا بڵێ: جەنگ لەمانگی ئاگر بەست دا گوناهێکی گەورەیە بەڵام





بەرهەڵستیی ڕێبازی خوا وەبێ بڕوایی پێ ی وە(ڕێ گری موسوڵمانان) لە مزگەوتی حەرام و دەرکردنی خەڵکی ئەو مزگەوتە لێ ی گەورەترە لای خوا(لە جەنگ کردن لە مانگی حەرامدا) وە هەوڵ دان بۆ پەشیمان کردنەوەی موسوڵمان گەورەترە لە (پیاو) کوشتن (لەو مانگەدا) بەردەوام دەست هەڵناگرن و جەنگتان لەگەڵدا دەکەن تاپەشیمانتان بکەنەوە لە دینەکەتان ئەگەر بتوانن وە هەرکەسێک لەئێوە لەدینی خۆی هەڵ بگەڕێتەوە وە بەبێ بڕوایی بمرێ ئا ئەوانە هەموو کردەوەیەکیان پوچ ئەبێتەوە لە هەردوو جیهاندا وە ئەوانە یارو هاودەمی ئاگرن  تێیدا دەمێننەوە بە ئێجگاری

ئایا ئەم ئایەتە بۆ دەبێ نەسخ بێتەوە؟!

لە کاتێکدا موفەسیرینی زۆر دەڵێن نەسخ نەبۆتەوە

وە قورئان پشتیوانی لە نەسخ نە بونەوەی دەکا بۆ نمونە: فَإِذَا ٱنسَلَخَ ٱلْأَشْهُرُ ٱلْحُرُمُ فَٱقْتُلُواْ ٱلْمُشْرِكِينَ حَيْثُ وَجَدتُّمُوهُمْ وَخُذُوهُمْ وَٱحْصُرُوهُمْ وَٱقْعُدُواْ لَهُمْ كُلَّ مَرْصَدٍ فَإِن تَابُواْ وَأَقَامُواْ ٱلصَّلَوٰةَ وَءَاتَوُاْ ٱلزَّكَوٰةَ فَخَلُّواْ سَبِيلَهُمْ إِنَّ ٱللَّهَ غَفُورٌ رَّحِيمٌ (التوبة: ٥) ئینجا کاتێ مانگە حەرامەکان(ذو القعدة، ذو الحجة، محرم، رجب) تەواو بوون ئەوە هاوبەش ڕەوادەرەکان بکوژن لە هەر شوێنێ دەستان کەوتن وە(بەدیل) بیانگرن وە بەرگریان بکە لەدەرچوون وە بۆیان دانیشن لەهەموو جێگایەکی چاوەڕوانی دا جا ئەگەر پەشیمان بوونەوە و نوێژیان کردو زەکاتیان دا ئەوە ڕێیان بەڕەڵاکەن بەڕاستی خوا لێ بووردەی میهرەبانە.

إِنَّ عِدَّةَ ٱلشُّهُورِ عِندَ ٱللَّهِ ٱثْنَا عَشَرَ شَهْرًا فِى كِتَٰبِ ٱللَّهِ يَوْمَ خَلَقَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ مِنْهَآ أَرْبَعَةٌ حُرُمٌ ذَٰلِكَ ٱلدِّينُ ٱلْقَيِّمُ فَلَا تَظْلِمُواْ فِيهِنَّ أَنفُسَكُمْ وَقَٰتِلُواْ ٱلْمُشْرِكِينَ كَآفَّةً كَمَا يُقَٰتِلُونَكُمْ كَآفَّةً وَٱعْلَمُوٓاْ أَنَّ ٱللَّهَ مَعَ ٱلْمُتَّقِينَ (التوبة: ٣٦) بەڕاستی ژمارەی مانگەکان(ی ساڵ) لای خوا دوانزە مانگە لە (لوح المحفوظ) دا دانراوە لە





ڕۆژێکەوە (خوا) ئاسمانەکان و زەوی دروست کردووە چوار لەو مانگانە گەورەو بەڕێزن (شەڕیان تێدا قەدەغە کراوە) ئەوە ئایینی ڕێك و ڕاستە کەواتە لەو چوار مانگەدا ستەم مەکەن لە خۆتان وە بجەنگن لە دژی بت پەرستان بە تێکڕا هەروەك ئەوان دژی ئێوە دەجەنگن تێکڕا بشزانن کە بەڕاستی خوا لەگەڵ پارێزکاران دایە بە چاودێری و پاراستن.

وە خوای گەورە ڕەخنە لە هاوبەشپەرستەکان دەگرێ کە فێڵ دەکەن لە گۆڕینی مانگەکان: إِنَّمَا ٱلنَّسِيٓءُ زِيَادَةٞ فِي ٱلۡكُفۡرِۖ يُضَلُّ بِهِ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ يُحِلُّونَهُۥ عَامٗا وَيُحَرِّمُونَهُۥ عَامٗا لِّيُوَاطِـُٔواْ عِدَّةَ مَا حَرَّمَ ٱللَّهُ فَيُحِلُّواْ مَا حَرَّمَ ٱللَّهُۚ زُيِّنَ لَهُمۡ سُوٓءُ أَعۡمَٰلِهِمۡۗ وَٱللَّهُ لَا يَهۡدِي ٱلۡقَوۡمَ ٱلۡكَٰفِرِينَ (التوبة: ٣٧) بەڕاستی دواخستن و گۆڕینی (مانگە حەرامەکان) ڕۆچوونە لە بێ باوەڕیدا بێ باوەڕانی پێ گومڕا دەکرێت (دواخستنەکە) ساڵێك حەلاڵی دەکەن و ساڵێك حەرامی دەکەن بۆ ئەوەی ڕێك ببن لەگەڵ ژمارەی ئەو چوار مانگەی کە خوا ڕێزداری کردوون (جەنگی تێدا حەرام کردووە) سەرئەنجام ئەوەی خوا حەرامی کرد بوو حەلاڵی دەکەن جوانکراوە بۆیان کردەوە ناشرینەکانیان خواش ڕێنموونی کەسانی بێ باوەڕ ناکات.

کەواتە هیچ پاساوێک نیە بۆ بانگەشەی نەسخ لەم ئایەتەدا.

٦. يَسۡـَٔلُونَكَ عَنِ ٱلۡخَمۡرِ وَٱلۡمَيۡسِرِۖ قُلۡ فِيهِمَآ إِثۡمٞ كَبِيرٞ وَمَنَٰفِعُ لِلنَّاسِ وَإِثۡمُهُمَآ أَكۡبَرُ مِن نَّفۡعِهِمَاۗ وَيَسۡـَٔلُونَكَ مَاذَا يُنفِقُونَ قُلِ ٱلۡعَفۡوَۗ كَذَٰلِكَ يُبَيِّنُ ٱللَّهُ لَكُمُ ٱلۡأٓيَٰتِ لَعَلَّكُمۡ تَتَفَكَّرُونَ (البقرة: ٢١٩) پرسیارت لێ دەکەن دەربارەی عەرەق و قومار بڵێ: لەم دوانەدا گوناهی گەورەو چەند قازانجێک هەیە بۆ خەڵکی بەڵام گوناهەکەیان گەورەترە لە قازانجەکەیان وە پرسیارت لێ دەکەن چی ببەخشن بڵێ: ئەوی لێتان زیادە، ئاوەها خودا بەڵگەکان ڕوون دەکاتەوە بۆتان تا بیربکەنەوە.

ئایا ئەم ئایەتە نەسخ بۆتەوە؟





پێشتر باسمان کرد نەسخ واتای ئەوەیە کە کار بە ئایەتە نەسخکراوەکە ناکرێ ئائا چ لەم ئایەتەدا هەیە کە کاری پێ نەکرێ؟ لێرەدا وتراوە کە لە قومارو مەیدا زیان و توانێکی زۆری تێدا لە گەڵ چەند قازانجێک، وە زیانەکانیان زیاترن لە قازانجەکانیان، گومان لەوەدا نیە کە ئەمە ڕاستیە پێویست نیە بانگەشەی نەسخ بکەین، ئەو ئایەتە دەچێتە چوارچێوەی (تدرج) واتە هەنگاو بە هەنگاو مەی قەدەغە کراوە، وە دەکرێ ئەم ئایەتە لە گەڵ ئەو کەسانە کاری پێ بکرێ کە توشی هەمان قۆناغ بونەتەوە

7. وَٱلَّذِينَ يُتَوَفَّوْنَ مِنكُمْ وَيَذَرُونَ أَزْوَٰجًا وَصِيَّةً لِّأَزْوَٰجِهِم مَّتَٰعًا إِلَى ٱلْحَوْلِ غَيْرَ إِخْرَاجٍ فَإِنْ خَرَجْنَ فَلَا جُنَاحَ عَلَيْكُمْ فِى مَا فَعَلْنَ فِىٓ أَنفُسِهِنَّ مِن مَّعْرُوفٍ وَٱللَّهُ عَزِيزٌ حَكِيمٌ (البقرة: ٢٤٠) ئەو پیاوانەی دەمردن لەئێوە و ژنانی هاوسەر بەجێ دەهێڵن (خوا فەرمانی کردووە) بە وەسیەت کردن بۆ ژنەکانیان تاساڵێک بەخێو بکرێن بێ ئەوەی دەربکرێن (لە ماڵی مێردیان) ئینجا ئەگەر خۆیان چوونە دەرەوە ئیتر هیچ گوناهتان لەسەر نی یە (ئەی کەس وکاری مێرد) لەوەی کە ئەو ژنانە دەیکەن دەربارەی خۆیان بەباشیی وەخوا زاڵی کار دروستە، گوایە ئەم ئایەتە نەسخ بۆتە وە بە ئایەتی عیدەی وەفات کە پێشتر باسکراوە کە ئەم ئایەتەیە: وَٱلَّذِينَ يُتَوَفَّوْنَ مِنكُمْ وَيَذَرُونَ أَزْوَٰجًا يَتَرَبَّصْنَ بِأَنفُسِهِنَّ أَرْبَعَةَ أَشْهُرٍ وَعَشْرًا فَإِذَا بَلَغْنَ أَجَلَهُنَّ فَلَا جُنَاحَ عَلَيْكُمْ فِيمَا فَعَلْنَ فِىٓ أَنفُسِهِنَّ بِٱلْمَعْرُوفِ وَٱللَّهُ بِمَا تَعْمَلُونَ خَبِيرٌ (البقرة: ٢٣٤) ئەو پیاوانەی کەدەمرن لەئێوەو هاوسەران جێ دەهێڵن هاوسەرەکانیان چاوەروانی دەکەن چوار مانگ و دە شەو ئینجا کە عیددەیان تەواو بوو ئیتر گوناهتان لەسەر نی یە (ئەی کەس وکاری ژن) لەوەی کە (ئەو ژنانە ) دەیکەن لەخۆیاندا بەپێ ی باوی ناو کۆمەڵ وە خوا ئاگادارە بەوەی کە دەیکەن.





ئەم دوو ئایەتە دژ بەیەک نین تا ناچار بین بڵێین ئایەتەکەی پێشتر نەسخ بۆتەوە، چونکە یەکیان باس لە عیدەی وەفاتە کە چوار مانگ و دە ڕۆژە ئەوی تریان باسی ئەوە دەکات ئافرەت مافی ئەوەی هەیە لە ماڵی مێردەکەی بمێنێتەوە تا ساڵێک ،واتە ئەگەر مێردەکەی ئەو وەسیەتەی کردبو کەس مافی ئەوەی نیە لە ماڵی مێردەکەی دەری بکا ،کە ئەمە زیاتر ئیسپاتی مافی ئافرەت دەکا.

8 .لَآ إِكۡرَاهَ فِي ٱلدِّينِۖ قَد تَّبَيَّنَ ٱلرُّشۡدُ مِنَ ٱلۡغَيِّۚ فَمَن يَكۡفُرۡ بِٱلطَّٰغُوتِ وَيُؤۡمِنۢ بِٱللَّهِ فَقَدِ ٱسۡتَمۡسَكَ بِٱلۡعُرۡوَةِ ٱلۡوُثۡقَىٰ لَا ٱنفِصَامَ لَهَاۗ وَٱللَّهُ سَمِيعٌ عَلِيمٌ (البقرة: ٢٥٦) بە هیچ جۆرێک زۆر لێکردن لە دیندا نی یە (بۆ هاتنە ناو ئیسلام) چونکە بەڕاستی لە یەک جیابۆتەوە ڕێنموونی و شارەزایی لە گومڕایی و سەر لێ شێواویی (ئەم ئایەتە تایبەتە بە ئەوانەی ئایینی ئاسمانیان هەیە) ، ئینجا هەر کەس لە ڕێ ی بێ بڕوایی بگەڕێتەوە(بێ باوەڕ بێ بە هەر پەرستراوێک جگەلە خوا) وە بڕوا بهێنێ بەخوا ئەوە بێگومان بە توندی دەستی گرتووە بە دەستەگیرەیەکی قایمی بەهێزی وا (کە ئیسلام، یان ئیمانەکەیەتی) کە پچڕان و بەربوونی بۆ نی یە وە خوا بیسەری زانایە.

گوایە ئەو ئایەتە نەسخ بۆتەوە چونکە ئازادی بیرو باوەڕ نیە لە ئیسلامدا کە ئەمە کارەساتە بە ناوی دینەوە بوترێ چونکە ئایەتە کان کە باسی ئازادی بیرو باوەڕ دەکەن لە سەد ئایەت تێپەر دەکا چۆن دەکرێ ئەم هە موو ئایەتە نەسخ بکرێتەوە !

من لە کتابێکدا دا بە ناوی ( حوکمی هەڵگەرانەوە لە ئیسلام لە ژێر ڕۆشنایی قوڕئان و سونەتدا) بە درێژی وەڵامی ئەم گومانەمان داوەتەوە شوکر بۆ خوا

٩. لِّلَّهِ مَا فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِي ٱلۡأَرۡضِۗ وَإِن تُبۡدُواْ مَا فِيٓ أَنفُسِكُمۡ أَوۡ تُخۡفُوهُ يُحَاسِبۡكُم بِهِ ٱللَّهُۖ فَيَغۡفِرُ لِمَن يَشَآءُ وَيُعَذِّبُ مَن يَشَآءُۗ وَٱللَّهُ عَلَىٰ كُلِّ شَيۡءٖ قَدِيرٌ (البقرة: ٢٨٤) هەر هی





خوایە ئەوەی لە ئاسمانەکانایە و ئەوەی لە زەوی دایە ئەگەر ئاشکرای بکەن ئەوەی لە دڵتاندایە یا بیشارنەوە خوا محاسەبەتان دەکات لەسەری ئەوسا خۆش دەبێت لەو کەسەی کە بیەوێت وە سزای کەسێک دەدات کە بیەوێت وە خوا توانایە بەسەر هەموو شتێکدا.

گوایە ئەم ئایەتەش نەسخ بۆتەوە بە ئاتەکەی دواتر کە دەفەرموێ: لَا يُكَلِّفُ ٱللَّهُ نَفْسًا إِلَّا وُسْعَهَا لَهَا مَا كَسَبَتْ وَعَلَيْهَا مَا ٱكْتَسَبَتْ رَبَّنَا لَا تُؤَاخِذْنَآ إِن نَّسِينَآ أَوْ أَخْطَأْنَا رَبَّنَا وَلَا تَحْمِلْ عَلَيْنَآ إِصْرًا كَمَا حَمَلْتَهُۥ عَلَى ٱلَّذِينَ مِن قَبْلِنَا رَبَّنَا وَلَا تُحَمِّلْنَا مَا لَا طَاقَةَ لَنَا بِهِۦ وَٱعْفُ عَنَّا وَٱغْفِرْ لَنَا وَٱرْحَمْنَآ أَنتَ مَوْلَىٰنَا فَٱنصُرْنَا عَلَى ٱلْقَوْمِ ٱلْكَٰفِرِينَ (البقرة: ﴿٢٨٦﴾)

ئایا هیچ نە گونجان و دژ بەیەکیەک هەیە لەم دوو ئایەتەدا هەتا ناچار بین پەنا بۆ نەسخ بەرین؟ بێگومان نەخەیر، چونکە ئایەتی یەکەم تەخصیصی ئایەتەکەی پێشتر دەکا کە دەفەرموێ(ما فی أنفسکم) کەواتە ئەوەی وەسوەسەو خوتخوتەیە هیچی لەسەر نیە بەڵام ئەوەی دەبێتە بڕیارو عەزیمەت خوای گەورە ئێمەی لەسەر موحاسەبە دەکا بە پێی چەندین دەق وەک ئەوەی کە دەفەرموێ: وَمَن يُرِدْ فِيهِ بِإِلْحَادٍ بِظُلْمٍ نُّذِقْهُ مِنْ عَذَابٍ أَلِيمٍ ﴿٢٥﴾ الحج واتە هەر کەس بیەوێ و نیەتی وابێ لە حەرەمی کەعبەدا لادان و زیادە ڕەوی بکا سزای توندی پێدەچێژین، هەروەک دەفەرموێ: إِنَّ ٱلَّذِينَ يُحِبُّونَ أَن تَشِيعَ ٱلْفَٰحِشَةُ فِى ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ لَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ فِى ٱلدُّنْيَا وَٱلْءَاخِرَةِ وَٱللَّهُ يَعْلَمُ وَأَنتُمْ لَا تَعْلَمُونَ (النور: ﴿١٩﴾) واتە ئەوانەی پێیان خۆشە لە ناو ئیمانداراندا خراپەو تاوان بڵاو بێتەوە ئەوە سزای بە ئێشیان بۆ هەیە لە دونیاو دوارۆژدا.

کەواتە ئەوانەی بە دڵ تەمەنای خراپە دە کەن و هەوڵی بۆ دەدەن ئەوانە سزا دەدرێن لەسەر ئەو نیەتە.







ئەوانەی باسمان کردن چەند نمونەیەک بون لە سورەتی بەقەرە، تەواوی نمونەکان نەبون بەڵام دەبینی بانگەشەی نەسخ تێیاندا زۆر لاوازو بێ بنە مایە وە هەموو نمونەکانی تریش لە سورەتەکانی تر هەروان، بەڵام لەبەر ئەوەی کتابێکی تایبەتی دەوێ بۆیە هەموویان باس ناکەم.



## به قوڕئانکردنی فەرموودە

فەرمودەی ڕەجم کە ئەمە دەقەکەیەتی:

- قَالَ عُمَرُ : لَقَدْ خَشِيتُ أَنْ يَطُولَ بِالنَّاسِ زَمَانٌ، حَتَّى يَقُولَ قَائِلٌ : لَا نَجِدُ الرَّجْمَ فِي كِتَابِ اللَّهِ، فَيَضِلُّوا بِتَرْكِ فَرِيضَةٍ أَنْزَلَهَا اللَّهُ، أَلَا وَإِنَّ الرَّجْمَ حَقٌّ عَلَى مَنْ زَنَى وَقَدْ أَحْصَنَ إِذَا قَامَتِ الْبَيِّنَةُ، أَوْ كَانَ الْحَمْلُ أَوِ الِاعْتِرَافُ - قَالَ سُفْيَانُ : كَذَا حَفِظْتُ - أَلَا وَقَدْ رَجَمَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، وَرَجَمْنَا بَعْدَهُ.، رواه البخارى، ٦٨٢٩.
- حَدَّثَنِي أَبُو الطَّاهِرِ ، وَحَرْمَلَةُ بْنُ يَحْيَى ، قَالَا : حَدَّثَنَا ابْنُ وَهْبٍ ، أَخْبَرَنِي يُونُسُ، عَنِ ابْنِ شِهَابٍ ، قَالَ : أَخْبَرَنِي عُبَيْدُ اللَّهِ بْنُ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عُتْبَةَ ، أَنَّهُ سَمِعَ عَبْدَ اللَّهِ بْنَ عَبَّاسٍ يَقُولُ : قَالَ عُمَرُ بْنُ الْخَطَّابِ وَهُوَ جَالِسٌ عَلَى مِنْبَرِ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ : إِنَّ اللَّهَ قَدْ بَعَثَ مُحَمَّدًا صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بِالْحَقِّ، وَأَنْزَلَ عَلَيْهِ الْكِتَابَ، فَكَانَ مِمَّا أُنْزِلَ عَلَيْهِ آيَةُ الرَّجْمِ، قَرَأْنَاهَا، وَوَعَيْنَاهَا، وَعَقَلْنَاهَا، فَرَجَمَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، وَرَجَمْنَا بَعْدَهُ، فَأَخْشَى إِنْ طَالَ بِالنَّاسِ زَمَانٌ أَنْ يَقُولَ قَائِلٌ : مَا نَجِدُ الرَّجْمَ فِي كِتَابِ اللَّهِ. فَيَضِلُّوا بِتَرْكِ فَرِيضَةٍ أَنْزَلَهَا اللَّهُ، وَإِنَّ الرَّجْمَ فِي كِتَابِ اللَّهِ حَقٌّ عَلَى مَنْ زَنَى إِذَا أَحْصَنَ مِنَ الرِّجَالِ وَالنِّسَاءِ، إِذَا قَامَتِ الْبَيِّنَةُ، أَوْ كَانَ الْحَبَلُ، أَوِ الِاعْتِرَافُ. ،رواه مسلم ١٦٩١.
- عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَبَّاسٍ ، أَنَّ عُمَرَ - يَعْنِي ابْنَ الْخَطَّابِ - رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ خَطَبَ فَقَالَ : إِنَّ اللَّهَ بَعَثَ مُحَمَّدًا صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بِالْحَقِّ، وَأَنْزَلَ عَلَيْهِ الْكِتَابَ، فَكَانَ فِيمَا أُنْزِلَ عَلَيْهِ آيَةُ الرَّجْمِ، فَقَرَأْنَاهَا وَوَعَيْنَاهَا، وَرَجَمَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، وَرَجَمْنَا مِنْ بَعْدِهِ، وَإِنِّي خَشِيتُ إِنْ طَالَ بِالنَّاسِ الزَّمَانُ أَنْ يَقُولَ قَائِلٌ : مَا نَجِدُ آيَةَ الرَّجْمِ فِي كِتَابِ اللَّهِ. فَيَضِلُّوا بِتَرْكِ فَرِيضَةٍ أَنْزَلَهَا اللَّهُ تَعَالَى، فَالرَّجْمُ حَقٌّ عَلَى مَنْ زَنَى مِنَ الرِّجَالِ وَالنِّسَاءِ إِذَا كَانَ مُحْصَنًا، إِذَا قَامَتِ الْبَيِّنَةُ، أَوْ كَانَ حَمْلٌ، أَوِ اعْتِرَافٌ. وَايْمُ اللَّهِ لَوْلَا أَنْ يَقُولَ النَّاسُ : زَادَ عُمَرُ فِي كِتَابِ اللَّهِ عَزَّ وَجَلَّ ؛ لَكَتَبْتُهَا. رواه أبوداود،٤٤١٨.
- عُمَرَ بْنِ الْخَطَّابِ ، قَالَ : رَجَمَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، وَرَجَمَ أَبُو بَكْرٍ، وَرَجَمْتُ، وَلَوْلَا أَنِّي أَكْرَهُ أَنْ أَزِيدَ فِي كِتَابِ اللَّهِ، لَكَتَبْتُهُ فِي الْمُصْحَفِ، فَإِنِّي قَدْ خَشِيتُ أَنْ تَجِيءَ أَقْوَامٌ فَلَا يَجِدُونَهُ فِي كِتَابِ اللَّهِ فَيَكْفُرُونَ بِهِ. رواه الترمذى،١٤٣٢.



❖ ابْنِ عَبَّاسٍ ، قَالَ : قَالَ عُمَرُ بْنُ الْخَطَّابِ : لَقَدْ خَشِيتُ أَنْ يَطُولَ بِالنَّاسِ زَمَانٌ، حَتَّى يَقُولَ قَائِلٌ : مَا أَجِدُ الرَّجْمَ فِي كِتَابِ اللَّهِ. فَيَضِلُّوا بِتَرْكِ فَرِيضَةٍ مِنْ فَرَائِضِ اللَّهِ، أَلَا وَإِنَّ الرَّجْمَ حَقٌّ، إِذَا أُحْصِنَ الرَّجُلُ وَقَامَتِ الْبَيِّنَةُ، أَوْ كَانَ حَمْلٌ، أَوِ اعْتِرَافٌ، وَقَدْ قَرَأْتُهَا الشَّيْخُ وَالشَّيْخَةُ إِذَا زَنَيَا فَارْجُمُوهُمَا الْبَتَّةَ، رَجَمَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، وَرَجَمْنَا بَعْدَهُ.

گوایە ئەم ئایەتە (ا لشیخ والشیخة) ئایەتی قورئانە ! نەوەک هەر ئەوەندە گوایە تەخصیص ی ئایەتی الزانیة والزانی سورەتی نوری کردوە:

1. ئایەتی قورئان هەمووی موتەواترە بێ چەندو چون، بەڵام ئەو فەرمودەیە بێ چەندو چون ئاحادە، واتە مەرجی قورئانبونی تێدا نیە، چونکە قورئان لەفزو واتای موتەواترە.
2. قورئان ئەوەیە کە لە دوو توێی قورئاندایە، ئەوێ لەوێدا بێ قورئانە ئەوەی لەوێدا نەبێ قورئان نیەو سوێندی پێناخورێ.
3. قورئان لەسەر دەمی ئەبوبەکردا جارێک کۆکرایەوە بە ئامادە بونی هەر چوار خەلیفەکان و زۆربەی هاوەڵان و لیژنەی تایبەت، خێربو ئەو ئایەتەی تێدا نەبو.
4. لەسەر دەمی خەلیفە عوسمانیش جارێکی تر قورئان کۆکرایەوە لە بەر جیاوازی خوێندنەوە نەوەک ترسی لە ناو چون بەڵام دیسان ئەو ئایەتە دانەنرا.
5. جوررئەتی ئیمامی عومەر دۆست و دوژمن ئاشنایەتی خێرە جەنابیان دە ساڵ خەلیفە بون ئەو ئایەتەیان هەر لە پەراوێزیش دانەنا چ جای لە ناو سورەتێک.
6. قورئانی پیرۆز ژمارەی سورەت و ئایەتی دیارە، ئەرێ ئەم ئایەتە کام سورەت و ژمارە چەندە ئەگەر ئایەتە؟!.
7. ئوسلوبی قورئان ئوسلوبێکی تەواو تایبەتە کە ئەم دەقە لە ئوسلوبی قورئان ناچێ.





8. ئەم دەقە ئیختلافی تێدایە بە چوار جۆر هاتوە بەڵام قورئان جیاوازی تێدا نیە.
9. ئەو دەقە حوکمەکەی بەستۆتەوە بە شەیخوخە واتە پیری نەوەک محصن و غەیرە محصن کە ئەمەش پێچەوانەی حوکمی ئەم بابەتەی، چونکە زانایان جیاوازی بە و کەسە دەکەن ژنی هەبێ و مێردی کردبێ نەوەک پیرو گەنج، بۆی هەیە پیر بێ و شوی نەکردبێ و ژنی نەهێنابێ.
10. هیچ کەس جورئەتی ئەوە ناکا بسم الله لە سەرەتای سورەتی التوبة دابنێ، یاخود بسم الله ناو سورەتی النمل لابا چونکە تەوقیفییە لە پێغەمبەری خواوە.
11. ئایا دەقێک ئەگەر قورئانبونی نەسەلمێنرا فەرمودە بونی دەسەلمێنرێ؟ واتە دروستە وەک فەرمودە کاری پێبکەی یان نا؟ دیارە ڕاجیایی لەسەرە.
12. دەکرێ ئیمامی عومەر کە ناوی لێناوە ئایەت لە بەر مەعلومی حوکمەکە بوبێ نەوەک دەقی قورئان.
13. بابەتی ڕەجم لە بەر ئەوەی کوشتنی مرۆڤە، وە مرۆڤ خوێنی پارێزراوە مەگەر بە دەقێکی سەحیحی سەریح نەبێ، بۆیە ناکرێ بریاری کوشتن لە سەر زیناکاری (محصن) بدرێ.
14. ئەوەی کە پێغەمبەری خوا کردویەتی لە رەجم بە پێی شەریعەتی تەورات بوە هەتا ئایەتی نوری بۆ دابەزیوە نەوک شەریعەتی ئیسلامی.
15. لەگەڵ هەموو ئەمانەشدا دامان نا وەک جمهور دەڵێن ئەمە شەریعەتی ئیسلام بەڵام شەریعەت لەگەڵ سەترو چاوپۆشی دایە نەوەک جێبەجێکردنی حوکمە کە بە بەڵگەی فەرمودەکەی ماعیزای ئەسلەمی کە چەندین جار پێغەمبەری خوا رەتیکردوە،
16. دەشتوانرێ لە پێش دانپێدا هێنانە کە کەسەکە پەشیمان بێتەوە، وە دەتوانی لە کاتی جێبەجێکردنیشی و لە دوای دەرچونی بڕیارەکە پەشیمانبێتەوە.





17. دامان نا یاساکە جێبەجێکرا بۆچی بە گولە جێبەجێ نەکرێ بۆچی بەرد باران بکرێ کە گولەش هەر ڕەجم و هاویشتنە، کە ئیسلام لە گەڵ جوانترین شێوازی کوشتن دایە( وإذا قتلتم فأحسنوا القتلة) واتە ئەگەر شتێکتان کوشت جوان بیکوژە، ئەگەر مریشکت سەر بری دەبێ چەقۆکە تیژ کەی، نابێ لە بەرچاوی ئەو هیتر سەر بری، دەبێ زوو ئازادی بکەی و ئیسراحەتی بدەیە، ئامانجی سەرەکی لەم بابەتە ئەوەیە ناکرێ فەرموودە بکەین بە قورئان تەنیا لەبەر ڕیوایەتی ئاحاد کە قورئانبون بێ دوودڵی دەبێ ڕیوایەتەکەی متواتر بێ.

**بەقورئانکردنی شیردان و بانگەشەی نەسخەکەی**

لەو بابەتە گەرمانەی کە زۆر قسەی لەسەرە بابەتی شیردانە کە گوایە سەرەتا ١٠ جار بوە دواتر نەسخ بۆتەوە بە پێنج جاری زانراو ئەم حوکمە واتە پێنج جارەکە وەک قورئان خوێندراوەتەوە کە پێغەمبەر وەفاتی کردوە علیە ا لصلاة والسلام.

ئەمەش دەقی فەر مودەکەیە لە کتابەکانی فەرموودە:

1 .عَنْ عَائِشَةَ ، أَنَّهَا قَالَتْ : كَانَ فِيمَا أُنْزِلَ مِنَ الْقُرْآنِ عَشْرُ رَضَعَاتٍ مَعْلُومَاتٍ، يُحَرِّمْنَ، ثُمَّ نُسِخْنَ بِخَمْسٍ مَعْلُومَاتٍ، فَتُوُفِّيَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، وَهُنَّ فِيمَا يُقْرَأُ مِنَ الْقُرْآنِ. رواه مسلم،١٤٥٢

2 . عَنْ عَائِشَةَ أَنَّهَا قَالَتْ : كَانَ فِيمَا أَنْزَلَ اللَّهُ عَزَّ وَجَلَّ مِنَ الْقُرْآنِ : عَشْرُ رَضَعَاتٍ يُحَرِّمْنَ. ثُمَّ نُسِخْنَ بِخَمْسٍ مَعْلُومَاتٍ يُحَرِّمْنَ، فَتُوُفِّيَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَهُنَّ مِمَّا يُقْرَأُ مِنَ الْقُرْآنِ. رواه ابوداود،، ٢٠٦٢

ئەم دوو فەرمودەیە وەچەندین سەرچاوەی تریش باسیان کردوون کە دەڵێ ئەوەی لە قورئان دابەزیوە ١٠ شیر پێدان بوە کە پێی حەرامکراوە دواتر نەسخ





بونەوە بە پێنج جاری دیار کە پێیان حەرامدەکرا، وە ئەوە کاتێک پێغەمبەر وەفاتی کرد لە قورئان دەخوێنرانەوە.

جارێ ئەوە ناکرێ قورئانبێ چونکە مەرجی قورئانبونی تێدا نیە کە تەواتورە.

ئایا چ حیکمەتێک هەیە لە وەی جاری یەکەم دە جار بوە بەڵام دواتر بوو بە پێنج جار؟.

وە لە پاشان زانایان جیاوازیان هەیە ئایا کام شیردانە حەرامدەکا، ئایا زیاترە لە دە، یان دە، یان پێنج، یان کەمتر، وەهەتا یەک قومیش یان دوو قومیش حەرامدەکا، وە هەتا دەوترێ شیردان بە گەورەش کاریگەری هەیە، یان دەوترێ بۆ حاڵەتی تایبەت بوە، یان حوکمەکەی گشتیە و ئێستاش کاری پێدەکرێ هەموو ئەو بۆچونانە هەن، ئایاچۆن دەکرێ ئەوە ناوی قورئانی لێبنرێ؟

وە دەکرێ دایکمان عائشە مەبەستی ئەوە بوبێ کە قورئان دابەزیوەو ئەو حوکمە هەبوەو نەهی لێنەکراوە، وە هەتا ئەگەر واشبڵێین هیچ حیکمەتێک نیە دە جار بکرێ بە پێنج جار، چونکە خوای گەورە دەزانێ کە دە جار کاریگەری هەیە یان پێنج جار بۆیە پێویست نیە ئەم بابەتە گۆڕانکاری بەسەردا بێ.

من ئەو دوو نمونەیەم باسکرد دەنا شتی ئەوەندە لاواز گوتراوە کە نەوەک هەر زانستی و لۆژیک نیە بەڵکو هەر عەیبە باسبکرێ.



**تەوەری شەشەم**

## ئیعجازی قورئان

یەکێک لەو بابەتانەی کە زۆر قسەی دەربارە دەکرێ بابەتی ئیعجازی قوڕئانی پیرۆزە، گومان لەوەدا نیە کە قوڕئان موعجیزەیە، وە ڕاسترین وتەیە لەسەر زەویدا، وە کۆتا پەیامی خوایە بۆ مرۆڤایەتی، وە گەورەترین حەزارەی دروستکرد لەسەر زەویدا، وە کاریگەرترین کتابە، وە فراوانترین شەریعەتە، وە گونجاوترینە بۆ ژیان، وە زانستی ترینە، وە واقعیترینە، وە بەهێزترینە هەتا ئێستاش.

وە زۆرترین لێکۆڵینەوەو خوێندنەوەی بۆ دەکرێ هەتا لە لایەن نەیارەکانیشیەوە، ئەوانەی باسمان کردن نیشانەی موعجیزە بونیەتی، هەرچەند بەداخەوە ئەوە ئێمە نین موعجیزەکانی قوڕئان دەردەخەین بە تایبەت موعجیزەی زانستی، هەر ئەوەش وای کردوە خەڵک پێمان بڵێ تا ئەوروپا شتێک باس نەکاو نەدۆزێتەوە ئێوە باسی موعجیزە ناکەن، بەڵام لە ڕاستیدا موعجیزەی قوڕئان تەنیا بواری زانستی نیە تا بڵێین پەکی لەسەر دۆزینەوەی ئەوروپا کروتوە، چونکە بواری ئیعجازی قوڕئان هەمە جۆرەیە، سەرەتا بابزانین موعجیزە بە مانای چیدێ؟



## موعجیزە لە زمانەوانیدا

زانایانی گەورەی زمانەوانی دەڵێن ( المعجزة ) لە (عجز) وەرگیراوە جا پیتی جیم سکونی لە سەر بێ یان بۆری لەسەر بێ یان ژێری هەبێ، بەو واتایانە دێ:

- ✓ پێچەوانەی بڕیارڕدانە واتا ضد الحزم
- ✓ پێچەوانەی توانایە ضد القدرة
- ✓ دواکەوتن لە شتێک. التأخر عن الشئ
- ✓ دواوەی ئافرەت کاتێک گەورە بێ واتە پاشی گەورە بێ مؤخرة المرأة الكبيرة
- ✓ پێچەوانەی ژیری ضد الكيس ای العاقل يقال عاجز الرأی

## موعجیزە لە زاراوەدا ئەوا پێناسە کراوە

المعجزة هی: أمر خارق للعادة، داعية إلى الخير والسعادة، مقرونة بدعوى النبوة، قصد به إظهار صدق من ادعى أنه رسول الله.

واتا کارێکە پێچەوانەی نەریتی باوە، هاندەرو بانگکەرە بۆ خێرو بەختەوەری، هاوکاتە لە گەڵ بانگەشەی پێغەمبەرایەتی، مەبەست پێی دەرخستنی ڕاستی ئەو کەسەیە کە بانگەشەی پێغەمبەرایەتی دەکا.

بەڵام هەندێکیان دەڵێن تەحەدا واتا: مەیدانگیری مەرج نیە، چونکە جاری وابوە ئەو موعجیزەیە بۆ بڕواداران بوە کە ئەوان پێویستیان بە تەحەدا نەبوە چونکە بڕوایان هەبوە بە موعجیزە.

لەقورئانی پیرۆزدا داتاشراوەکانی (عجز) بە کارهاتوە وەک عجوز، بمعجزين، أعجاز، معاجز، ليعجز...

ئەوانە هەندێکن لەو ئایەتانەی کە مادەی( عجز )یان تێدا بەکارهاتوە:

- ❖ قَالَتْ يَا وَيْلَتَىٰ أَأَلِدُ وَأَنَا عَجُوزٌ وَهَٰذَا بَعْلِي شَيْخًا ﴿٧٢ هود﴾





❖ فَأَقْبَلَتِ امْرَأَتُهُ فِي صَرَّةٍ فَصَكَّتْ وَجْهَهَا وَقَالَتْ عَجُوزٌ عَقِيمٌ ﴿٢٩﴾ الذاريات

❖ قَالَ يَا وَيْلَتَا أَعَجَزْتُ أَنْ أَكُونَ مِثْلَ هَذَا الْغُرَابِ ﴿٣١﴾ المائدة

❖ إِنَّ مَا تُوعَدُونَ لَآتٍ وَمَا أَنْتُمْ بِمُعْجِزِينَ ﴿١٣٤﴾ الأنعام

❖ وَلَا يَحْسَبَنَّ الَّذِينَ كَفَرُوا سَبَقُوا إِنَّهُمْ لَا يُعْجِزُونَ ﴿٥٩﴾ الأنفال

❖ وَاعْلَمُوا أَنَّكُمْ غَيْرُ مُعْجِزِي اللَّهِ ﴿٢﴾ التوبة

❖ وَإِنْ تَوَلَّيْتُمْ فَاعْلَمُوا أَنَّكُمْ غَيْرُ مُعْجِزِي اللَّهِ ﴿٣﴾ التوبة

❖ قُلْ إِي وَرَبِّي إِنَّهُ لَحَقٌّ وَمَا أَنْتُمْ بِمُعْجِزِينَ ﴿٥٣﴾ يونس

❖ أُولَئِكَ لَمْ يَكُونُوا مُعْجِزِينَ فِي الْأَرْضِ ﴿٢٠﴾ هود

❖ قَالَ إِنَّمَا يَأْتِيكُمْ بِهِ اللَّهُ إِنْ شَاءَ وَمَا أَنْتُمْ بِمُعْجِزِينَ ﴿٣٣﴾ هود

❖ أَوْ يَأْخُذَهُمْ فِي تَقَلُّبِهِمْ فَمَا هُمْ بِمُعْجِزِينَ ﴿٤٦﴾ النحل

❖ وَالَّذِينَ سَعَوْا فِي آيَاتِنَا مُعَاجِزِينَ أُولَئِكَ أَصْحَابُ الْجَحِيمِ ﴿٥١﴾ الحج

❖ لَا تَحْسَبَنَّ الَّذِينَ كَفَرُوا مُعْجِزِينَ فِي الْأَرْضِ وَمَأْوَاهُمُ النَّارُ ﴿٥٧﴾ النور

❖ إِلَّا عَجُوزًا فِي الْغَابِرِينَ ﴿١٧١﴾ الشعراء

❖ وَمَا أَنْتُمْ بِمُعْجِزِينَ فِي الْأَرْضِ وَلَا فِي السَّمَاءِ ﴿٢٢﴾ العنكبوت

❖ وَالَّذِينَ سَعَوْا فِي آيَاتِنَا مُعَاجِزِينَ أُولَئِكَ لَهُمْ عَذَابٌ ﴿٥﴾ سبإ

❖ وَالَّذِينَ يَسْعَوْنَ فِي آيَاتِنَا مُعَاجِزِينَ أُولَئِكَ فِي الْعَذَابِ مُحْضَرُونَ ﴿٣٨﴾ سبإ





❖ وَمَا كَانَ اللَّهُ لِيُعْجِزَهُ مِنْ شَيْءٍ فِي السَّمَاوَاتِ ﴿٤٤ فاطر﴾

❖ إِلَّا عَجُوزًا فِي الْغَابِرِينَ ﴿١٣٥ الصافات﴾

❖ سَيُصِيبُهُمْ سَيِّئَاتُ مَا كَسَبُوا وَمَا هُمْ بِمُعْجِزِينَ ﴿٥١ الزمر﴾

❖ وَمَا أَنْتُمْ بِمُعْجِزِينَ فِي الْأَرْضِ ﴿٣١ الشورى﴾

❖ وَمَنْ لَا يُجِبْ دَاعِيَ اللَّهِ فَلَيْسَ بِمُعْجِزٍ فِي الْأَرْضِ ﴿٣٢ الأحقاف﴾

❖ تَنْزِعُ النَّاسَ كَأَنَّهُمْ أَعْجَازُ نَخْلٍ مُنْقَعِرٍ ﴿٢٠ القمر﴾

❖ فَتَرَى الْقَوْمَ فِيهَا صَرْعَىٰ كَأَنَّهُمْ أَعْجَازُ نَخْلٍ خَاوِيَةٍ ﴿٧ الحاقة﴾

❖ وَأَنَّا ظَنَنَّا أَنْ لَنْ نُعْجِزَ اللَّهَ فِي الْأَرْضِ ﴿١٢ الجن﴾

له قورئاندا وشەی موعجیزە بەکار نەهاتوە بەو مانایەی کە ئێستا دەوترێ و پێناسە دەکرێ، بەڵکو وشەی:

✓ **آية:** وَلَقَدْ ءَاتَيْنَا مُوسَىٰ تِسْعَ ءَايَـٰتٍۭ بَيِّنَـٰتٍ ۖ فَسْـَٔلْ بَنِىٓ إِسْرَٰٓءِيلَ إِذْ جَآءَهُمْ فَقَالَ لَهُۥ فِرْعَوْنُ إِنِّى لَأَظُنُّكَ يَـٰمُوسَىٰ مَسْحُورًا ﴿١٠١﴾ (الإسراء: ١٠١)

✓ **بينة:** وَإِلَىٰ ثَمُودَ أَخَاهُمْ صَـٰلِحًا ۗ قَالَ يَـٰقَوْمِ ٱعْبُدُوا۟ ٱللَّهَ مَا لَكُم مِّنْ إِلَـٰهٍ غَيْرُهُۥ ۖ قَدْ جَآءَتْكُم بَيِّنَةٌ مِّن رَّبِّكُمْ ۖ هَـٰذِهِۦ نَاقَةُ ٱللَّهِ لَكُمْ ءَايَةً ۖ فَذَرُوهَا تَأْكُلْ فِىٓ أَرْضِ ٱللَّهِ ۖ وَلَا تَمَسُّوهَا بِسُوٓءٍ فَيَأْخُذَكُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ (الأعراف: ٧٣)

✓ **بصيرة:** وَمَا مَنَعَنَآ أَن نُّرْسِلَ بِٱلْـَٔايَـٰتِ إِلَّآ أَن كَذَّبَ بِهَا ٱلْأَوَّلُونَ ۚ وَءَاتَيْنَا ثَمُودَ ٱلنَّاقَةَ مُبْصِرَةً فَظَلَمُوا۟ بِهَا ۚ وَمَا نُرْسِلُ بِٱلْـَٔايَـٰتِ إِلَّا تَخْوِيفًا (الإسراء: ٥٩)





- ✓ سلطان: قَالَتْ رُسُلُهُمْ أَفِي ٱللَّهِ شَكٌّ فَاطِرِ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ يَدْعُوكُمْ لِيَغْفِرَ لَكُم مِّن ذُنُوبِكُمْ وَيُؤَخِّرَكُمْ إِلَىٰٓ أَجَلٍ مُّسَمًّى قَالُوٓاْ إِنْ أَنتُمْ إِلَّا بَشَرٌ مِّثْلُنَا تُرِيدُونَ أَن تَصُدُّونَا عَمَّا كَانَ يَعْبُدُ ءَابَآؤُنَا فَأْتُونَا بِسُلْطَٰنٍ مُّبِينٍ (إبراهيم: ١٠)
- ✓ برهان: ٱسْلُكْ يَدَكَ فِي جَيْبِكَ تَخْرُجْ بَيْضَآءَ مِنْ غَيْرِ سُوٓءٍ وَٱضْمُمْ إِلَيْكَ جَنَاحَكَ مِنَ ٱلرَّهْبِ فَذَٰنِكَ بُرْهَٰنَانِ مِن رَّبِّكَ إِلَىٰ فِرْعَوْنَ وَمَلَإِيْهِۦٓ إِنَّهُمْ كَانُواْ قَوْمًا فَٰسِقِينَ ٣٢ (القصص: ٣٢)

## مەرجەکانی موعجیزە

موعجیزە کۆمەڵێک مەرجی هەیە لەوانە:

1. أن تكون خارقة للعادة: واتە پێچەوانەی نەریت و شتی ئاسایی بێ.
2. أن تكون من فعل الله : واتە شتەکە بە فەرمانی خوا ڕووبدا و خوای گەورە بەدی بێنێ لەسەر دەستی پێغەمبەرەکەی.
3. أن تظهر المعجزة على يد النبى: واتە ئەم موعجیزەیە لەسەر دەستی پێغەمبەرێک ڕووبدا.
4. أن تكون المعجزة سالمة من المعارضة: ناکرێ ئەم موعجیزەیە وەڵام بدرێتەوە.
5. أن تكون المعجزة بعد دعوى النبوة: دەبێ ڕوودانی موعجیزەکە دوای بانگەشەی پێغەمبەرایەتی بێ، چونکە ئەگەر پێش پێغەمبەرایەتی بێ پێی دەوترێ (إرهاصات) پێی ناوترێ موعجیزە.
6. وەک پێشتر وتمان تەحەدا مەرج نیە، چونکە جاری وایە موعجیزە بۆ ئیمانداران ڕوویداوە کە ئەوان بڕوایان بە موعجیزە بوە.



## تەحەدای قورئان بۆ جنۆکەو مرۆڤ

یەکەم : تەحەدا کراوە بە هەموو قورئان: وەک خوای گەورە دەفەرموێ: قُل لَّئِنِ ٱجْتَمَعَتِ ٱلْإِنسُ وَٱلْجِنُّ عَلَىٰٓ أَن يَأْتُوا۟ بِمِثْلِ هَـٰذَا ٱلْقُرْءَانِ لَا يَأْتُونَ بِمِثْلِهِۦ وَلَوْ كَانَ بَعْضُهُمْ لِبَعْضٍ ظَهِيرًا (الإسراء: ٨٨) ئەی (موحەممەد(صلى الله عليه وسلم)) بڵێ سوێند بەخوا ئەگەر ئادەمی و پەری هەموو کۆببنەوە بۆ ئەوەی وێنەی ئەم قورئانە بێنن ناتوانن وێنەی ئەو بێنن هەرچەندە پشتیوانی یەکتریش بن.

دووەم: تەحەداو مەیدانگیری بە دە سورەت: أَمْ يَقُولُونَ ٱفْتَرَىٰهُ قُلْ فَأْتُوا۟ بِعَشْرِ سُوَرٍ مِّثْلِهِۦ مُفْتَرَيَـٰتٍ وَٱدْعُوا۟ مَنِ ٱسْتَطَعْتُم مِّن دُونِ ٱللَّهِ إِن كُنتُمْ صَـٰدِقِينَ (هود: ١٣) یان ئەوانە دەڵێن پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) ئەو (قورئانە) ی هەڵبەستووە بڵێ دەی ئێوەش دە سورەتی وەکو ئەو (قورئانە) بێنن هەڵبەستراوبن وە بانگ بکەن (بۆ پشتیوانیتان) هەرکەس دەتوانن بێجگە لە خوا ئەگەر ئێوە ڕاست دەکەن.

سێ یەم: تەنیا بە یەک سورەت: وَإِن كُنتُمْ فِى رَيْبٍ مِّمَّا نَزَّلْنَا عَلَىٰ عَبْدِنَا فَأْتُوا۟ بِسُورَةٍ مِّن مِّثْلِهِۦ وَٱدْعُوا۟ شُهَدَآءَكُم مِّن دُونِ ٱللَّهِ إِن كُنتُمْ صَـٰدِقِينَ (البقرة: ٢٣) گەر گومانتان لەوە هەیە کە دامانبەزاندووە بۆسەر بەندەی خۆمان، سورەتێکی وەك ئەمە بهێنن و بانگی هاوکارەکانتان بکەن جگە لە خودا گەر خۆتان بە ڕاست ئەزانن.

مەرج نیە ئەو ئایەتانە یەک لە دووی یەک هاتبن بەڵام شتێکی لۆژیکیە کە ئەوا دابەش بکرێ



## هەڵوێستی زانایان دەربارەی ئیعجازی قورئانی پیرۆز

زانایان دەربارەی ئیعجازی قورئان بونە سێ بەشەوە:

یەکەم: ئەوانەی بواری ئیعجاز بەرتەسک دەکەنەوە: دەڵێن پێویست ناکات ئەوەندە بە دووی ئیعجازەوە بین: چونکە قورئان هاتوە بۆ هیدایەتی مرۆڤایەتی، ئیعجازەی گەورەی قورئان لە هیدایەتەکەی دایە نەوەک بوارە ئیعجازەکەی، وە دەڵێن ئێمە نابێ ڕاستیەکانی قورئان بەدوو ئیعجازێک بخەین کە لێی دڵنیا نین، بۆی هەیە ئەوەی ئەمڕۆ پێی دەوترێ ئیعجاز دواتر پشتڕاست نەکرێتەوەو بەدرۆ بکەوێتەوە، دواتر خەڵک دەکەونە گومان لە ڕاستی ئایەتەکانی قورئانی پیرۆز، بەتایبەت بواری زانستی ڕۆژانە زانست شتی نوێ دەردەخا.

دووەم: ئەوانەی بواری ئیعجازی قورئان زۆر فراوان دەکەن: وە ئەوانە زۆر زیادە ڕەوی دەکەن لە بواری ئیعجازی قورئان زۆر شت هەیە تەنیا گریمانەو بیردۆزەیە دەیکەنە ئیعجازی قورئان، ئەو مەدرەسەیە لە سەدەی ڕابردو قوتابخانەیەکی بەرچاو بەهێز دەردەکەوت، ئەوەش لە ژێر کاریکەری پێشکەوتنی زانستی ئەوروپی، وە بۆ ئەوەی بڵێن قورئان کتابێکی زانستیە، وە نەڵێن مسوڵمانان دواکەوتون لە بواری زانستی گومان لەوەدا نیە زیادەڕەوی لەو بوارەدا گومان دەخاتە سەر ڕاستیەکانی قورئان.

سێیەم: هەڵوێستی ئەوانەی کە میانڕەو میانگیرن نە بواری ئیعجاز بەرتەسک دەکەنەوە زیاد لە پێویست، وە نە لەگەڵ ئەوانەشدان کە دەڵێن ئیعجاز بە گریمانەو بیردۆزە تەفسیر بکەین، وە ئەوان دەڵێن دەبێ مەرج هەبێ بۆ بواری ئیعجازی قورئان، ناکرێ هەر شتێک وترا بکرێتە تەفسیری قورئان و بە ئیعجاز ناوی بەرین، بۆیە پێویستە ئەو مەرجانە ڕەچاو بکرێن بۆ ئیعجازی قورئانی پیرۆز:





١. کۆمەڵێک ئایاتی زۆرمان هەیە کە ژمارەیان لە هەزار ئایەت تێپەڕدەکات کە باسی بونەوەرو سروشت دەکەن چۆن دەکرێ ئێمە باسی لێوە نەکەین و باسی ئیعجازی قورئان نەکەین؟!

٢. ئەو هەموو ئایەتانە لە قورئانی پیرۆز کە هانمان دەدەن بۆ ورد بۆنەوە لە ئاسمان، زەوی، چیاکان، ڕۆژ، مانگ، باران، ئاژەڵ، ڕووەک ... ئەگەر ئەمە پاساو نەبێ بۆ قسە کردن لە سەر ئیعجازی قورئان چ پاساوێک هەیە؟ وە سودی وردبونەوە لەوانە چیە ئەگەر نەمانگەیەیەتە ئیعجازی قورئان؟

٣. مرۆڤ بەرپرسە لە بە کارهێنانی هەستەکانی بۆ وردبونەوەو تێڕامان لە بونەوەر، وە گازندەی زۆر کراوە لە وانەی کە ژیری و هەستەکانیان بەکار ناهێنن، گومان لەوەدا نیە کە بیرکردنەوە دەبێ بەرهەم و لێکدانەوەی هەبێ، وە بمانگەیەنەتە نەهێنیەکانی ئەم بونەوەرەو وردەکاریەکانی کە لەقورئانی پیرۆز نەوەک هەر ئاماژەی پێکراوە، بەڵکو فەرمانی پێکراوە کە وردبینەوەو سەرەنجامی وردبونەوەکەمان دەست بخەین و بگەین بە یەقین لە ڕاستی پەیامەکەمان کە قورئانی پیرۆزە.

٤. ڕێزگرتنی قورئانی پیرۆز بۆ زانست و زانایان بەم چڕیە خۆی لە خۆیدا هاندانە بۆ تێڕامان و گەیشتن بە ڕاستیەکان و دەرخستنی ئیعجازی قورئان، ئەگەر نا جیاوازی زانایان لە نەزانەکان چیە؟.

٥. گازندەی زۆری قورئانی پیرۆز لەوانەی کە کوێرانە وە دووی خەڵک دەکەون و بیر ناکەنەوە لە ڕاستیەکان، ئەوە هاندانە بۆ گەیشتن بە حیعجازی قورئان.

٦. بۆ نمونە کە سەیری ئەم ئایەتە پیرۆزە بکەین کە دەفەرموێ: إِنَّ فِي خَلْقِ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ وَٱخْتِلَٰفِ ٱلَّيْلِ وَٱلنَّهَارِ وَٱلْفُلْكِ ٱلَّتِي تَجْرِي فِي ٱلْبَحْرِ بِمَا يَنفَعُ ٱلنَّاسَ وَمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ مِنَ ٱلسَّمَآءِ مِن مَّآءٍ فَأَحْيَا بِهِ ٱلْأَرْضَ بَعْدَ مَوْتِهَا وَبَثَّ فِيهَا مِن كُلِّ دَآبَّةٍ وَتَصْرِيفِ





ٱلرِّيَٰحِ وَٱلسَّحَابِ ٱلْمُسَخَّرِ بَيْنَ ٱلسَّمَآءِ وَٱلْأَرْضِ لَءَايَٰتٍ لِّقَوْمٍ يَعْقِلُونَ (البقرة: ١٦٤)

بەڕاستی هەیە لە دروست کردنی ئاسمانەکان وزەوی و جیاوازی شەووڕۆژ(بە کورتی و درێژی) و ئەو کەشتیانەی کەدێن و دەچن لەدەریادا بەوشتانە کەقازانج دەگەیەنن بەخەڵکی وە ئەوەی کە خوا لەئاسمانەوە باراندی لە ئاو (باران) پاشان زەوی پێ زیندوو کردەوە (پێ بووژاندەوە) پاش مردنی وە بڵاوی کردەوە تێیدا لەهەموو جۆرە زیندەوەرێک وە گێڕانی بایەکان(بە هەموولایەکدا) وە ئەو هەورانەی ڕام کراوون لەناوەندی ئاسمان و زەوی دا چەند بەڵگەن بۆ کەسانێک کە تێبگەن.

ئەم هەشت شتە کەباسی کراوە:

- ✓ دروستکرانی ئاسمان و زەوی
- ✓ جیاوازی شەوو ڕۆژ
- ✓ ڕۆیشتنی کەشتیەکان بە قازانج و بەرژەوەندی خەڵک
- ✓ ئاو کە لە ئاسمان دادەبەزێ
- ✓ ڕوانی گژوگیا
- ✓ بڵاوکردنەوەی زیندەوەران
- ✓ جیاوازی بایەکان
- ✓ ڕامکردنی هەورەکان

هەموو ئەوانە بەڵگەن لەسەر گەورەیی خوا. وە لە هەمانکاتدا بەهرەی خوان بەسەر مرۆڤەکانەوە، بەڵام دەبێ خاوەن زانست و ژیریەکان تێی ڕامێنن بۆ ئەوەی بگەنە ڕاستیەکان، باشە قورئان باسی ئەوەمان بۆ ناکا ئەوانە بەڵگەن بۆ کەسانی خاوەنی ژیری؟

٧. وە قورئانی پیرۆز بە کورتی باسی ئەو شتانەمان بۆ دەکا، بۆ ئەوەی خۆمان بە دوو وردەکاریەکانیدا بڕۆین.





٨. خوای گەورە باسی تەسخیری ئاسمانەکان و زەوی کردوە نەوەک تەنیا دروستکردن، کەواتە دەبێ ئێمە لە هەوڵی ئەوەدا بین سودمەند بین و لە ڕۆژ و مانگ و وزەو هێزەکان کە لە بونەوەردا هەن.

٩. وە نابێ ئایەتەکان با بدەین بۆ ئەوەی لە گەڵ بابەتە زانستیەکان بێتەوە، بەڵکو دەبێ وەک خۆی تەفسیری بکەین.



## جۆرەکانی موعجیزە

### ١. ئیعجازی روحي(الاعجاز الروحي)

مەبەست لەئیعجازی روحی یان دەرونی ئەو دەسەڵات و تواناو کاریگەریەیە کە قورئان هەیەتی لە سەر ناخ و دەرونی مرۆڤەکان بە درێژایی مێژو کە هەزاران و سەدان هەزارو ملیونان نمونەمان هەیە کە بە قورئان کاریگەر بون و زۆربەیان مسوڵمانبون، نمونەی مسوڵمانبونی عومەری کوڕی خەتان عیملاقی ئیسلام یەکێک بوە لەو نمونانە کە کاتێک لە ماڵی زاواکەی دوای ئەوەی کە ڕویدا لە نێوان خۆیی و زاواکەیی و خوشکەکەی وتم قورئانم بۆ بێنن کاتێک سەرەتای سورەتی (طه) یان بۆ هێناو خوێندیەوە یەکسەر بڕیاری مسوڵمانبونی دا...

### ٢. ئیعجازی ژیری (الاعجاز العقلی)

مەبەستمان لە ئیعجازی ژیری لە کتابی خوای کار لەجێ ئەوەیە کە هیچ شتێک نیە کە ژیری تەواو کامڵ پەسندی بکات قورئان ڕەتی بکاتەوە، بەڵکو قورئان بەردەوام هانماندەدا بۆ تێڕامان و بیرکردنەوەو بەدوواداچون و پەندوەرگرتن و ژیری بەکارهێنان وەک لەو ئایەتانەدا دەردەکەوێ:

- ❖ كِتَٰبٌ أَنزَلۡنَٰهُ إِلَيۡكَ مُبَٰرَكٞ لِّيَدَّبَّرُوٓاْ ءَايَٰتِهِۦ وَلِيَتَذَكَّرَ أُوْلُواْ ٱلۡأَلۡبَٰبِ (ص: ﴿٢٩﴾) ئەم قورئانە کتێبێکی پیرۆزە ناردوومانەتە خوارەوە بۆتۆ بۆ ئەوەی بیر بکەنەوە لەئایەتەکانی وە خاوەنانی بیرو ژیری پەندی لێ وەربگرن.
- ❖ أَفَمَن يَعۡلَمُ أَنَّمَآ أُنزِلَ إِلَيۡكَ مِن رَّبِّكَ ٱلۡحَقُّ كَمَنۡ هُوَ أَعۡمَىٰٓۚ إِنَّمَا يَتَذَكَّرُ أُوْلُواْ ٱلۡأَلۡبَٰبِ (الرعد: ﴿١٩﴾) جا ئایا کەسێك کە بزانێ بەڕاستی ئەوەی نێرراوەتە خوار بۆ تۆ لەلایەن پەروەردگارتەوە حەق و ڕاستە وەك ئەو کەسەیە کە کوێر بێت بێگومان هەر ئەوانە بیر دەکەنەوە کە خاوەنی ژیرین.



- وَتِلْكَ ٱلْأَمْثَٰلُ نَضْرِبُهَا لِلنَّاسِ وَمَا يَعْقِلُهَآ إِلَّا ٱلْعَٰلِمُونَ (العنكبوت: ٤٣) ئەو وێنەو نموونانە بۆ خەڵکی دێنینەوە تەنها زانایان لەوانە تێدەگەن.
- وَيَرَى ٱلَّذِينَ أُوتُوا۟ ٱلْعِلْمَ ٱلَّذِىٓ أُنزِلَ إِلَيْكَ مِن رَّبِّكَ هُوَ ٱلْحَقَّ وَيَهْدِىٓ إِلَىٰ صِرَٰطِ ٱلْعَزِيزِ ٱلْحَمِيدِ (سبأ: ٦) ئەوانە زانیاریان پێ دراوە دەزانن ئەوەی لە پەروەردگارتەوە بۆت هاتووە تەنها ئەوە ڕاستە و ڕێنموونی (خەڵك) دەكات بۆ ڕێگای خوای زاڵی ستایش کراو.

وە نمونەی لەوجۆرە لە قورئانی پیرۆزدا زۆرە، وە هەرەشە کراوە لەوانەی کە ژیریان بەکارناهێنن، وە هیچ حوکمێک نیە لە قورئان کە سەحیح و سەریح بێ قورئان ڕەتی بکاتەوەو دژایەتی بکا، ئەبی عیززی حەنەفەی کە ڕاڤەی عەقیدەی تەحاوی کردوە دەڵێ: شەریعەت شتێک ناهێنێ ژیری بڵێ مەحاڵە، بەڵام شتانێک دێنێ ژیری تێیدا سەرگەردانە، وە بەدرێژایی مێژوو ئەوانەی زۆر لە خزمەت قورئانی پیرۆز دابون لە ژیریدا عیملاق و نمونە بون، ئیبن تەیمیەش دەڵێ : هیچ شتێک بە قەدەر قورئان ژیری و دڵ تێر ناکا.

### ٣. ئیعجازی زمانەوانی (الاعجاز اللغوی)

مەبەستمان لە ئیعجازی زمانەوانی ئەوەیە کە قورئانی پیرۆز هەر وشەیەکی بەکار هێنابێ تەواو لە جێی خۆیدایەو وشەیەکی تر جێگای ناگرێتەوە، ئەم یاسایە بۆ هەموو وشەکانی قورئان ڕاستە بەڵام یەک وشە باس دەکەین بۆ نمونە ئەوەش وشەی (علق) ە بۆیە ئەم وشەیە باسدەکەین چونکە مولحیدەکان زۆر قسەیان لەسەرکردوەو ویستویانە ڕەخنەی زانستی پێ لە قورئان بگرن، بەڵام دەردەکەوێ کەراستی هاوەڵ و هاوڕێیان نیە لەو ئامانجەیان.

ئەگەر بگەڕێنەوە بۆ تەفسیرەکان، وە بۆ قاموسەکان دەر دەکەوێ کە ئەم وشەیە چەند قوڵە بە پێی ئەوەش کە زانستی سەردەم بۆمان ڕووندەکاتەوە.

وشەی(علق) لە تەفسیرەکاندا:





1. جامع البيان/ للطبري: له ته فسيری وشه‌ی علق وتویه‌تی: من الدم واته له خوێن.
2. مفاتيح الغيب / للإمام الرازی: على الجمع لأن الانسان فی معنى الجمع: واته وشه‌ی (علق) کۆیه له‌به‌ر ئه‌وه‌ی مرۆڤ ناوی کۆیه بۆ هه‌موو مرۆڤه‌کان، واته هیچ رونکردنه‌وه‌یه‌ک له سه‌ر (علق) نادا لێره به‌ڵام له سوره‌تی (الحج) دا وتویه‌تی ( العلقة قطعة الدم الجامدة) واته علقة واته پارچه خوێنێکی مه‌یوو.
3. توح المعانی/ الآلوسی: أی قطعة من دم جامدة متكونة من المنی: واته پارچه خوێنێکی مه‌یوو دروستبو له سپێرم.
4. التحرير والتنوير؟ لإبن عاشور: اسم جمع علقة، وهي قطعة قدر الانملة من الدم الغليظ الجامد الباقی رطبا لم يجف ، سمي بذلک تشبيها لها بدودة صغيرة تسمى علقة، وهي حمراء داكنة تكون فی المياه الحلوة، تمتص الدم من الحيوان إذا علق خرطومها بجلده وقد تدخل الى فم الدابة وخاصة الخيل والبغال فتعلق بلهايه ولا يتفطن لها. واته ناوی کۆی وشه‌ی علقة یه، پارچه‌یه‌که به ئه‌ندازه‌ی سه‌ره په‌نجه‌یه‌ک، له خوێنی خه‌ستی مه‌یوو که به ته‌ڕی ده‌مێنێته‌وه و وشک نه‌بۆته‌وه، بۆچی پێی وتراوه علقة واته خۆ هه‌ڵواسه‌ر له به‌ر ئه‌وه‌ی وه کرمێکی بچوکی زه‌رو ده‌چێ، وه سورێکی تۆخه له ئاوه شیرنه‌کاندایه، خوێن له زینده‌وه‌ران ده‌مژێ، کاتێک به لوتی و ده‌وی خۆی هه‌ڵده‌واسێ به پێستی ئاژه‌ڵه‌کان، وه ده‌چێته ناو ده‌می ئاژه‌ڵه‌کان به تایبه‌ت ئه‌سپ و ئێستر، خۆی به لێوو پوکی هه‌ڵده‌واسێ ئه‌ویش هه‌ستی پێناکا.
5. مفردات ألفاظ القرآن/ للراغب الاصفهاني :العلق التشبث بالشئ: ده‌ست گرتن به شتێک وه‌ک ئه‌وه‌ی نێچیرێک بکه‌وێته داو،... والعلق: دود يتعلق بالحلق، کرمێکه به قورگه‌وه ده‌نوسێ، والعلق: الدم الجامد: خوێنپاره.





6. کەواتە تەفسیرەکان دڵنیایی دەدەن لە سەر ئەوەی کە (علق) خوێنە، بەڵام ئەو ڕونکردنەوەی ئیبن عاشور زۆر جوان و زانستیە، وە وتەی ئەوانی تریش پێچەوانەی زانست نیە چونکە علق لە قۆناغی خوێنبون دایە بەڵام خوێنێک لە شێوەی زەرو ، وە سور کە خۆی هەڵدەواسێ بە دیواری ڕەحم.

**وشەی(علق ) لە ڕوی زمانەوانیەوە:**

ئەگەر بگەڕێینەوە بۆ مانای وشی علق لە فەرهەنگ و موعجەمەکانی عەرەبی دەبینین کە علق بە زۆر مانا دێ کە تێدەپەڕێ لە ٣٠ مانا لەوانە:

1. لکان بە شتێکەوە
2. خۆ پێ هەڵواسین
3. دڵپەیوەستبون بە شتێک
4. شت بە خۆ هەڵواسین
5. مارەیی
6. ئافرەتی تاڵۆق کراو
7. کرمێکە خوێن دەمژێ
8. مەی
9. لێدان
10. ڕوەکێکە خۆی بەدار هەڵدەواسێ
11. وەرگرتن و گرتنی شتێک
12. لەبەری کردو لە مێشکی خۆی پاراستی
13. زانینی شتێک
14. خۆشەویستیەک کە تەواو لە دڵدا جێگیر دەبێ
15. قازی حوکمەکە دواخست
16. دامەزراندن و بەستنەوەی دەرگا
17. شتێک نەکەی و تەواویشی نەکەی





18. جوێندان بە نەیارو ناحەز
19. پەنجە لێستنەوە
20. پەنجە مژین
21. لە قورگی ماو گیربو جا ئاوبێ یان خواردن
22. درەختێکە بۆ خۆشکردنی پێستە
23. شتی بە قیمەت
24. بەرگێک کە کوندەبێ
25. مەیلکردن بۆ شتێک
26. کەسێک قوڕ بە دەستی وەنوسابێ
27. زۆربەی ڕێگا
28. پەیوەندی
29. ئەوەی کە لەسەر حاشیەی کتاب دەنوسرێ
30. وە ناوی سورەتێکە لە قوڕئانی پیرۆز

وە بە زۆر مانای تریش هاتوە بەڵام ئەوەی تێبینی دەکرێ وشەی (علق) زیاتر هەڵواسین و پێوە لکانە کە ئەمەش لە گەڵ دەقی ئایەتەکە ڕێکە چونکە ئەوکات ئەو مەنیە دەبێتە علقة کە خۆی هەڵدەواسێ بە دیواری ڕەحەمدا.

**علق لە بواری زانستیەوە:**

دکتۆر ئیبراهیم خەلیل لە کتابێکدا بە ناوی ( لماذا أسلم صديقى) هاوڕێ بێباوەڕەکەم بۆچی مسوڵمانبو؟ دەڵێ هاوڕێ یەکی مەسیحیم هەبوو کە کتابێکی نوسی وتی (إنتهت تحديات القرآن) تەحەدای قوڕئان کۆتایی پێهات،

ئەم دکتۆرە نامەیەکی نوری دوو هەزار نوسخەی لێگرتەوەو ناردی بۆ دوو هەزار ناوەندو دەزگاو زاناو کەنیسە ئەوانەی کە لە زمانی عەرەبی شارەزان و لێکۆڵینەوەیان لەسەر ئیسلام هەیە، داوای لێکردن کە قوڕئان تەحەدای مرۆڤایەتی دەکا بە سورەتێکی پازدە وشەیی کە سورەتی { الکوثر] ە لە ڕابردوو





ئێستاوو داهاتو تکایە وەڵامم بدەنەوەو کۆتایی بەم تەحەدایە بێنن، ئەم دکتۆرە مەسیحیە لە میانەی ساڵێکدا چوار جار ناردنی ئەم نامەیەی دووبارە کردوە، لە ٨٠٠٠ هەزار نامە کە وەڵامیان دابۆیە تەنیا پاساوو بیانویان هێنابۆوە کە داوای لێبوردن دەکەین بەڵام بیانوەکانیان زۆر لاواز بو ئەم ڕووداوە لە ساڵی ١٩٩٠ ڕوویدابو، دواتر ئەو دکتۆرە مەسیحیە بڕیاری دا کە مسوڵمانبێ لەدوای ئەوەی کە زانی تەحەدای قورئان بێ وەڵامە.

ئەگەر باسی کۆرپەلە زانی بکرێ قۆناغ بە قۆناغ ڕێک موتابیقی ئەوەیە کە قورئان بادی کردوە، کە پێک دێ لە چەند قۆناغێک هەر لە دڵۆپە ئاوێک کە سپێرمی پیاوە کە دەرژێتە ناو رەحمی ئافرەت ، لە گەڵ هێلکەی ئافرەت لێک دەداو تێکەڵ دەبێ و دواتر خۆی بە دیواری ڕەحم هەڵداوەسێ دەبێتە پارچە خوێنێکی سوری تۆخ  لە شێوەی کردمی زەرو ئەوجار دەبێتە پارچە گۆشتێکی وەک بنێشتی جوراو بە قۆناغی ناتەواو تەواودا تێدەپەڕێ، پاشان دەبێتە کڕکڕاگە کە سەرەتای بە ئێسک بونەو دواتر گۆشت لە ئێسکەکان دەهاڵێ دەبێتە خاوەنی هەموو ئەندامەکان و ئامادەیە بۆ گیان هاتە بەر، لە پاشان گیان بە بەردا دەکرێ و دەبێتە مرۆڤێکی تەواو ئامادە بۆ هاتنە ناو ژیانێکی نوێ کە ئەم دونیایەیە ئەگەر خوای گەورە بیهەوێ و لە بار نەچێ.

ئەوەی کە قورئان باسی دەکا ڕاسترینە دەر بارەی علقة و هەموو قۆناغەکانی تر، هەرچەندە بەشێک لە مولحیدەکان دەیانەوێ چەواشەکاری بکەن بەڵام پێشکەوتنی زانستی بە گشتی و زانستی پزیشکی هیچ بوارێکی بۆ ئەم چەواشەکاریانە نەهێشتۆتەوە، وە دکتۆرە مسوڵمانەکانیش لێکۆڵینەوەی جوانیان لەسەر ئەم بوارە کردوە کە هیچ دەرفەتێکیان بۆ ئیلحاد نە هێشتۆتەوە.





### ٤. ئیعجازی ڕەوانبێژی (الاعجاز البلاغي)

ڕەوانبێژی بوارێکی هەرە گرنگی ئیعجازی قوڕئانە، ئەگەر ئەم قوڕئانە پیرۆزە دابەزیوە عەرەب لە لوتکەی ڕەوانبێژیدا بوە لە شیعرو داڕشتن و چیرۆک و پیادا هەڵدان و وتارو ... وە شیعرە بە ناو بانگەکان بەدیواری کەعبەوە هەڵدەواسران، وە لە بازارەکان شوێنی تایبەت هەبوو بۆ شیعر خوێندنەوەو وتاردان، بۆیە ئەگەر ئەوکات بیانتوانیبا دژایەتی ئەم قوڕئانەیان کردباو وەڵامیان دابایەوە بێگومان وەڵامیان دەداوە، بەتایبەتیش مسوڵمانان لە سەرەتا هەر زۆر بێدەسەڵات بون و چەوسێنراوە بون، وە خودی پێغەمبەر بە ناوبانگ نەبوە بە شیعرو ڕەوانبێژی وەک ئەوانەی کە دیاربون لە ناو عەرەبەکاندا، وە هەرکەسێک هەڵەیەکی بکردبا لێیان لە هەڵا دەداو خۆیی و هۆزەکەی پێی دەشکا، من ناچمە ناو وردەکاری ڕەوانبێژی قوڕئانی پیرۆز بەڵام نمونەیەک لە ڕەخنەگری عەرەب باس دەکەم بۆ ئەوەی بۆمان ڕوونبێتەوە کە ئەوان چۆنبون لەو بوارەدا:

لَنا الجَفَناتُ الغُرُّ يَلمَعنَ بِالضُحى...

وَأَسيافُنا يَقطُرنَ مِن نَجدَةٍ دَما

وَلَدنا بَني العَنقاءِ وَابني مُحَـرِّقٍ...

فَأَكرِم بِنا خالاً وَأَكرِم بِنا اِبنَما

حەسان ویستی بەم شیعرە مەدحی خۆی و هۆزەکەی مناڵەکانی بکات بەڵام نابغە زۆر بەسادەی ڕەخنەی لێگرت لەکاتێکدا حەسان بە ناوبانگ بوو لە شیعر وتندا.

پێی وت وتت الجفنات ئەگەر وتبات الجفان باشتربوو چونکە جفنات جەمعی قیللەیە(جمع قلة)  واتا قاپ و دەفرەکانتان کەمبون کە نانتان پێداون بە خەڵک لە کاتێکدا تۆ دەتەوێ شانازی بکەی بە بەخشندەیی و سەخاوەت مەندیتان.





پێ وت ئەتۆ وتت الغر ، بەڵام وتبات البيض باشتر بو چونكە الغر ڕەنگی سپیە لە ناو ڕەنگی جیاوازی زۆردا کەواتە ئەوەی تۆ کەمیی گەیاند.

پێی وت تۆ وتت يلمعن بەڵام ئەگەر وتبات يبرقن باشتر بو چونكە ڕەنگدانەوەی زیاترە.

وتی تۆ وتت بالضحى بەڵام وتبات بالدجى باشتر بو چونكە هەموو شتێك لە ڕۆژدا ڕەنگ دەداتەوە بەڵام شتێك زۆر ڕوون و بریقەدار نەبێ لە شەودا ڕەنگ ناداتەوە.

وتی تۆ وتت أسيافنا بەڵام وتبان سيوفنا باشتر بو چونكە جەمعەو ئیزافە کراوە ئەوەش زۆری دەگەیەنێ بەڵکو مانا عام دەگەیەنێ بەڵام جەمعی تەکسیر ئەوە ناگەیەنێ.

وتت يقطرن بەڵام يجرين باشتر بو چونكە جەرەيان واتە لە بەر ڕۆیشتن و زۆری دەگەیەنێ بەڵام قەترە مانای کەمی دەگەیەنێ.

تۆ شانازیت کرد بە مناڵەکانت بەڵام شانازیت نەکرد بەوانەی کە تۆیان بە وەلەد هێناوە، چونکە دەبێ مناڵەکانتان مەدحی ئێوە بکەن، چونکە ئەوەی پێچەوانەی بنچینەی زانراوە کە خەڵک بە نەسەبی باب و باپیرانی شانازی دەکات نەوەک بە مناڵەکانی چونکە هی مناڵەکان دوا ڕۆژیان دیار نیە.

بۆیە دەبینی کە حەسان شاعیری گەورەو وە شاعیری پیغەمبەریش بوە بەڵام ڕەخنەی لێگیراوە، ئەی بۆ نەیانتوانی ڕەخنە لە قورئانی پیرۆز بگرن؟! دیارە ئەمە دەگەڕێتەوە بۆ هێزی ڕەوانبێژی قورئانی پیرۆز.

**٥. ئیعجازی ئوسلوبی(الاعجاز الاسلوبي)**

مەبەست لە ئیعجازی ئوسلوبی ئەوەیە دەبینی قورئانی پیرۆز بۆ هەر حاڵەتێک تەواو وێناکردنێکی جوانی بۆ هەیە بە هەڵبژاردنی وشەی گونجاو،





ڕستەی گونجاو، وەزن و ئاوازی گونجاو، وە ئەوپەری زانستی، وە لەو پەڕێ کاریگەریدا، بە گونجانی ئەو شوێنەی کە هەیەتی. عەرەب وتەنی: فبالمثال یتضح المقال، ئەگەر دوو ئایەت وەربگرین لە سورەتی النور کە وێنای ژیانی بێباوەڕانمان بۆ دەکا: وَٱلَّذِينَ كَفَرُوٓاْ أَعۡمَٰلُهُمۡ كَسَرَابِۭ بِقِيعَةٖ يَحۡسَبُهُ ٱلظَّمۡـَٔانُ مَآءً حَتَّىٰٓ إِذَا جَآءَهُۥ لَمۡ يَجِدۡهُ شَيۡـٔٗا وَوَجَدَ ٱللَّهَ عِندَهُۥ فَوَفَّىٰهُ حِسَابَهُۥۗ وَٱللَّهُ سَرِيعُ ٱلۡحِسَابِ ﴿٣٩﴾ النور وە ئەوانەی کە بێ بڕوان کردەوە (چاکە) کانیان وەك سەرابێك وایە (سەراب تیشکێکە کاتی زۆر گەرما لە بیاباندا وەك ئاو دێتە پێش چاو) لە بیابانێکدا (بریسکە بداتەوە) (کەسێکی) زۆر تینوو بە ئاوی دەزانێ (لە دوورەوە) (بەپەلە دەڕوات بۆی) کاتێ دەگاتە لای هیچ بەدی ناکات (لە قیامەت کافر) دەبینێ خوا ئامادەیە لە لایدا ئینجا خوا بە چاکی پاداشتی (کردەوەکانی) دەداتێ وە خوا بەپەلەو چەسپانە لە لێپرسینەوەدا.

خوای گەورە وێنای ژیانی کەسی بێباوەڕ دەکا بە کەسێکی سەرگەردان، تینوو، لە دەشتێکی فراوان و کاکی بە کاکی، لە ڕۆژێکی گەرمادا، لەبەر گەرما لە دوورەوە تەراویلکەی بۆ دەردەکەوێ وادەزانێ ئاوە بەڵام کە بۆی دەچێ بێجگە لە بۆشایی هیچی تر نابینێ و هیچیتری دەست ناکەوێ، وە دەستی بەهیچ کوێ ڕاناگا، وە هیچ هیوایەکی نامێنێ،

بۆیە بە واقعی بێباوەڕان پەنا دەبەن بۆ خۆکوشتن هەتا ئەگەر کێشەی ژیانیشیان نەبێ، چونکە ئامانجی ژیانیان لادیار نیە، سەرەتای بونیان نازانن، ئایندەیان لا ڕوون نیە، مردن لە پێشیانە، وە وێڕای ئەمانەش جاری وایە کەسەکە لە دونیا بە ئامانجەکانی ناگا، هەژارە، بە خۆشەویستەکەی ناگا، ئازیزەکەی لە دەست دەدا، بۆ هەموو ژیانی زیندانی دەکرێ، یان کەمئەندام دەبێ، یان نەخۆش دەکەوێ، یان پیرو بەساڵاچوو دەبێ، هەموو ئەوانە بۆ ئەو دەبنە تاریکی بەڵام بێباوەڕان نایانەوێ دان بەو ڕاستیانەدا بنێن، وە زۆریشیان دانی پێدا دەنێن، بە تایبەت کە مسوڵمان دەبن، هەر لە لەحزەی یەکەمی





مسوڵمانبونیان به کوڵدەگرین له خۆشیان چونکه بەس خۆیان دەزانن له چ گرفت و حاڵەتێکی دەرونی ناخۆشدا ژیاون، بۆیه به پێی داتاکان زۆرترین ڕێژەی خۆکوشتن له مولحیدەکاندایه، ئەوجار مەسیحیەکان، ئەوجار هیندۆسەکان، ئەوجار مسوڵمانەکان.

دواتر خوای گەوره باسی جۆرێکی تر یان حاڵەتێکی تر له بێباوەڕان دەکاو دەفەرموێ: أَوْ كَظُلُمَٰتٍ فِى بَحْرٍ لُّجِّىٍّ يَغْشَىٰهُ مَوْجٌ مِّن فَوْقِهِۦ مَوْجٌ مِّن فَوْقِهِۦ سَحَابٌ ظُلُمَٰتٌۢ بَعْضُهَا فَوْقَ بَعْضٍ إِذَآ أَخْرَجَ يَدَهُۥ لَمْ يَكَدْ يَرَىٰهَا وَمَن لَّمْ يَجْعَلِ ٱللَّهُ لَهُۥ نُورًا فَمَا لَهُۥ مِن نُّورٍ (النور: ٤٠) یا (کردەوەی بێ بڕوایان) وەك چەند تاریكییەك وایه له ناو دەریایەکی قوڵدا که شەپۆل لەسەر شەپۆل دایپۆشابێ لەسەر ئەو (شەپۆله) یشەوه هەورێکی ڕەشی (باراناوی) بێت تاریکیەکان نیشتبنه سەر یەکتری ئەگەر دەستی دەربێنێ نزیکه دەستی خۆی نەبینێت (لەبەر تاریکی) جا هەر کەس خوا نووری (ئیمانی) پێ نەبەخشیبێ ئەوەی ڕووناکی بێت نییەتی.

زانست پێمان دەڵێ له بن دەریاکانیش شەپۆل هەیه که دیاره ئەگەر کەسێک له بن دەریا بێ ناو دەریای قوڵ خۆی زۆر تاریکه تاوای لێدێ هیچ شتێک نابینێ، ئەوجار شەپۆلی بن دەریا، ئەوجار شەپۆلی ڕووی دەریا، ئەوجار تاریکی هەور، ئەوجار تاریکی باران، گومان لەوەدا نیه که ئەوە ئەوپەڕی سەرگەردانی و تاریکیه، ئەوجار به وشەی (أو) عەتف کراوەتەوه که ئەوەش چەندین مانای جیاواز دەگەیەنی:

یەکەم: یەکێک له واتایەکان ئەو عەتفه بۆ ئازادبونه له هەڵبژاردن، واته نمونه به هەرکامیان بێنیەوه هەر پێکاوتەو وێنای حاڵی بێباوەڕ دەکا.

دووەم: ئەو عەتفه بۆ تقسیم ه واته دابەشکاریه: واته قسمێکیان وەک سەرابەکه له دونیا، وه قسمێکیان وەک تاریکیەکانه له دوا ڕۆژ.





سێ یەم: بۆ تنويع ە واتە نەوعیکیان وەک سەرابە کە زاناکانن. جۆری دووەم وەک تاریکیەکانن کە نەزانەکانن.

چوارەم: جۆری یەکەم دوو ڕووەکانن کە پێ یان وایە بەو ئیمانە درۆینە ڕزگاریان دەبێ، جۆری دووەم ئەوانەن کە بڕوایان نیە لە چەندین تاریکیدان

**٥. ئیعجازی سروشتی( الاعجاز الفطري)**

مەبەستمان لە ئیعجازی فیتڕی سروشتی ئەوەیە کە هەموو داخوازیەکان و خۆزگەکانی دەرونی تێدایە، واتە مرۆڤ حەزی لە چی بێ قورئان نەک هەر مەنعی نەکردوە بەڵکو زۆری خەڵک بۆ هانداوە بە ڕێگای مەشروع و ڕێگا پێدراو بۆ نمونە:

١. غەریزەی بەندایەتی (نزعة التعبد): يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ ٱعْبُدُوا۟ رَبَّكُمُ ٱلَّذِى خَلَقَكُمْ وَٱلَّذِينَ مِن قَبْلِكُمْ لَعَلَّكُمْ تَتَّقُونَ (البقرة: ٢١) خەڵکینە بەندایەتی خاوەنیخۆتان بکەن ئەو زاتەی ئێوە و ئەوانەی پێش خۆتانی دروستکردتاکو خۆتان بپارێزن.

٢. غەریزەی فێربوون (نزعة التعلم): وَقُل رَّبِّ زِدْنِى عِلْمًا (طه: ١١٤).

٣. غەریزەی دادگەری(نزعة الشوق إلى العدالة): لَقَدْ أَرْسَلْنَا رُسُلَنَا بِٱلْبَيِّنَٰتِ وَأَنزَلْنَا مَعَهُمُ ٱلْكِتَٰبَ وَٱلْمِيزَانَ لِيَقُومَ ٱلنَّاسُ بِٱلْقِسْطِ وَأَنزَلْنَا ٱلْحَدِيدَ فِيهِ بَأْسٌ شَدِيدٌ وَمَنَٰفِعُ لِلنَّاسِ وَلِيَعْلَمَ ٱللَّهُ مَن يَنصُرُهُۥ وَرُسُلَهُۥ بِٱلْغَيْبِ إِنَّ ٱللَّهَ قَوِىٌّ عَزِيزٌ (الحديد: ٢٥) سوێند بەخوا بەڕاستی ئێمە پێغەمبەرانی خۆمانمان ناردووە بە بەڵگەو موعجیزەی ڕوونەوە وە کتێبی (ئاسمانی) و تەرازوی دادمان لەگەڵا ناردن بۆ ئەوەی خەڵکی بە دادگەری ڕەفتار بکەن (لەناو خۆیاندا) وە ئاسنمان دروست کرد کە ئەوەی هێزی بەتینی جەنگیی هەیە بەوە وە سوودێکی زۆری هەیە بۆ خەڵکی وەتا خوا دەری خات چ کەسێ یارمەتی (ئایینی) خواو پێغەمبەرانی دەدات کە پەنهانیشە بێگومان خوا بەهێزو دەسەڵاتە.





٤. حەزی جوانی (الاشتیاق الی الجمال والزینة): قُلْ مَنْ حَرَّمَ زِينَةَ ٱللَّهِ ٱلَّتِيٓ أَخْرَجَ لِعِبَادِهِۦ وَٱلطَّيِّبَٰتِ مِنَ ٱلرِّزْقِ قُلْ هِيَ لِلَّذِينَ ءَامَنُواْ فِي ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا خَالِصَةً يَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ كَذَٰلِكَ نُفَصِّلُ ٱلْءَايَٰتِ لِقَوْمٍ يَعْلَمُونَ (الأعراف: ٣٢) ئەی موحەممەد(صلی الله علیه وسلم) بڵێ کێ ئارایش و جوانی یە خواییەکانی حەرام کردووە کە خوا بۆ بەندەکانی دروستی کردووە هەروەها ڕۆزی و خۆراکە پاك و خۆشەکان(کێ حەرامی کردوون)، (ئەی موحەممەد(صلی الله علیه وسلم)) بڵێ ئەوانە بۆ بڕوادارانە لە ژیانی دنیادا(بێ بڕوایانیش لە پەنای ئەواندا بەشداری دەکەن) ، (بەڵام) لە ڕۆژی دوایی دا تایبەتە بە بڕوادارانەوە بەم شێوەیە ئایەتەکانمان باس دەکەین و ڕوونی دەکەینەوە بۆ گەل و کۆمەڵێك کە دەزانن و تێ دەگەن.

5 .غەریزەی خواردن و خواردنەوە(غریزة الاکل والشرب): وَكُلُواْ وَٱشْرَبُواْ وَلَا تُسْرِفُوٓاْ إِنَّهُۥ لَا يُحِبُّ ٱلْمُسْرِفِينَ (الأعراف: ٣١)

٦. غەریزەی خۆداپۆشین(غریزة ستر العورة): يَٰبَنِيٓ ءَادَمَ قَدْ أَنزَلْنَا عَلَيْكُمْ لِبَاسًا يُوَٰرِي سَوْءَٰتِكُمْ وَرِيشًا وَلِبَاسُ ٱلتَّقْوَىٰ ذَٰلِكَ خَيْرٌ ذَٰلِكَ مِنْ ءَايَٰتِ ٱللَّهِ لَعَلَّهُمْ يَذَّكَّرُونَ (الأعراف: ٢٦) ئەی نەوەی ئادەم بێگومان پۆشاکمان بۆ ناردوون کە عەیب و عەورەتتان دادەپۆشێ وە پۆشاکی جوان و ڕازاوەیش(مان بۆ ناردوون) بەڵام پۆشاکی ترسان لە خوا و پارێزگاری چاکتر و باشترە ئەوەی باسکرا هەندێکە لە بەڵگەو نیشانەکانی خوا بۆ ئەوەی بیربکەنەوە و ئامۆژگاری وەرگرن.

٧. غەریزەی جنسی سیکسی( الغریزة الجنسیة ): وَمِنْ ءَايَٰتِهِۦٓ أَنْ خَلَقَ لَكُم مِّنْ أَنفُسِكُمْ أَزْوَٰجًا لِّتَسْكُنُوٓاْ إِلَيْهَا وَجَعَلَ بَيْنَكُم مَّوَدَّةً وَرَحْمَةً إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَءَايَٰتٍ لِّقَوْمٍ يَتَفَكَّرُونَ (الروم: ٢١) وە لە نیشانەکان ئەوە (خوایە) کە بۆی دروست کردوون لە (ڕەگەزی) خۆتان هاوسەرانێك بۆ ئەوەی ئارام بگرن لە لایان دا وە





خۆشەویستی و بەزەیی خستۆتە نێوانتان بەڕاستی لەوەدا نیشانانێك هەیە بۆ کەسانێ کە بیر دەکەنەوە.

٨. حەزی خستنەوەی وەچە(غریزة حب امتداد النسل): وَٱللَّهُ جَعَلَ لَكُم مِّنْ أَنفُسِكُمْ أَزْوَٰجًا وَجَعَلَ لَكُم مِّنْ أَزْوَٰجِكُم بَنِينَ وَحَفَدَةً وَرَزَقَكُم مِّنَ ٱلطَّيِّبَٰتِ أَفَبِٱلْبَٰطِلِ يُؤْمِنُونَ وَبِنِعْمَتِ ٱللَّهِ هُمْ يَكْفُرُونَ (النحل: ٧٢) وە خوا لە ڕەگەزی خۆتان هاوسەری بۆ بەدی هێناون وە لە ژن و هاوسەرەکانتان کوڕو نەوەی بۆ فەراهەم هێناون وە ڕزق و ڕۆزی پاك و خۆشی پێداوون دەی ئایا ئەوان هەر بە بەتاڵ باوەڕ دێنن وە بە چاکەو نیعمەتانی سپڵەن (باوەڕ) ناهێنن.

٩. غەریزەی ماڵداری: حب لِّلرِّجَالِ نَصِيبٌ مِّمَّا تَرَكَ ٱلْوَٰلِدَانِ وَٱلْأَقْرَبُونَ وَلِلنِّسَآءِ نَصِيبٌ مِّمَّا تَرَكَ ٱلْوَٰلِدَانِ وَٱلْأَقْرَبُونَ مِمَّا قَلَّ مِنْهُ أَوْ كَثُرَ نَصِيبًا مَّفْرُوضًا (النساء: ٧) بۆ پیاوان هەیە بەشێک لە ئەو(میراتەی) بەجێ ی دێڵن دایک و باوک و خزمە نزیکەکان وە بۆ ئافرەتانیش هەیە بەشێک لە ئەو(میراتەی) بەجێ ی دێڵن دایک و باوک و خزمە نزیکەکان لە ئەوەی(بەجێ ی دێڵن) کەم بێت یان زۆر بەبەشێکی بڕیار دراو. وَلَا تَتَمَنَّوْاْ مَا فَضَّلَ ٱللَّهُ بِهِۦ بَعْضَكُمْ عَلَىٰ بَعْضٍ لِّلرِّجَالِ نَصِيبٌ مِّمَّا ٱكْتَسَبُواْ وَلِلنِّسَآءِ نَصِيبٌ مِّمَّا ٱكْتَسَبْنَ وَسْـَٔلُواْ ٱللَّهَ مِن فَضْلِهِۦٓ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ بِكُلِّ شَىْءٍ عَلِيمًا (النساء: ٣٢)

١٠. غەریزەی بەرگری لە خۆکردن(حب الدفاع عن الذات): فَمَنِ ٱعْتَدَىٰ عَلَيْكُمْ فَٱعْتَدُواْ عَلَيْهِ بِمِثْلِ مَا ٱعْتَدَىٰ عَلَيْكُمْ وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ وَٱعْلَمُوٓاْ أَنَّ ٱللَّهَ مَعَ ٱلْمُتَّقِينَ (البقرة: ١٩٤)

١١. غەریزەی حەزە دەرونیەکان (غريزة حب مشتهيات النفس): زُيِّنَ لِلنَّاسِ حُبُّ ٱلشَّهَوَٰتِ مِنَ ٱلنِّسَآءِ وَٱلْبَنِينَ وَٱلْقَنَٰطِيرِ ٱلْمُقَنطَرَةِ مِنَ ٱلذَّهَبِ وَٱلْفِضَّةِ وَٱلْخَيْلِ ٱلْمُسَوَّمَةِ





وَٱلْأَنْعَٰمِ وَٱلْحَرْثِ ذَٰلِكَ مَتَٰعُ ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا وَٱللَّهُ عِندَهُۥ حُسْنُ ٱلْمَـَٔابِ (آل عمران: ﴿١٤﴾) جوان کراوە بۆ خەڵکی(دنیا پەرست) خۆشی و ئارەزوواتی نەفسی لە ئافرەتان و کوڕان و دارایی زۆری کەڵەکە کراو لە ئاڵتون و زێڕ و زیو و ئەسپ و مایینانی نیشانەدار (بەسپێتی ناوچەوان و هەر چوار پەلی) هەروەها ئاژەڵ و چوارپێ یان و کشتوکاڵ ئەمانە بەهرەو (کەل و پەل) ی زیندەگانیی(ژیان) ی دنیان وە لای خوا هەیە خۆشترین جێ ی پاشەڕۆژ.

١٢. حەزی ڕێز لێگیران(نزعة حب الكرامة الشخصية): وَلَقَدْ كَرَّمْنَا بَنِيٓ ءَادَمَ وَحَمَلْنَٰهُمْ فِي ٱلْبَرِّ وَٱلْبَحْرِ وَرَزَقْنَٰهُم مِّنَ ٱلطَّيِّبَٰتِ وَفَضَّلْنَٰهُمْ عَلَىٰ كَثِيرٍ مِّمَّنْ خَلَقْنَا تَفْضِيلًا (الإسراء: ﴿٧٠﴾) سوێند بەخوا بێگومان ڕێزمان لە نەوەی ئادەم گرت و لە وشکانی و لە دەریادا هەڵمان گرتن (بەسواری و گەڕانمانن) و ڕۆزی پاك و خاوێنمان پێ داون وە باومان داون بەسەر زۆرێك لەو شتانەی کە دروستمان کردوون بە باودانێکی گەورە.

١٣. حەزکردن بە ئازادی و هەڵبژاردن(نزعة الحرية والختيار): وَقُلِ ٱلْحَقُّ مِن رَّبِّكُمْ فَمَن شَآءَ فَلْيُؤْمِن وَمَن شَآءَ فَلْيَكْفُرْ إِنَّآ أَعْتَدْنَا لِلظَّٰلِمِينَ نَارًا أَحَاطَ بِهِمْ سُرَادِقُهَا وَإِن يَسْتَغِيثُوا۟ يُغَاثُوا۟ بِمَآءٍ كَٱلْمُهْلِ يَشْوِى ٱلْوُجُوهَ بِئْسَ ٱلشَّرَابُ وَسَآءَتْ مُرْتَفَقًا (الكهف: ﴿٢٩﴾) بڵێ حەق (ئەم قورئانە) لەلایەن پەروەردگارتانەوە هاتووە جا هەرکەسێ دەیەوێت با باوەڕبێنێ و هەرکەسیش دەیەوێت با کافر بێت بەڕاستی ئێمە ئامادەمان کردووە بۆ ستەمکاران ئاگرێك کە بڵێسەکەی (وەکو ڕەشماڵ) دەوریان دەدات وە ئەگەر (لە تینوانا) هاواری ئاو بکەن ئاوێکیان بۆ دەهێنرێ وەك مسی تواوە (یا وەك چڵك و چەپەڵی ڕۆن زەیت وایە) ڕوو دوم و چاوەکان دەبرژێنێ ئای چ خواردنەوەیەکی پیس و خراپە و ئای چ شوێن و جێگایەکی خراپە.





١٤. حەزهەبون بۆ پێشەنگ و گەورایەتی بۆ شوێنکەوتن(الشوق الى القدوة المثلى للإقتداء): لَّقَدْ كَانَ لَكُمْ فِي رَسُولِ ٱللَّهِ أُسْوَةٌ حَسَنَةٌ لِّمَن كَانَ يَرْجُواْ ٱللَّهَ وَٱلْيَوْمَ ٱلْءَاخِرَ وَذَكَرَ ٱللَّهَ كَثِيرًا (الأحزاب: ٢١) سوێند بەخوا بەڕاستی لە پێغەمبەری خوادا (صلى الله عليه وسلم) بۆ ئێوە هەیە سەرمەشقی و پێشەوایەتی چاك بۆ كەسێ بەهی

## ٦. ئیعجازی مێژوویی (الاعجاز التأريخي)

مەبەست لە ئیعجازی مێژوویی ئەو ڕوداوو بەسەرهاتانەن كە لە زوودا ڕویانداوە وە قوڕئان بە بێ هەڵەو كەم و كوڕی باسی كردون، جا ئەو مێژووە چ لەسەرەتای دروست بونی بونەوەرەوە بێ تا روداوو بەسەرهاتەكانی پێش دابەزینی قوڕئان.

جولەكەكان لە دەوروبەری مەدینە بون زۆر شارەزاییان لە ژیانی پێغەمبەرانی پێش خۆیان هەبوو لە ڕێی تەوراتەوە چونكە لە سفری تكوینەوە باس دەكا واتە دروست بونی بونەوەر تا زەمانی عیسا سەلامی خوای لەسەر بێ، قوڕئان لە ئادەمەوە باس دەكا باسی كورەكانی ئادەم، باسی نوح و ئیدریس و هودو سالح و شوعەیب و ئیبراهیم و لوت و ئیسحاق و ئیسماعیل و یەعقوب و یوسف و موساو داود و سولەیمان و ئەیوب و زەكەریاوو یەحیاو یونس ئیلیاس ... جولەكەكانن كە شارەزایی تەواویان لە ژیانی ئەو پێغەمبەرانەو كەسایەتی وەك لوقمان و هاوەڵانی ئەشكەوت و زیلقەرنەین و ... هەبوە بەڵام لە یەك شوێن نەیانتوانیوە بە قوڕئان بڵێن وا نیە ئەمە هەڵەیە، بۆیە من ناچمە ناو وردەكاریەكان هەر ئەوەندە كە موشریكەكان و جولەكەكان و گاورەكان لەسەردەمی پێغەمبەردا نەیانتوانیوە ڕووبەڕووی قوڕئان بنەوە گەورەترین بەڵگەی ئیعجازی مێژویی قوڕئانە، هەرچەندە هەندێك مولحیدو ڕۆژهەڵاتناس و قەشە ویستویانە بڵێن كە قوڕئان لە كتابی موقەدەس وەرگیراوە بەڵام بەڵگەی ناتەواوی و نازانستی ئەو وتەیە ئەوەیە كە لە كاتی خۆی جولەكەكان و مەسیح





و موشریکەکان جورئەتی ئەو قسەیان نەکردوە تەنیا موشریکەکان دەیانوت قسەی پێشینانە! بەڵام کام پێشینان ، چ سەردەمێک ، لە چ بوارێکەوە ئەمانە هیچیان دیار نین، دەی ئەگەر ڕاستدەکەن وتەی پێشینانە بائەوانیش هەڵیبەستن و دروستی کەن ئەگەر وایە.

**٧. ئیعجازی شوێنەواری(الاعجاز الاثري)**

مەبەست لە ئیعجازی شوێنەواری ئەو شوێنەوارانەن کە قورئان باسی کردون و زانستی شوێنەوار ناسیش پشتڕاستی دەکاتەوە.

قورئان هانماندەدا بۆ تێڕامان و وردبونەوە لە دروستکراوەکان.

قورئان هانماندەدا کە بەزەویدا بڕۆین ولێکۆڵینەوە بکەین.

قورئان هانماندەدا بچین ژیانی گەلان بخوێنینەوەو بزانین بۆچی و چۆن بەچی لە ناوچون.

قورئان چەندین نمونەی وە تۆفانی نوح و بەردبارانی قەومی لوت و شوێنەواری عادو سەمودو قەومەکانی ترمان بۆ باسدەکا، کە ئێستا ئەم شوێنەوارانە بەڕوونی دیارن لە وەلاتان .

**٨. ئیعجازی کاریگەری(الاعجاز التأثيري)**

مەبەست لە ئیعجازی کاریگەری ئەو شوێنەوارە زۆرو گرنگەیە کە قورئان دایدەنێ لەسەر خوێنەرەکەی، کە هەزاران کەس لە ڕێی دەنگ و ئاوازەکەیەوە کاریگەر دەبن ، زۆر کەس دەگریەن، زۆر کەس ئیماندەهێنن، ئەوە لە ژیانی هەر تاکێکدا دیارە کە قورئان دەخوێنێ، ئەوە کە قورئان لەسەر ئاستی جیهان دووەم دینە گەورەترین و دروسترین بەڵگەیە وێڕای ئەوەی دوای دینە ئاسمانیەکانی تر هاتوە، وە ئەوە کە یەکەم دینە لە ڕووی زوو بڵاو بونەوەدا هیچ بەڵگەی تری ناوێ.



### ٩. ئیعجازی ئیقاع و دەنگ(الاعجاز الایقاعي والصوتي)

قورئان ئیقاع و دەنگێگی تایبەتی هەیە جیا لە هەموو دەنگەکان، ڕاستە دەتوانی هەموو مەقامەکانی لەسەر جێبەجێ بکەی بەڵام بە شێوازی خۆی نەوەک وەکو ئەوەی لەسەر گۆرانیەکی کوردی یان عربی یان فارسی یان تورکی جێبەجێ دەکرێ، وە دەشتواني پابەند نەبی بە مەقامەکان چونکە هیچ مەرج نیە، وە هەندێک لە زانایان پێشیان باش نەبوە، بەڵام کە دەبینی کەسێک بۆ یەکەم جار گوێی لە قورئان دەبێ یەکسەر کەمەندکێش دەبێ و زۆر کاریگەر دەبێ، ڕاستە دەنگی خۆش بۆ هەموو کەس خۆشە وەک سەفا بەڵام کاریگەری قورئان دڵ دەجوڵێنێ و فرمێسک لە چاو دێنێ قورئانی پیرۆزیش لەو جۆرە مەشهەدەمان بۆ باس دەکا سەبارەت بە کۆمەڵێک مەسیحی کە سەردانی پێغەمبەریان کردوەو گوێیان لە قورئانی پیرۆز بوە کاریگەر بون و فرمێسکیان ڕشتوەو ئیمانیان هێناوە وەک دەفەرموێ: وَإِذَا سَمِعُواْ مَآ أُنزِلَ إِلَى ٱلرَّسُولِ تَرَىٰٓ أَعۡيُنَهُمۡ تَفِيضُ مِنَ ٱلدَّمۡعِ مِمَّا عَرَفُواْ مِنَ ٱلۡحَقِّۖ يَقُولُونَ رَبَّنَآ ءَامَنَّا فَٱكۡتُبۡنَا مَعَ ٱلشَّٰهِدِينَ (المائدة: ٨٣) هەر کاتێ گوێیان لێ بووایە ئەو قورئانەی کە نێراوەتە خوارەوە بۆ پێغەمبەر(صلی الله علیه وسلم) دەبینی چاوەکانیان لە فرمێسك (پڕدەبێ و) دەڕژێت لەبەر ئەو ڕاستی یەی کە زانیویانە(و بۆیان دەرکەوتوە) ئەڵێن ئەی پەروەردگارمان ئەوا ئێمە باوەڕمان هێنا دەتۆش لەگەڵ شایەت دەران ناومان بنوسە.

### ١٠. ئیعجازی زانستی(الاعجاز العلمی)

ئیعجازی زانستی هەموو بوارەکانی زانستی تەبیعی دەگرێتەوە، العلوم الطبیعیة آو العلوم البحتة: جا فەلەکی بێ، زیندەزانی بێ ، جیولۆجی بێ، پزیشکی بێ، ڕووەکناسی بێ ... کە چەند نمونەیەک باسدەکەین:



١. دووکەڵ: غاز ئەو ماددەیە بوە کە خوای گەورە بونەوەری لێ دروست کردوە: ثُمَّ ٱسْتَوَىٰٓ إِلَى ٱلسَّمَآءِ وَهِيَ دُخَانٌ فَقَالَ لَهَا وَلِلْأَرْضِ ٱئْتِيَا طَوْعًا أَوْ كَرْهًا قَالَتَآ أَتَيْنَا طَآئِعِينَ (فصلت: ﴿١١﴾) ئینجا ویستی ئاسمان ڕێک بخات و دروستی بکات لەکاتێکدا کە دوکەڵ بوو، جا بە ئاسمان و زەوی فەرموو: فەرمانبەردار و ملکەچ بن، بەخۆشی خۆتان یان بەزۆر بتانخەمە ژێر دەسەڵاتی خۆمەوە؟! هەردوولا خێرا وتیان: ملکەچی تۆین و چۆن دەفەرمویت وا دەکەین، (بێگومان کارێکی ئاسانە بۆ خوای بەدەسەڵات، زەوی و ئاسمان بێنێتە قسە، چونکە ئادەمیزاد جۆرەها ئامێری هێناوەتە قسە، دەم و زمان و لێویشیان نیە !!).

٢. زەوی بەشێک بوە لە ئاسمان لە پاشان جیابۆتەوە: أَوَلَمْ يَرَ ٱلَّذِينَ كَفَرُوٓاْ أَنَّ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ كَانَتَا رَتْقًا فَفَتَقْنَٰهُمَا وَجَعَلْنَا مِنَ ٱلْمَآءِ كُلَّ شَيْءٍ حَيٍّ أَفَلَا يُؤْمِنُونَ (الأنبياء: ﴿٣٠﴾) ئایا نەیان دی (نەیان زانیوە) ئەوانە بێ بڕوا بوون کە ئاسمانەکان و زەوی هەردووکیان پێکەوە لکابوو (یەك پارچە بوون) ئینجا لە یەکترمان جیاکردنەوە وە فەراهەممان هێنا لە ئاو هەموو شتێکی زیندوو دەی ئایا ئەوانە هەر باوەڕ ناهێنن ؟.

خوای گەورە لە باسی پێکەوە بون و جیابونەوەی زەوی لە گەردون باسی رەتق و فەتەق ی کردوە ( الرتق والفتق) کە ئەمەش جوانترین وەسفە بۆ پەیوەندی زەوی لەگەڵ گەردون، چونکە رتق ئەوەیە کە بەیەکەوە لکاو بون، ور فتق جیابونەوەیە بە بێ ئەوەی لە ناو مەجموعەی  ڕۆژ دەرچوبێ وەک نەخۆشی فتق کە جیا نابێتەوەو دوور ناکەوێتەوە، هەر چەندە زانیاریەکان زۆر وردنین دەربارەی ئەوەی بۆچی زەوی لە بەرامبەر گەردوندا باسکراوە بەڵام گومان لەوەدا نیە کە ڕۆژێک دێ زانیاری زۆر باشمان لەو بوارەدا دەستدەکەوێ.

٣. ئاماژە کردن بە هێزی کێشندە بە شێوەی گشتی کە گەردونی پێڕاوەستاوە وەک دەفەرموێ: ٱللَّهُ ٱلَّذِي رَفَعَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ بِغَيْرِ عَمَدٍ تَرَوْنَهَا ثُمَّ ٱسْتَوَىٰ عَلَى ٱلْعَرْشِ وَسَخَّرَ





ٱلشَّمۡسَ وَٱلۡقَمَرَ كُلّٞ يَجۡرِي لِأَجَلٖ مُّسَمّٗىۚ يُدَبِّرُ ٱلۡأَمۡرَ يُفَصِّلُ ٱلۡأٓيَٰتِ لَعَلَّكُم بِلِقَآءِ رَبِّكُمۡ تُوقِنُونَ (الرعد: ٢) ئەو خوایەی ئاسمانەکانی بەرز کردۆتەوە بێ هیچ پایەو ستونێك کە بیبینن پاشان ئەو (خوا) چووە سەر عەرش (بەو شێوەی شایستەی خوا بێت کە ئێمە چونێتیەکەی نازانین) وە خۆرو مانگی ڕام هێناوە هەریەکەیان دەگەڕێ تا کاتی دیاری کراو هەموو کاروبارێ هەڵدەسوڕێنێ و ئایەتەکان ڕوون دەکاتەوە بۆتان تا لە (زیندوو بوونەوەو ) گەیشتن بە خزمەت پەروەردگارتان دڵنیا بن.

هێزی کێشندە

هێزی کەهرۆموغناتیسی

هێزی ناوەکی گەورە

هێزی ناوەکی بچوک

زانست دەڵێ ئەم هێزانە هۆکاری ڕاوەستان و بەردەوام بونی گەردونن.

٤. ئاماژە کردن بە سوڕانەوەو دەورانی بەردەوامی مانگ و ڕۆژ و زەوی و گەردون: وَهُوَ ٱلَّذِي خَلَقَ ٱلَّيۡلَ وَٱلنَّهَارَ وَٱلشَّمۡسَ وَٱلۡقَمَرَۖ كُلّٞ فِي فَلَكٖ يَسۡبَحُونَ (الأنبياء: ٣٣) وە هەر ئەو (خوا) یە کە شەوو ڕۆژی دروست کردووە وە خۆرو مانگیش (ی دروست کردووە) هەریەك لەوان لە خولگەیەکدا دەسوڕێنەوە.

٥. ئاماژەکردن بە کێشندەیی زەوی وەک دەفەرموێ: أَلَمۡ نَجۡعَلِ ٱلۡأَرۡضَ كِفَاتًا (المرسلات: ٢٥) ئایا ئێمە زەویمان نەکردووە بەهۆکاری کۆ کردنەوە. کە دیارە کفات واتە بۆ یەک هاتنەوەو ڕاکێشان ئەو وەسفەش بەسەر هێزی کیشندەی زەویدا دەچەسپێ.





٦. گۆیی بونی زەوی: خَلَقَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ بِٱلْحَقِّ يُكَوِّرُ ٱلَّيْلَ عَلَى ٱلنَّهَارِ وَيُكَوِّرُ ٱلنَّهَارَ عَلَى ٱلَّيْلِ وَسَخَّرَ ٱلشَّمْسَ وَٱلْقَمَرَ كُلٌّ يَجْرِي لِأَجَلٍ مُّسَمًّى أَلَا هُوَ ٱلْعَزِيزُ ٱلْغَفَّٰرُ (الزمر: ٥) ئاسمانەکان و زەوی لەسەر بنچینەی حەق و ڕاستی دروست کردووە، بەشێوەی کەوانەیی شەو بەسەر ڕۆژدا دەهێنێت، بەهەمان شیوەی کەوانەیی ڕۆژیش بەسەر شەودا دەهێنێت (کە ئەمە خۆی بەڵگەیەکی قورئانیە لەسەر شێوازی خڕی زەوی)، ڕۆژو مانگیشی ڕام کردووە و ڕای هێناون (لە فەرمانی دەرناچن و لەخزمەتی ئادەمیزادان)، هەریەک لەوانە لە چەرخ و خولدان تا کاتیکی دیاریکراو، ئاگاداربن: هەرئەو خوایە زۆر بەدەسەلاتە (تۆڵە لە کافران دەسێنێت و لەدەستی دەرناچن) لێخۆشبووە (چاوپۆشی دەکات لە هەلەو کەم و کووڕی ئیمانداران).

٧. دابەشبونی شەوو ڕۆژ بە بەردەوامی بەسەر زەویدا: إِنَّمَا مَثَلُ ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا كَمَآءٍ أَنزَلْنَٰهُ مِنَ ٱلسَّمَآءِ فَٱخْتَلَطَ بِهِۦ نَبَاتُ ٱلْأَرْضِ مِمَّا يَأْكُلُ ٱلنَّاسُ وَٱلْأَنْعَٰمُ حَتَّىٰٓ إِذَآ أَخَذَتِ ٱلْأَرْضُ زُخْرُفَهَا وَٱزَّيَّنَتْ وَظَنَّ أَهْلُهَآ أَنَّهُمْ قَٰدِرُونَ عَلَيْهَآ أَتَىٰهَآ أَمْرُنَا لَيْلًا أَوْ نَهَارًا فَجَعَلْنَٰهَا حَصِيدًا كَأَن لَّمْ تَغْنَ بِٱلْأَمْسِ كَذَٰلِكَ نُفَصِّلُ ٱلْءَايَٰتِ لِقَوْمٍ يَتَفَكَّرُونَ (يونس: ٢٤) بێگومان وێنەی ژیانی دنیا وەك بارانێك وایە لە ئاسمانەوە باراندومانە جا بەهۆی ئەو (بارانەوە ڕوەکی زۆر ڕواوە و) تێکەڵ بووە و بەیەکدا چووە سەوزی و ڕوەکی زەوی لەوەی کە خەڵکی و ئاژەڵیش دەیخۆن هەتا کاتێ زەوی (بە سەوزی و ڕوەك) ڕەونەق و جوانی خۆی وەردەگرێ و خۆی دەڕازێنێتەوە دانیشتوان و خەڵکی ئەو (زەوی یە) وا دەزانن کە بەڕاستی ئەوان بە توانان بەسەر (دروێنە کردن) یدا (لە ناکاوێکدا) فەرمانی ئێمە بێت بۆ ئەو (زەوی و کشتوکاڵە) لەشەو یان لە ڕۆژدا ئینجا وەك دروێنە کراوی لێ بکەین وەك لەوەو پێش هەر نەبووبێت ئا بەوجۆرە ڕوونی دەکەینەوە ئایەت و بەڵگەو نیشانەکانمان بۆ گەلێ کە بیربکەنەوە.





دیارە خوای گەورە دەزانێ کاتێک فەرمانی دێ بە تیکچونی دونیا یان هاتنی سزا شەوە یان ڕۆژ ئەی بۆ دەفەرموێ شەو یان ڕۆژ. چونکە لەوکاتەدا هەم شەو هەیە هەم ڕۆژ.

٨. جوتي بنچینەیە لە گەردوندا وەک دەفەرموێ: سُبْحَٰنَ ٱلَّذِى خَلَقَ ٱلْأَزْوَٰجَ كُلَّهَا مِمَّا تُنۢبِتُ ٱلْأَرْضُ وَمِنْ أَنفُسِهِمْ وَمِمَّا لَا يَعْلَمُونَ (یس: ٣٦) بێگەردی بۆ ئەو زاتەی هەموو جووتەکانی دروستکردووە لە هەموو ئەوانەی زەوی ئەیڕوێنێ و لە خۆیان و لە هەرچیەک کە نایزانن.

لەوانەیە یەکێک بڵێ شتی وا هەیە جوت و نێرو مێی نیە، کەواتە قورئان بە هەڵەداچوە وشەی جوت لەقوڕئاندا بە سێ واتا هاتوە ، بە مانای جوت، بە مانای هاشێوە، بە مانای جۆر، کەواتە ئەگەر جوتیش نەبن ئەوە هاوشێوەو جۆرن.

گومان لەوەدا نیە لە قوڕئانی پیرۆزدا ئاماژەی زانستی زۆر هەیە من ئەوانەم بەس وەک نمونە باسکرد کە گومان لەوەدا نیە کە ئەم زانیاریانە لە توانی کەسێکی بیاباننشینی نەخوێندەوار نیە ئەگەر ئەم قوڕئانە وتەی پەروەردگار نەبێ.

**١١. ئیعجازی دەرونی(الاعجاز النفسي)**

ئیعجازی دەرونی بریتی یە لەو هەموو کاریگەریەیی قوڕئان لەسەر دەرونی مرۆڤ کە هەیبوەو هەیەتی بە درێژای مێژوو:

١. مرۆڤ بونەورێکی تایبەتە کە تەنیا لاشە نیە، وە تەنیا ڕووحیش نیە، وە تەنیا ژیریش نیە، وە تەنیا دەرون و دڵیش نیە بەڵکو مرۆڤ لە هەموو ئەوانە پێکدێ، بۆیە هەرکاتێک یەکێک لەوانە پشتگوێ بخا ژیانی لاتەڵ و ناتەواو دەبێ.





2 .دەرونی مرۆڤ قابلیەتی چاك و خراپەی هەیە: وَنَفْسٍ وَمَا سَوَّىٰهَا (الشمس: ٧) وە سوێند بە نەفس(ی ئادەمی) و ئەوەی ڕێک و پێک بەدیهێناوە.

فَأَلْهَمَهَا فُجُورَهَا وَتَقْوَىٰهَا (الشمس: ٨) ئینجا بە سرووشت ئاگاداری کرد بە بەدکاری و پارێزکاریی خۆی.

٣. کردەوەو ڕواڵەتی ئینسان ئاوێنەی دەرونیەتی مەگەر لە کاتی فێڵ لە خۆکردن و دووڕویدا نەبێ.

باوکمان کە ئادەمە بە چوار قوناغی گرنگدا تێپەڕیوە لە دوای دروستبونی:

یەک: قۆناغی فێرکردن: وَعَلَّمَ ءَادَمَ ٱلْأَسْمَآءَ كُلَّهَا ثُمَّ عَرَضَهُمْ عَلَى ٱلْمَلَٰٓئِكَةِ فَقَالَ أَنۢبِـُٔونِى بِأَسْمَآءِ هَٰٓؤُلَآءِ إِن كُنتُمْ صَٰدِقِينَ (البقرة: ٣١) ناوی هەموو شتێکی فێری ئادەم کرد، پاشان نیشانی فریشتەکانی داو فەرمووی: «ئێوە ناوی ئەم ˹هەموو˺ شتانەم پێ بڵێن گەر ڕاست ئەکەن«.

دوو: قۆناغی تەکریم و ڕێزلێگیران: وَإِذْ قُلْنَا لِلْمَلَٰٓئِكَةِ ٱسْجُدُوا۟ لِءَادَمَ فَسَجَدُوٓا۟ إِلَّآ إِبْلِيسَ أَبَىٰ وَٱسْتَكْبَرَ وَكَانَ مِنَ ٱلْكَٰفِرِينَ (البقرة: ٣٤) کاتێ بە فریشتەکانمان وت: «سوجدە بەرن بۆ ئادەم.» سوجدەیان برد، جگە لە ئیبلیس کە گوێی نەدا و خۆی بەگەورەزانی و لە ڕەتکەرەوەکان بوو.

سێ: قۆناغی نیشتەجێبون و ئارامگرتن: وَقُلْنَا يَٰٓـَٔادَمُ ٱسْكُنْ أَنتَ وَزَوْجُكَ ٱلْجَنَّةَ وَكُلَا مِنْهَا رَغَدًا حَيْثُ شِئْتُمَا وَلَا تَقْرَبَا هَٰذِهِ ٱلشَّجَرَةَ فَتَكُونَا مِنَ ٱلظَّٰلِمِينَ (البقرة: ٣٥) وتمان: «ئادەم، خۆت و هاوسەرەکەت لە باخەکە بژین و تیای بخۆن بەزۆری لەهەرکوێیەك حەز بکەن. بەڵام نزیکی ئەم درەختە مەکەون ئەگینا ستەمکار ئەبن«.





چوار : قۆناغی تاوانکردن و دابەزین: فَأَزَلَّهُمَا ٱلشَّيْطَٰنُ عَنْهَا فَأَخْرَجَهُمَا مِمَّا كَانَا فِيهِ وَقُلْنَا ٱهْبِطُواْ بَعْضُكُمْ لِبَعْضٍ عَدُوٌّ وَلَكُمْ فِى ٱلْأَرْضِ مُسْتَقَرٌّ وَمَتَٰعٌ إِلَىٰ حِينٍ (البقرة: ٣٦) بەڵام شەیتان هەڵی خەڵەتاندن و لەو شوێنە بەدەرکردنیدان کە لێی بوون، بۆیە پێمان وتن: «دابەزن! ئێوە دوژمنی یەکترن. لە زەوی شوێنی حەوانەوە و ڕابواردنتان ئەبێت تا ماوەیەك«.

پێنج: قۆناغی تەوبە وەرگیران و هەڵبژێردران: فَتَلَقَّىٰٓ ءَادَمُ مِن رَّبِّهِۦ كَلِمَٰتٍ فَتَابَ عَلَيْهِ إِنَّهُۥ هُوَ ٱلتَّوَّابُ ٱلرَّحِيمُ (البقرة: ٣٧) ئیتر ئادەم لەلایەن پەروەردگاریەوە چەند نزایەکی وەرگرت، ئەوسا لێی خۆشبوو. ئەو زاتەیە پەشیمانوەرگر و میهرەبان.

مرۆڤ دروستکراوێکی ناوازەو تایبەتە بە هەموو لایەنەکانی لاشەیی و ژیری و دەرونی کاریگەرە، هەر شتێک ژیری قەبوڵی بکا دڵ پێی ئارام دەبێ.

قوڕئان لە بەر ئەوەی بە تەواوی دڵ و ژیری تێر دەکا بۆیە زۆرترین کاریگەری لە سەر مرۆڤ هەیە.

مرۆڤەکان تا زیاتر پابەند بن بە قورئانەوە ژیریان فراوانترو دڵیان ئارامترو گوشادترە.

لە ماوەی کەمتر لە چل ساڵ ئەم دینە بە هەموو دونیا گەیشت و سەدان هەزار کەس پێشوازی لێکرد.

بەهەندێک لەو نمونانەی کاریگەری دەرونی قوڕئان باس بکەین لەوانە:

- ✓ پیاوێکی سەر سەختی وەک عومەری کوڕی خەتاب بە گوێگرتن لە چەند ئایەتێک داچڵەکاو بڕوای هێنا کە پێشتر ئاماژەمان پێکرد.
- ✓ بیرمەندی فەرەنسی فەنسای مۆنتای دەڵێ: بیری عەرەبی ئیسلامی کە دور بخرێتەوە لە کاریگەری قوڕئان وەک کەسێک وایە کە بە تاڵ کرابێ لە خوێنی.





- هوني كە ئافرەتێکە دراسەی فەلسەفەی تەواو کردوە دەڵێ: بڕوا ناکەم بە و کاریگەریە زۆرەی کە قوڕئانی لەسەر دڵمی بە جێهێشت، هەتا وای لێهات سورەتی سێهەمی قوڕئانم تەواو نەکرد لە لێکۆڵینەوە تا سوجدەم برد بۆ خاوەنی ئەو قوڕئانە، وە یەکەم نوێژم ئەنجامدا بۆ خوای گەورە.
- عامر علي داود کە مەسیحیەکی خەڵکی هیند بو دەڵێ نوسخەیەکی قوڕئانم دەست خست کە دەمزانی ئەو کتابە لای مسوڵمانان پیرۆزە، دەڵێ کە سورەتی بەقەرەم خوێندەوە لە ئایەتی ٣٠-٣٩ بەڕوونی لە واتای فەلسەفەی ژیان تێگەیشتم، ئەو بابەتەی کە فەیلەسوفەکان تێیدا سەرگەردانن، مەبەستی باسی ئادەم ە سەلامی خوای لەسەر بێ.

چەندین نوسین بە تایبەت و لە ناو کتابەکاندا باسی ئەو بابەتەیانکردوە بۆیە من زۆر درێژەی پێنادەم.

قوڕئانی پیرۆزیش هەندێک لەم حاڵەتانەمان بۆ باسدەکا سەبارەت بە کاریگەری قوڕئانی پیرۆز:

1 .إِنَّمَا ٱلۡمُؤۡمِنُونَ ٱلَّذِينَ إِذَا ذُكِرَ ٱللَّهُ وَجِلَتۡ قُلُوبُهُمۡ وَإِذَا تُلِيَتۡ عَلَيۡهِمۡ ءَايَٰتُهُۥ زَادَتۡهُمۡ إِيمَٰنًا وَعَلَىٰ رَبِّهِمۡ يَتَوَكَّلُونَ (الأنفال: ٢) بێگومان بڕواداران تەنها کەسانێکن کە کاتێك کەباسی خوا کراو ناوی هێنرا دڵیان دەترسێت و ترسی لێ دەنیشێت کاتێکیش ئایەتەکانی خوا بخوێنرێتەوە بەسەریاندا بڕوایان زیاد دەبێت و هەر پشت بە پەروەردگاری خۆیان دەبەستن.

2 .قُلۡ ءَامِنُواْ بِهِۦٓ أَوۡ لَا تُؤۡمِنُوٓاْۚ إِنَّ ٱلَّذِينَ أُوتُواْ ٱلۡعِلۡمَ مِن قَبۡلِهِۦٓ إِذَا يُتۡلَىٰ عَلَيۡهِمۡ يَخِرُّونَ لِلۡأَذۡقَانِ سُجَّدٗا (الإسراء: ١٠٧) ئەی (موحەممەد(صلى الله عليه وسلم)) پێیان بڵێ باوەڕ بێنن بەم (قورئانە) یان باوەڕ (ی پێ) نەهێنن بەڕاستی ئەوانەی کە





زانیارییان پێ بەخشراوە لەپێش ئەم (قورئانە) دا کاتێ (قورئان) بخوێنرێتەوە بەسەریاندا بەچەسپانی دەکەون بەڕوودا بەسوژدە بردن.

3 .أُوْلَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ أَنْعَمَ ٱللَّهُ عَلَيْهِم مِّنَ ٱلنَّبِيِّـۧنَ مِن ذُرِّيَّةِ ءَادَمَ وَمِمَّنْ حَمَلْنَا مَعَ نُوحٍ وَمِن ذُرِّيَّةِ إِبْرَٰهِيمَ وَإِسْرَٰٓءِيلَ وَمِمَّنْ هَدَيْنَا وَٱجْتَبَيْنَآ إِذَا تُتْلَىٰ عَلَيْهِمْ ءَايَٰتُ ٱلرَّحْمَٰنِ خَرُّواْ سُجَّدًا وَبُكِيًّا ۩ (مريم: ﴿٥٨﴾) ئەوانە (ی کە باس کران) کەسانێکن کەخوا نیعمەت و چاکەی خۆی ڕشت بەسەریاندا لەو پێغەمبەرانەی کە لەنەوەی ئادەمن (وەك ئیدریس) وە لە (نەوەی)ئەوانەش (کە لە کەشتییەکەدا) لەگەڵ نووح دا هەڵمان گرتن (وەك ئیبراهیم) وە لە نەوەی ئیبراهیم و یەعقوب (وەك ئیسماعیل و یوسف) وە ئەوانەی هیدایەتمان داون هەڵمان بژاردوون ئا ئەوانە هەر کاتێ ئایەتەکانی خوای بە بەزەییان بۆ بخوێنرێتەوە دەست بەجێ دەکەون بە ڕوودا بە سوژدە و گریانەوە.

4 .ٱللَّهُ نَزَّلَ أَحْسَنَ ٱلْحَدِيثِ كِتَٰبًا مُّتَشَٰبِهًا مَّثَانِيَ تَقْشَعِرُّ مِنْهُ جُلُودُ ٱلَّذِينَ يَخْشَوْنَ رَبَّهُمْ ثُمَّ تَلِينُ جُلُودُهُمْ وَقُلُوبُهُمْ إِلَىٰ ذِكْرِ ٱللَّهِ ذَٰلِكَ هُدَى ٱللَّهِ يَهْدِي بِهِۦ مَن يَشَآءُ وَمَن يُضْلِلِ ٱللَّهُ فَمَا لَهُۥ مِنْ هَادٍ (الزمر: ﴿٢٣﴾) خوا جوانترین فەرمایشتی ناردۆتە خوارەوە قورئانێکە (کە ئایەتەکانی) لە یەکچووی دووپات کراوەن ئەو کەسانەی لە پەروەردگاریان دەترسن پێستیان تەزووی پیادێ (بە بیستنی قورئان) پاشان پێستیان و دڵیان نەرم دەبێ بە یادی (قورئانی) خودا ئەو (قورئانە) ڕێنموونی خوایە بەو (قورئانە) ڕێنموونی هەر کەسێ دەکات کە بیەوێ هەر کەسیش خوا گومڕای بکات ئەوە ڕێنموونی کەرێك بۆ ئەو نی یە.

٥. وَإِذَا سَمِعُواْ مَآ أُنزِلَ إِلَى ٱلرَّسُولِ تَرَىٰٓ أَعْيُنَهُمْ تَفِيضُ مِنَ ٱلدَّمْعِ مِمَّا عَرَفُواْ مِنَ ٱلْحَقِّ يَقُولُونَ رَبَّنَآ ءَامَنَّا فَٱكْتُبْنَا مَعَ ٱلشَّٰهِدِينَ (المائدة: ﴿٨٣﴾) هەر کاتێ گوێیان لێ بووایە ئەو قورئانەی کە نێراوەتە خوارەوە بۆ پێغەمبەر(صلی الله علیه وسلم) دەبینی





چاوەکانیان لە فرمێسك (پڕدەبێ و) دەڕژێت لەبەر ئەو ڕاستی یەی کە زانیویانە(و بۆیان دەرکەوتوە) ئەڵێن ئەی پەروەردگارمان ئەوا ئێمە باوەڕمان هێنا دەتۆش لەگەڵ شایەت دەران ناومان بنوسە.

لە کۆتاییدا دەڵێم بە درێژای چواردە سەدە کاریگەرترین کتاب قوڕئانی پیرۆز بوە وە کاریگەریەکەشی هەر بەردەوامە، هەر لە بەردەوامیدا دەمێنێتەوە.

**١٢. ئیعجازی قەوارەیی(الاعجاز الحجمي)**

مەبەستمان ئەوەیە ئەو قوڕئانە پیرۆزە بە قەوارە و حەجمە سنوردارەوە توانیویەتی ئەو هەموو زانست و کاریگەریە لە خۆی بگرێ:

- ✓ قوڕئان باس لە دونیا دەکا
- ✓ باس لە دوا ڕۆژ درکا
- ✓ باس لە ڕوح
- ✓ باس لە جەستە
- ✓ بیرو باوەر بە فراوانی
- ✓ بەندایەتی بەو پەری فەلسەفەوە
- ✓ ڕەوشت بەرزی لە لوتکەدا
- ✓ تەشریع زۆر بە قوڵی و وردی و واقعی
- ✓ حەزارەت
- ✓ هەموو مافەکان
- ✓ هەموو بوارەکانی زانست
- ✓ هەموو دینەکان
- ✓ باسی ئاشتی
- ✓ باسی جەنگ
- ✓ باس مرۆڤ
- ✓ باسی جنۆکە





- باسی فریشتە
- باسی جیهانی نادیار
- باسی جیهانی ماددە
- هاوسەنگی
- زانستە مرۆڤایەتیەکان
- مرونەت
- واقعی
- گشتی بوون
- فراوانی
- نمونەیی
- ئینسانی
- کەمال
- ڕابردو
- ئێستا
- داهاتو
- سازاندی دین و دونیا
- دونیاوو دواڕۆژ
- روح و لاشە
- پیاوو ئافرەت
- یاسایی کاتی خۆشی کاتی ناخۆشی
- کاتی دەسەڵات
- کاتی بێدەسەڵاتی
- پەیام بۆ ساغەکان
- پەیام بۆ پیران
- پەیام بۆ بیماران





- ✓ پەیام بۆ گەنجان
- ✓ تینووشکێنی فەیلە سوفە هەرەگەورەکان
- ✓ دەگونجێ بۆ هەرە سادەکان
- ✓ دادگەری
- ✓ ئیحسان زیاتر لە دادگەری
- ✓ کۆک لە گەڵ ژیری
- ✓ هەموو خاوەن فیکرو مەشرەبەکان سودی خۆیانی لێدەبینن
- ✓ حەجمێکی سنوردار
- ✓ بەئاسانی دەتوانی تێی بگەی
- ✓ دەتوانی لەبەری بکەی
- ✓ دەتوانێ جێبەجێی بکەی
- ✓ تا لێی نزیکتربی بەهرەمەندتر دەبی
- ✓ تا پارێزکارتربی زیاتر خۆییت بۆ والاّ دەکا
- ✓ پارێزەری مادی و مەعنەوییە
- ✓ شیفای مادی و مەعنەوییە
- ✓ پەیامە بۆ ژیان
- ✓ پەیامە بۆ ژینگە
- ✓ دەتبا بۆ سەرەتا دونیا بەڵکو بۆ پێش پەیدا بونی گەردون
- ✓ بۆ دوای تێکچونی گەردون
- ✓ بۆ ئاسمانەکان
- ✓ بۆ زەوی
- ✓ بۆ دەرون
- ✓ بۆ ڕووبەروو بونەوە
- ✓ بۆ تەحقیقی کەرامەت
- ✓ بۆ گفتووگۆ





- ✓ بۆ پێکەوەژیان
- ✓ بۆ سولح
- ✓ بۆ تاک
- ✓ بۆ خێزان
- ✓ بۆ کۆمەڵگای مرۆی
- ✓ بۆ دروستکردن و ڕێکخستنی پەیوەندی لە خوای گەورە
- ✓ لە گەڵ خەڵک
- ✓ لەگەڵ خۆت
- ✓ لە گەڵ خاک
- ✓ لە گەڵ جیهانی دیارو نادیار
- ✓ بەرز بونەوە تا ئاستی فریشتەو باڵاتر
- ✓ ناسندن بۆ هەموو شتێک
- ✓ هیوا بەخش لە بێزاری
- ✓ میهرەبانی نواندن لە دەسەڵاتداری
- ✓ دژایەتی کردنی ستەم
- ✓ دژی زیادەڕوی
- ✓ دژی بێڕێزی
- ✓ میهرەبابی لە گەڵ ئاژەڵان
- ✓ دژی خۆ پەرستی و خۆپەسندی
- ✓ باسی موعجیزە
- ✓ باسی فیراسەت و کەرامەت
- ✓ باسی یاساکان
- ✓ باسی دادگەری سروشتی
- ✓ یاسای سروشتی
- ✓ دادگەری خوایی





- ✓ دادگەری تەشریعی
- ✓ پەندوەرگرتن لە چاک و خراپ
- ✓ لەگەڵ چاکە دابون
- ✓ کرانەوە
- ✓ پێشکەوتن
- ✓ دیاری بەخشین
- ✓ دڵنەواوی لێقەوماوان
- ✓ مونافەسەی شەریفانە دژی تەمبەڵی بون
- ✓ دژی لاسایی کردنەوەی کوێرانە
- ✓ ناسینی جۆرەکانی مرۆڤ و سروشتیان
- ✓ ڕەچاوکردنی ئەولەوییەت

به کورتی ئیسلام سیستەمێکی تەواوی خودایی هەمەلایەنەی فراوانی خواییە بۆ دین و دونیاو و دونیاو دوارۆژ.

وە باخێکی پڕ سەمەری جوانی ژیانە ،کە ژیان خۆشدەکاو دەڕازێنێتەوە.

بەڵام نابێ ئەوەمان لە بیر بچێ کاتێک قوڕئان ئەو دەورە دەبینێ کە جوان تێی بگەین و جوان پیادەو وێنای بکەین و جوان بەرگری لێبکەین.

دەزانم زیاتر لەو خاڵانە هەیە کە باسی بکەین، وە دەکرێ ئەم خاڵانەش دوبارەو وێکچونیان تێدا بێ، وە دەکرێ بکوشرێن و بخرێنە پاڵ یەک، بەڵام زیاتر ئامانج ئەوەیە کە باس لەوە بکەین قوڕئانی پیرۆز بەو قەوارە سنورداره دەتوانرێ پێ بوترێ نەخشەی وجودو بون و بون ناسی.





## ١٣. ئیعجازی ژمارەیی (الاعجاز العددي)

دیارە بوارەکانی ئیعجاز لە قورئانی پیرۆزدا بە دەیان جۆرە، بەڵام یەکێک لەو بوارانەی کە زۆر بە زەقی دەبینرێ ئیعجازی ژمارەییە کە کتاب و لێکۆڵینەوەی زۆری لەسەر کراوە ئێمەش ئاماژە بە هەندێکی دەکەین.

بۆ نمونە با ژمارە حەوت ٧ وەر بگرین بزانین چی دەبینین لەو ژمارەیەدا، وە با بزانین دەکرێ ئەو ژمارەیە لە قورئاندا ببێتە موعجیزە؟:

١. ژمارەی ئاسمانەکان حەوتن ٧ وە سبع سماوات، والسماوات السبع حەوت جار لە قورئاندا هاتوە.

٢. ئەم ژمارەیە زۆرترین جار هاتوە لە قورئانی پیرۆزدا لە دوای ژمارە یەک ١، وە یەکەم ژمارە لە قورئاندا کە باسی کرابێ ژمارە حەوتە ٧ : هُوَ ٱلَّذِى خَلَقَ لَكُم مَّا فِى ٱلْأَرْضِ جَمِيعًا ثُمَّ ٱسْتَوَىٰٓ إِلَى ٱلسَّمَآءِ فَسَوَّىٰهُنَّ سَبْعَ سَمَٰوَٰتٍ وَهُوَ بِكُلِّ شَىْءٍ عَلِيمٌ (البقرة: ٢٩) ئەو زاتەیە هەرچی لە زەوی هەبێ هەمووی بۆ ئێوەی دروستکردووە، پاشان ڕوویکردە ئاسمان، ئەوسا بە حەوت ئاسمان ڕێکی خستن. ئەو بە هەموو شتێك زانایە.

٣. وە یەکەم سورەت کە فاتحەیە حەوت ٧ ئایەتە، وە ئەو پیتە ئەبجەدیانەی کە لەو سورەتەدا بەکار هاتوە ٢١ پیتە ئەمەش سێ قاتی ژمارە حەوتە ٧ واتە بەسەر ژمارە حەوتدا بە بێ مانەوە دابەش دەبێ.

٤. ئەم سورەتە ناوی(السبع المثانی). واتە ئەوەش ڕێکە لە گەڵ ژمارە حەوت.

وشەی ( الله) کە لە ئەلف و لام و هاء ئەم سێ پیتە پێکهاتوە، ٤٩ جار لەو سورەتەدا دوبارە بۆتەوە کە بە بێ مانەوە بەسەر حەوتدا دابەشدەبێ ٧ *٧= ٤٩

٥. وە هەتا سورەتی ( النبأ) کە دواجار وشەی حەوتی تێدا بە کار هاتوە ژمارەی سورەتەکە ٧٧ حەفتاو حەوتە.





٦. یەکەم ئایەت کە ژمارەی حەوتی تێدا بەکارهاتوە تا کۆتا ئایەت کە ژمارەی حەوتی تێدا بەکارهاتوە٥٦٤٩ بە بێ مانەوە بەسەر حەوتدا ٧ دابەشدەبێ.

٧. ئەگەر لەو ژمارەی ئەو ئایەتە دەست پێبکەین کە یەکەم جار ژمارەی حەوتی تێدا هاتوە لە سورەرت ی بەقەرە تا کۆتای سورەتی النبأ کە کۆتا جار ژمارە حەوتی تێدا دەکاتە ٥٧٠٥ بە بێ مانەوە بەسەر ٧ حەوتا دابەش دەبێ .

با جارێکیتر سەیر بکەین لە وشەی الله کە یەکەم جار بە کار هاتوە لە بسم الله ی سورەتی فاتحە بەکار هاتوە، وە دواجار وشەی الله, لە الله الصمد بەکار هاتوە با بزانین چی تێدایە:

- سورەتی فاتحە تا سورەتی ئیخلاس دەکاتە ١١٢ کە دابەش دەبێ بەسەر حەوتدا.
- ئەگەر لە یەکەم ئایەتی قورئان تا کۆتایی سورەتی ئیخلاس تەماشا بکەین دەکاتە ٦٢٢٣ کە ئەو ژمارەیەش بێ مانەوە بەسەر حەوتدا دابەش دەبێ.
- ئەگەر بسم الله الرحمن الرحیم لە گەڵ ئایەتی الله الصمد کۆکەینەوە دەکاتە ٢٨ پیت کە بەسەر حەوتدا دابەش دەبێ بێ مانەوە.
- پیتەکانی ئەلف و لام هاء کە پێکهاتەی ناوی الله لە هەردووک سورەتەکە چواردە جار هاتوە کە بەسەر حەوتدا دابەش دەبێ بێ مانەوە.
- بسم ٣ الله ٤ الرحمن٦ الرحیم ٦ ئەگەر ڕیزیان کەین دەبێتە ٦٦٤٣ دیسان بێ مانەوە بەسەر حەوتدا دابەشدەبێ.
- ئاسمانەکان حەوتن
- دەرگاکانی دۆزەخ حەوتن





- پادشای میسر لە خەودا حەوت گای قەڵەوو حەوت گای سیسی دیتن لە گەڵ حەوت گوڵە گەنمی سەوزو حەوتی وشک، وە یوسف سەلامی خوای لێبێ چارەسەرەکەی بە حەوت ساڵ چاندنی بەردەوام دانا.
- هۆزی عاد بە سزایەک لە ناو چو کە حەوت شەوو هەشت ڕۆژی خایاند، لە زمانی عەرەبی کات بە شەو دەستپێدەکا، وە ئەسڵ لە گەردوندا تاریکییە.
- لە ژمارەی هاوەڵانی ئەشکەوت خوای گەورە پشتڕاستی حەوت دەکاتەوەو هەشتەمیان سەگەکەیان بوە.
- خوای گەورە کە دەیەوێ باسی زانستی خۆی بکا دەفەرموێ: وَلَوْ أَنَّمَا فِي ٱلْأَرْضِ مِن شَجَرَةٍ أَقْلَٰمٌ وَٱلْبَحْرُ يَمُدُّهُۥ مِنۢ بَعْدِهِۦ سَبْعَةُ أَبْحُرٍ مَّا نَفِدَتْ كَلِمَٰتُ ٱللَّهِ إِنَّ ٱللَّهَ عَزِيزٌ حَكِيمٌ (لقمان: ٢٧) بێگومان ئەگەر هەرچی درەخت لە زەوی دایە قەڵەم و پێنووس بێت هەموو دەریای زەوی ببێتە مرەکەب حەوت دەریای تر دوای ئەو(ەی باسکرا) ببێت بە مرەکەب وتە و زانراوەکانی خوا دوایی نایەن و تەواو نابن بەڕاستی خوا زاڵی کار دروستە.
- لە قوڕئاندا حەوت سورەت بە تسبیح بۆ خوای گەورە دەستی پێکردوە وەک سورەتی: الاسراء، الحديد، الحشر، الصف، الجمعة، التغابن، الاعلى.
- پیتەکانی زمانی عەرەبی ٢٨ پیتن کە بەسەر حەوتدا دابەشدەبێ.
- ئەو پیتانەی کە سەرەتای سورەتەکانی قوڕئانیان پێکراوەتەوە بە بێ دووبارە بونەوە ١٤ پیتە کە بەسەر ٧ دا دابەشدەبێ.
- قۆناغەکانی دروستبونی مناڵ حەوتن.
- خێری زۆر بە حەوت دەنکە گوڵ چوێنراوە.





**هەتا لە سونەتیشدا :**

- موبقات تاوانە بە هیلاک بەرەکان حەوتن.
- ئەوانەی دەکەونە ژێر سێبەری عەرشی خوا لە دوا ڕۆژدا حەوتن.
- کەسێک بایی بستێک ستەم بکا لە زەوی لە دوا ڕۆژدا بە ئەندازەی حەوت زەوی لە گەردن دەئاڵێنن.
- گەورەترین سورەت السبع المثانی فاتحەیە کە حەوت ئایەتی دووبارەیە.
- فاتحە لە حەوت ئایەت پێکدێ.
- لەسەر حەوت ئەندام کڕنۆش دەبەین.
- دەفرێک کە سەگ دەوی تێنا حەوت جار دەشۆردرێ.
- ئەگەر شوێنێک ئازاری هەبو ئەو دوعایەیی حەوت جار بەسەردا بخوێنی شیفایە بە ویستی خوا .
- هەر ڕەجمێک بۆ هەر یەکێک لە جەمەڕاتەکان حەوت جارە.
- ڕۆژەکانی هەفتە حەوتن.
- تەواف بە دەوری کەعبەدا حەوتە.
- هاتوچۆی نێوان سەفاو مەروە حەوتە.
- لەڕۆژی حەوتەمدا مەڕەمناڵە بۆ مندڵ دەکرێ.
- ژەهراوی نەبون و توش نەبون بە جادو.
- لە قوربانی کردندا وشترو مانگا بۆ حەوت نەفەر دەبێ.
- ئەو ڕۆژەی کە دەجال دەیەوێ بچێتە ناو مەدینە، مەدینە حەوت دەرگای هەن.





- ئەو ئاوانەی خۆیان پێ پاک دەکرێتەوە حەوتن.
- مناڵ لە حەوتساڵیدا پێی دەوترێ نوێژ بکا.
- الاحرف السبعة حەوتن.
- بەکارهێنانی حەوت دەنکە خورما بەیانیان لە خورێنی زۆر کاریگەرە بۆ سعر و ژەهراوی بوون.

**هەتا لە سروشت دا:**

- تەبەقەکانی زەوی حەوتن
- ڕۆژەکانی هەفتە حەوتن
- ڕەنگەکانی کۆلکە زێڕینە حەوتن
- گەردیلە کە یەکەی بنچینەییە بۆ پێکهاتنی گەردون حەوت تەبەقەی ئەلیکترۆنیە.
- کیشوەرەکانی دوونیا حەوتن.
- منال لە مانگی حەوتەمدا بە چاکی پێدەگاو ئەگەر لە دایکبێ دەژی.
- سەر سورهێنەرەکانی دونیا حەوتن.
- ژمارەی دەریاکان حەوتن.
- کانە سەرەکیەکان لە زەویدا حەوتن.





وە ئەوجار وشەی هەفتا کە داتاشراوە لە حەوت دیسان زۆر بەکار هاتوە لە قورئان و سونەتدا:

- ئەو زنجیرەی کە دۆزەخیەکانی پێ کەلەپچە دەکرێ ٧٠ گەزە.
- ئەو کەسانەی کە موسا هەڵی بژاردن بۆ ئەوەی تەورات وەربگرێ ٧٠ کەس بون.
- خوای گەورە دەربارەی دووڕوەکان دەفەرموێ ئەگەر هەفتا جاریش داوای لێبوردنیان لێبکا خوای گەورە لێیان خۆشنابێ: ٱسْتَغْفِرْ لَهُمْ أَوْ لَا تَسْتَغْفِرْ لَهُمْ إِن تَسْتَغْفِرْ لَهُمْ سَبْعِينَ مَرَّةً فَلَن يَغْفِرَ ٱللَّهُ لَهُمْ ذَٰلِكَ بِأَنَّهُمْ كَفَرُواْ بِٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦ وَٱللَّهُ لَا يَهْدِى ٱلْقَوْمَ ٱلْفَٰسِقِينَ (التوبة: ٨٠) ئەی موحەممەد(صلى الله عليه وسلم) داوای لێبوردنیان بۆ بکەیت یان داوای لێبوردنیان بۆ نەکەیت(یەکسانە) ئەگەر داوای لێبوردنیان بۆ بکەیت حەفتا جار ئەوە خوا هەرگیز لێیان نابورێ ئەوەش بەهۆی ئەوەیە بێگومان ئەوانە بێ باوەڕ بوون بە خواو پێغەمبەرەکەی وە خوا ڕێنموونیی خەڵکانی دەرچوو لە ئایین ناکات.
- ئەو ئاگرەی کە ئێمە پێی دەکەین بەشێکە لە هەفتا بەشی ئاگری دۆزەخ.
- کەسێک ڕۆژێ لە بەر خوا بەڕۆژو بێ خوای گەورە هەفتا ساڵ لە ئاگر دوری دەخاتەوە.
- ئەوانەی دەچنە بەهەشت لە ئومەتی موحەمەد علیه الصلاة والسلام ٧٠ هەزارن.
- ئەوانەی هەر ڕۆژێک تەوافی بەیت المعمور دەکەن ٧٠ هەزار فریشتەن.
- دۆزەخ ٧٠ هەزار زنجیری پێوە.
- لە گەڵ هەر زنجیرێکدا ٧٠ هەزار فریشتە ڕای دەکێشن.
- هەر بڕوادارێک بەیانیان یان ئێواران سەردانی نەخۆشێک بکا ٧٠ هەزار فریشتە دووعای بۆ دەکەن.





ئەم نەهێنیانە لە کتابە ئاسمانەکانی تریش هەن وەک تەورات و ئینجیل.

چەندین کتاب لەو بوارەدا نوسراوە من تەنیا ئاماژەم بە هەندێک شت کرد.

### ١٤. ئیعجازی تەشریعی (الاعجاز التشريعي)

مەبەست لە ئیعجازی تەشریعی ئەوەیە کە: هەموو کۆمەڵگای مرۆڤایەتی بە تاک و کۆمەڵەوە دەستەوستانن کە نمونەی ئەو حوکمانە بێنن کە پەیوەستن بە تاک کۆمەڵگاوە لە هەموو بوارەکانی ژیانەوە:

١. لە بواری بیرو باوەڕدا (العقيدة): هیچ دینێک ئەوەندە بە وردی باسی ئەو بوارەی نەکردوە، شەریعەت خاڵی لەسەر پیت داناوە، هەموو گومانەکانی ڕەواندۆتەوە، هەتا ناو دڵیشمان باس دەکا، حیسابی بۆ هەموو زروفەکانی ئاسایی و نائاسیی کردوە، باسی دونیاو دواڕۆژە، باسی دیارو نادیارە، باسی ئومەتان ژیارەکانی کردوە، باسی هەموو دینە باوو سەرەکیەکانی کردوە، باسی هەموو بیانوەکانی مرۆڤایەتی کردوە کە گرتویانە بەرامبەر پێغەمبەران و پیاوچاکان، باسی گەردونی کردوە پێش دروستبونی، وە دوای تێکچونیشی باسدەکا.

٢. بواری بەندایەتی(العبوديه ): بەندایەتیەکان لە نوێژو، ڕۆژوو، حەج، زەکات، قورئان خوێندن، قوربانی کردن، زیکر، دوعا... هەتا ئەوپەر خاوەنی فەلسەفەو کاریگەری زۆر گەورەن لە ژیانی مرۆڤایەتیدا، وە ئەوانەی وەک پێویست بەم پەرستشانە هەڵدەستن تەواو ژیانیان دەگۆڕێ و هاوسەنیان هەیە لە ژیانی تاکی و خێزانیاندا.

٣. بواری ڕەوشت (الاخلاق): ڕەوشت باخێکی تێر ئاو و پڕ سەمەرە کە هەموو میوەیەکی جوان و بە تامی تێدا لە پێداویستی مرۆڤایەیەتی، چ ئەو ڕەوشتانەی کە مرۆڤایەتی لەسەری کۆکن کەشەریعەت زیاتر و وردتر تەئکیدی لێدەکاتەوە، چ ئەو ڕەوشتانە کە باس نەکراون، وە چ ئەو ڕەوشتانەی کە دەبێ ڕەچاو بکرێن





لە کاتی خۆشی و ناخۆشی و جەنگ و ئاشتی و هەژاری و دەوڵەمەندی و دەسەڵاتداری و بێدەسەڵاتی و ئازادی و زیندانی و تۆمەت بۆ هەڵبەستران و تاوانکردن و نەخۆشی و ساغی و دروست کردنی خێزان و جیابونەوەو کاتی سەفەرو کاتی ئاسایی و کاتی غوربەت و کاتی لە ناو خزم و خوشی، کاتی خێزانداری و کاتی زگورتی و کاتی منداڵداری و کاتی بێ منداڵ و ...

وە هەموو هۆکارەکانی هاندان بۆ پابەندبون بە ڕەوشت باس دەکا لە دین، نەریت، یاسا، ویژدان و یاسای سروشتی لە گەڵ ئەمانەشدا دین لە هەموویان بە هێزترە.

وە بنچینە بۆ ئەو ڕەوشتە سیاسی و ئابوری و کۆمەڵاتی و میدیاییانە دادەنێ کە پێویستن بۆ ژیان، بە کورتی و پوختی لە بابەتی ڕەوشت و بەها باڵاکاندا خاڵی لە سەرپیت داناوە.

شەریعەت یان بە دەق، یان بە بنچینە تەواوی ژیانی مرۆڤایەتی ڕێکخستوەو ڕێکدەخا.

دەبینی لە شەریعەتدا هەندێک شت قەدەغە کراوە وەک گۆشتی بەراز، یان گۆشتی دڕندەکان، یان مەیی، یان شتە پیسەکان، یان زینا، یان ڕیبا، یان کوشتنی بە ناهەق، یان بوهتان، یان تریاک، یان خەڵک ترساندن، یان بە دوو کەوتنی عەیب و ناتەواوی خەڵک ... ئایا چ خێرک لەوانەدا هەیە بۆ نمونە گۆشتی بەراز کە سەرچاوەی دەیان نەخۆشیە، یان مەی کە بە ساڵانە ملیۆن و نیوێک خەڵک دەکوژێ، یان جگەرە کە ساڵانە شەش ملیۆن کەس دەکوژێ، یان مادە هۆشبەرەکان کە هەرەشە لە مرۆڤایەتی دەکەن، یان زینا کە نزیکەی بیست و پێنج جۆری سەرەتان توشی مرۆڤدەکا کە هۆکارەکەی زیناو لادانە جینسیەکانە شەریعەت قەدەغەی کردوە، قومار بۆ قەدەغەکراوە؟ دەبینی لە چەند دەقەیەکدا مرۆڤ مایەپوت و بێدەستمایە دەکا، دژایەتی دروست دەکا، هێرشکردنە سەریەک و یەکتر کوشتن و بریندارکردن دروستدەکا، بۆیە هیچ





شتێک نابینی کە شەریعەت قەدەغەی کردوە مەگەر چەندین حیکمەت و هۆکاری تێدایە.

باسی دەوڵەتداری، باسی ئابوری، سەربازی، میدیا، کۆمەڵایەتی، پەیوەندیەکان، مافەکان، ئازادی، دادگەری، گفتوگۆ جوانترین بنچینەی بۆ دانراوە،

ئەم شەریعەتە:

- ✓ خواییە: الربانية
- ✓ 2 .جیهانییە: العالمية
- ✓ 3 .کامڵە: الكمال
- ✓ 4 .گشتییە: العمومية
- ✓ 5 .نمونەییە: المثالية
- ✓ ئینسانییە: الانسانية
- ✓ واقعییە: الواقعية
- ✓ هەمە لایەنەیە: الشمولية
- ✓ مرونەتە: المرونة
- ✓ پاداشت و تۆڵەیە: الجزائية

وە لە میانەی زیاتر لە سێزدە سەدە جێبەجێ کراوە، وە ژیاری تایبەتی خۆی دروستکردوە، دونیایەک زانای لە بوارە جیاجیاکان پێشکەشی مرۆڤایەتی کردوە.

هەڵبەتە بواری تری ئیعجاز زۆرە کە باسی بکەین، بەڵام ئەو بابەتە تایبەت نیە بە باسی ئیعجاز ئەوەی کە لەسەری دوایین تەنیا بۆ ڕونکردنەوەیەکی کورت بوو لەو بوارەدا.



## مانای وەحی، وە ڕەواندنەوەی گومانەکان دەربارەی وەحی

گومان لەوەدا نیە کە سەرچاوەی دینە ئاسمانیەکان دەگەڕێتەوە بۆ سەرچاوەی وەحی، بۆیە ڕۆژهەڵتناسەکان و مولحیدەکان دەیانەوێ گومان لە سەر وەحی بروژێنن چونکە ئەگەر لەوەدا سەرکەوتوو بن ئەوە بەئاسانی دەتوانن گومان لە سەر هەموو شتەکانی تر پەیدا بکەن، وە هەتا گاورو جولەکەکانیش هەوڵیان داوە گومان لە سەر وەحی پەیدا بکەن هەر چەندە ئەوە زەرەدی خۆشیانە بەڵام زیاتر مەبەستیان ئەوە بوە گومان لە سەر قورئان و پێغەمبەرایەتی موحەمەد پەیدا بکەن علیه الصلاه والسلام، بۆیە ئەم تەوەرەیە بۆ ئەو بابەتە گرنگە تەرخان دەکەین لە چەند باسێکدا:

**یەکەم: وەحی چ دەگەیەنێ؟**

**(وحی ) بە چەند واتایەک هاتوە:**

١. مادەکانی وحی لە قورئانی پیرۆزدا ٧٠ جار هاتوەو وە بە واتای جیاواز هاتوە، وە ٦٠ جار زیاتر لە سورەتە مەکیەکاندا هاتوە، ئەمەش زۆر گونجاوە چونکە سەرەتایەک بوە بۆ گومانکردن لە قورئان، وە هاوبەش پەرستەکان هەموو هەوڵێکیان دەدا بۆ گومانکردن لە قورئان.

٢. (الاشاره السريعة)بە واتای ئاماژەی خێرا: فَخَرَجَ عَلَىٰ قَوْمِهِۦ مِنَ ٱلْمِحْرَابِ فَأَوْحَىٰٓ إِلَيْهِمْ أَن سَبِّحُوا۟ بُكْرَةً وَعَشِيًّا (مريم: ﴿١١﴾) پاشان زەکەریا لە پەرستگاکەی هاتە دەر بۆ ناو گەلەکەی جا بە ئیشارەت پێی وتن کە بەیانیان و ئێواران تەسبیحاتی خوا بکەن.

کەواتە ڕێنماییەکانی لە ئاماژەو ڕەمزبوە: قَالَ رَبِّ ٱجْعَل لِّىٓ ءَايَةً قَالَ ءَايَتُكَ أَلَّا تُكَلِّمَ ٱلنَّاسَ ثَلَٰثَةَ أَيَّامٍ إِلَّا رَمْزًا وَٱذْكُر رَّبَّكَ كَثِيرًا وَسَبِّحْ بِٱلْعَشِىِّ وَٱلْإِبْكَٰرِ (آل عمران:



﴿٤١﴾ زەکەریا وتی ئەی پەروەردگارم نیشانەیەکم بۆ دابنێ(خوا)فەرمووی: نیشانەکەت ئەوەیە کە ناتوانیت قسە لەگەڵ خەڵکیدابکەیت سێ ڕۆژ مەگەر بە ئاماژە (هێما)وە زۆر یادی پەروەردگارت بکە و تەسبیحاتی خوا بکە بە ئێواران و بەیانیان.

٣. الالهام الفطری للإنسان کما أوحی الی ام موسی: وَأَوْحَيْنَآ إِلَىٰٓ أُمِّ مُوسَىٰٓ أَنْ أَرْضِعِيهِ فَإِذَا خِفْتِ عَلَيْهِ فَأَلْقِيهِ فِي ٱلْيَمِّ وَلَا تَخَافِي وَلَا تَحْزَنِيٓ إِنَّا رَآدُّوهُ إِلَيْكِ وَجَاعِلُوهُ مِنَ ٱلْمُرْسَلِينَ (القصص: ﴿٧﴾) بە دایکی مووسامان ڕاگەیاند (خستمانە دڵی) کە شیر بدە بە مووسا ئینجا هەرکاتێ ترست لێی هەبوو ئەو کاتە بیخەرە ڕووبار (ی نیلە) وە مەترسە (لێ ی) و خەفەتیش مەخۆ (بۆی) بەڕاستی ئێمە دەیگێڕینەوە بۆلات وە دەیکەین بەیەکێ لە پێغەمبەران.

٤. الالهام الغریزی للحیوان: وەک خوای گەورە دەفەرموێ: وَأَوْحَىٰ رَبُّكَ إِلَى ٱلنَّحْلِ أَنِ ٱتَّخِذِي مِنَ ٱلْجِبَالِ بُيُوتًا وَمِنَ ٱلشَّجَرِ وَمِمَّا يَعْرِشُونَ (النحل: ﴿٦٨﴾) وە پەروەردگارت سرووش (ئیلهامی) کرد بۆ هەنگ کە لە چیاکاندا خانوو (بۆ خۆت) ساز بدە و لە (کونی) دارو درەختەکان لەو (شوێن) انەی کە خەڵکی دروستی دەکەن بۆی.

٥. وسوسة الشیطان: وَكَذَٰلِكَ جَعَلْنَا لِكُلِّ نَبِيٍّ عَدُوًّا شَيَٰطِينَ ٱلْإِنسِ وَٱلْجِنِّ يُوحِي بَعْضُهُمْ إِلَىٰ بَعْضٍ زُخْرُفَ ٱلْقَوْلِ غُرُورًا وَلَوْ شَآءَ رَبُّكَ مَا فَعَلُوهُ فَذَرْهُمْ وَمَا يَفْتَرُونَ (الأنعام: ﴿١١٢﴾) هەر بەو شێوەیە بۆ هەموو پێغەمبەرێك دوژمنێکمان داناوە لە شەیتانەکانی مرۆڤ و جنۆکە کە بە نهێنی بەیەکتری ڕادەگەیەنن وتەی ڕازاوە و بریقەدار بۆ فریودانیان وە ئەگەر پەروەردگارت بیویستایە ئەوەیان نەدەکرد دە لێیان گەڕێ بە خۆیان و ئەو درۆیانەوەی کە هەڵی دەبەستن.





٦. ما يلقيه الله الى الملائكة من أمر ليفعلوه: إِذْ يُوحِي رَبُّكَ إِلَى ٱلْمَلَٰٓئِكَةِ أَنِّي مَعَكُمْ فَثَبِّتُواْ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ سَأُلْقِي فِي قُلُوبِ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ ٱلرُّعْبَ فَٱضْرِبُواْ فَوْقَ ٱلْأَعْنَاقِ وَٱضْرِبُواْ مِنْهُمْ كُلَّ بَنَانٍ (الأنفال: ١٢) بێنەوە بیر کاتێك کە پەروەردگارت نیگای بۆ فریشتەکان نارد کە بێگومان من (خوا) لە گەڵتانم دەی دڵی کەسانێك قایم و دامەزراو کەن کە باوەڕیان هێناوە بە زوویی ترس و بیم دەخەمە دڵی ئەو کەسانەی کە بێ باوەڕ بوون جا ئێوەش لە سەرووی گەردنیان بدەن (واتە سەریان) وە لە هەموو سەر پەنجەکانیان بدەن واتە لە هەموو لاشەیان بدەن لە سەرەوە تا خوارەوە.

لە زاراوەی شەرعیدا بەم شێوەیە پێناسەی (وحی) کراوە:

أن يعلم الله تعالى، من اصطفاه من عباده كل ما أراد إطلاعه عليه من ألوان الهداية والعلم: ولكن بطريقة سرية خفية، غير معتادة للبشر.

واتە وەحی سروش، نیگا، ئەوەیە کە خوای بەرزو بالاٌ ئاگادار دەکاتەوە ئەو بەندەیەی کە بیەوێ و کە هەڵی بژاردوە لە جۆرەها ڕێنمای زانیاری، بە ڕێگایەکی نەهێنی، کە ئاسایی و سروشتی نیە بۆ مرۆڤ.

**وە ئەم وەحیە شەرعی و خودایيە جۆرەهایە لە وانە:**

١. وەحی ڕاستەوخۆ هەیە بێ ناوەندگیر وەک قسەکردنی خوا پێغەمبەران سەلامی خوایان لەسەر بێ وە خوای گەورە دەفەرموێ: وَرُسُلًا قَدْ قَصَصْنَٰهُمْ عَلَيْكَ مِن قَبْلُ وَرُسُلًا لَّمْ نَقْصُصْهُمْ عَلَيْكَ وَكَلَّمَ ٱللَّهُ مُوسَىٰ تَكْلِيمًا (النساء: ١٦٤)

یان وەک ئەوەی کە خوای گەورە لەگەڵ پێغەمبەر کردی لە شەوی شەورەوی و بەرزبونەوە: فَأَوْحَىٰٓ إِلَىٰ عَبْدِهِۦ مَآ أَوْحَىٰ (النجم: ١٠) ئینجا (خوا) سرووشی کرد بۆ بەندەی خۆی ئەوەی کە بۆی کرد.





وە وەک جۆری خەو بینین کە خوای گەورە خستویەتە خەونی پێغەمبەران: فَلَمَّا بَلَغَ مَعَهُ ٱلسَّعْىَ قَالَ يَٰبُنَىَّ إِنِّىٓ أَرَىٰ فِى ٱلْمَنَامِ أَنِّىٓ أَذْبَحُكَ فَٱنظُرْ مَاذَا تَرَىٰ قَالَ يَٰٓأَبَتِ ٱفْعَلْ مَا تُؤْمَرُ سَتَجِدُنِىٓ إِن شَآءَ ٱللَّهُ مِنَ ٱلصَّٰبِرِينَ (الصافات: ١٠٢) جا کاتێ ئەو(کوڕە گەورە بوو تا) گەشتە ئەوەی ئیش و کار بکات لەگەڵ (ئیبراهیم) دا، (ئیبراهیم) وتی ئەی کوڕە خۆشەویستەکەم بەڕاستی من لە خەودا دیم کە سەرت دەبڕم جا سەرنج بدە دەڵێ ی چی و ڕات چی یە؟ (کوڕەکە) وتی بابە گیان ئەوەی فەرمانت پێ دراوە بیکە دڵنیابە دەمبینی بە ویستی خوا لە خۆگران دەبم.

وە خوای گەورە خستیە خەوی پێغەمبەری ئیسلام علیه الصلاة والسلام: لَّقَدْ صَدَقَ ٱللَّهُ رَسُولَهُ ٱلرُّءْيَا بِٱلْحَقِّ لَتَدْخُلُنَّ ٱلْمَسْجِدَ ٱلْحَرَامَ إِن شَآءَ ٱللَّهُ ءَامِنِينَ مُحَلِّقِينَ رُءُوسَكُمْ وَمُقَصِّرِينَ لَا تَخَافُونَ فَعَلِمَ مَا لَمْ تَعْلَمُوا۟ فَجَعَلَ مِن دُونِ ذَٰلِكَ فَتْحًا قَرِيبًا (الفتح: ٢٧) سوێند بەخوا بێگومان خوا ئەو خەوەی پێغەمبەرەکەی دیبوی بەڕاستی گێڕاو هێنایەدی کە (ووتبوی) دڵنیابن دەچنە ناو کەعبەی پیرۆزەوە بە ویستی خوا بە ئارامی و بێ ترس سەرتان تاشیوە یان کورتان کردۆتەوە (لە دوژمن) ناترسن جا ئەوەی (خوا) دەیزانی ئێوە نەتان دەزانی (کە خێر لە ڕێکەوتن دایە) وە جگە لەوەی (چوونە مەککە) بڕیاری داوە سەرکەوتنێکی نزیك (بۆ ئێوەیە کە ڕێکەوتنی حودەیبیە) یە.

وە وەک ئەو ئیلهامانەی ڕاستەوخۆ خوای گەورە دەیخاتە دڵی پێغەمبەران .

وە وەحی هەیە بە واسیتەو ناوەندگیری.

٢. وەک ئەوەی کە فریشتەی وەحی دادەبەزێ بۆ سەر پێغەمبەرانە کە جبریلە وەک دەفەرموێ: عَلَّمَهُۥ شَدِيدُ ٱلْقُوَىٰ (النجم: ٥)جوبرەئیلی زۆر بەتوانا فێری کردووە. إِنَّهُۥ لَقَوْلُ رَسُولٍ كَرِيمٍ (التكوير: ١٩) بێگومان ئەو قورئانە گوفتاری ڕەوانەکراوێکی پایە بەرزە کە فریشتەی سرووشە. ذِى قُوَّةٍ عِندَ ذِى ٱلْعَرْشِ مَكِينٍ





(التكوير: ٢٠) بەهێزە، لای خاوەنی عەرش(خوای گەورە) ، خاوەن پایەیە. مُّطَاعٍ ثَمَّ أَمِينٍ (التكوير: ٢١) قسە ڕەوایە لەناو فریشتەدا، دەست پاکە.

یان وەک وەحی لە پشتی پەردە کە خوای گەورە دەفەرموێ: وَمَا كَانَ لِبَشَرٍ أَن يُكَلِّمَهُ ٱللَّهُ إِلَّا وَحْيًا أَوْ مِن وَرَآئِ حِجَابٍ أَوْ يُرْسِلَ رَسُولًا فَيُوحِىَ بِإِذْنِهِۦ مَا يَشَآءُ إِنَّهُۥ عَلِىٌّ حَكِيمٌ (الشورى: ٥١) بۆ هیچ کەس نەبووە کە خوا قسەی لەگەڵدا بکات مەگەر بە سرووش یان لە پشت پەردەوە یان نێرراوێك بنێرێت و بە فەرمانی خۆی ئەوەی کە بیەوێ سرووشی دەکات بەڕاستی خوا بڵندی کاردروستە.





## گومانەکان دەربارەی (وەحی) سروش نیگا

دیارە کۆمەڵێک گومان دەربارەی وەحی وروژێنراوە لە دیارترینیان ئەو گومانانە:

ئایا وەحی پێچەوانەی ژیرییە؟

ئەم پرسیارە بە نۆ خاڵ وەڵام دەدەینەوە:

١. دەوترێ: وەحی وەک داهێنانە زانستیەکان وایە، هەرکاتێک زانست شتێکی نوێ دابێنێ مرۆڤ سەرسام دەکا.

وەڵام : زانست هۆکارەکەی دیارە، بۆیە دوای دەرکەوتنی هۆکارەکەی سەرسام بوون بۆ مرۆڤ نامێنێ و لای کەسەکە ئاسایی دەبێتەوە، بەڵام وەحی هەر بە جێگەی سەرسوڕمان دەمێنێتەوە هەرچەندە زانست هاوکار دەبێ بۆ زوترو جوانتر تێگەیشتن لە وەحی.

لە زانستدا کەسەکان و سەردەمەکان دەگۆڕێن بەڵام لە وەحیدا خاوەنەکە هەر ئەو کەسەیە بۆ نمونە موحەمەد یان عیسی سەلامی خوایان لێبێ.

وە هەر وەها بابەتە زانستیەکان زوو گۆڕانیان بەسەردا دێ بەڵام وەحی وا نییە.

٢. دەوترێ موعجیزە وەحی وەک جادو شەعوەزە وایە شتی پوچ و خەیاڵییە:

وەڵام: جادو فاڵچیەتی و شەعوەزە خاوەنەکانیان کەسی خراپ و درۆزن و فریوودەرن، وە بازرگانی بە کارەکانیانەوە دەکەن

بەڵام خاوەنی وەحی موعجیزە وانیە، بەردەوام لە گەورەترین و خۆنەویسترین کەسایەتیەکانن و ژیرترین و دڵسۆزترینی مرۆڤەکانن، بۆیە ناکرێ کەسایەتیەکی وەک موحەمەد، موسا عیسا وەک فاڵچیەک و جادووەکی





درۆزن سەیر بکرێن ئەمە نە لۆژیک نە واقع پشتڕاستی ناکاتەوەو و وە ئەو پەری بێ ویژدانیە.

٣. دەوترێ ئەوەی کە ئێوە پێی دەڵێن وەحی یان موعجیزە تەنیا داهێنانی چەند کەسایەتیەکەی شارەزاو لێهاتون.

وەڵام: لەڕاستیدا ئەوەی کەسایەتیە شارەزاو لێهاتوەکان دایدەهێنن بۆ کەسانیتریش کە وەک وان شارەزان یان شارەزاترن ئاساییە هەمان داهێنان و زیاتریش بکەن، بەڵام هیچ کەس ناتوانی وەک پێغەمبەرێک بکا مەگەر پێغەمبەرێکی تر بێ و هەمان پشتیوانی پەروەردگاری هەبێ.

٤. دەوترێ: ئەوەی کە ئێوە پێی دەڵێن وەحی یان موعجیزە دەرچونە لە یاسای گشتی و زانستی کە ئێمە جێگای مەدح و پیا هەڵدان نییە.

وەڵام: ڕاستە وەحی و موعجیزە دەرچونە لە یاسای باو کە خەڵک خوی پێوە گرتوە، بەڵام دەرچون نییە لە یاسای گشتی گەردون و زانست، لەڕاستیدا پەیدانونی گەردون لە کەمتر لە چرکەیەک زۆر لەوە موعجیزەترە وە زانست پشتڕاستیشی دەکاتەوە، وە مرۆڤ ئاگاداری بەسەر تەواوی یاساکانی گەردوندا نییە تابڵێین پێچەوانەی یاساکانی گەردوونە، وە پاشان ئایا مرۆڤ کەسەرتۆپی گەردونە ئەوە هەڵناگرێ کە شتی وای نیشان بدرێ کە پێچەوانەی نەریت و یاسا گشتیەکانە؟.

٥. دەوترێ مادام وەحی بۆ مرۆڤ دێ و گونجاوە، ئەی بۆ بۆ تەواوی مرۆڤەکان وەحی و موعجیزە نایات؟

وەڵام: گومان لەوەدا نیە کە هەموو مرۆڤەکان ئامادەی تەواوی هەموو جۆرە زانستەکانیان نیە، ئەمە بە واقعی ژیانی مرۆڤایەتی سەلمێنراوە کە دەبینین مرۆڤەکان پسپۆری جیاوازو جۆراو جۆریان هەیە، وە توانای وەرگرتنی وەحی





تەنیا توانی زانستی و لاشەیی و دەرونی نیە، بەڵام دەبێ کەسەکە لە هەموو بوارەکانی ژیاندا ئامادەو گونجاوو شایەنبێ.

٦. دەوترێ چۆن دەگونجێ وەحی یان موعجیزە ببێتە بەڵگەی پێغەمبەرایەتی لە کاتێکدا ئێمە هێشتا خوامان نەبینیوە!؟

وەڵام : وەڵامی ئەم پرسیارە زۆر سادەیە، هەر وەک چۆن ئەم گەردوونە فراوانە بەڵگەیە لە سەر بونی خوای گەورە، هەر واش موعجیزەو وەحی بەڵگەیە لەسەر پێغەمبەرایەتی پێغەمبەر، بێجگە لە ڕاستی و هاوسەنگی و کاریگەری و...

٧. دەوترێ : ئەو کتابەی ئێوە بانگەشەی وەحی بون و موعجیزە بونی دەکەن کتابێکی ڕێکنەخراوو پەرتەوازەیە لە ڕوی بابەتەو ڕووداوو زانستیە، لە کاتێک کتابەکانی تر بە ناوی دیارو بابەتی دیارو پرسی ڕێکخراو نوسراوە چۆن دەکرێ ئەوە وەحی یان موعجیزەبێ؟

وەڵام: ئەوە کە بە شێوازی ڕیزبەندی و ڕێکخراوو بە پێی دابەزینی ڕێکخراو نیە مانای وا نیە زانستی و کاریگەر نیە، بەڵکو هەر ئەوە بۆ خۆی لە خۆیدا موعجیزەو بەڵگەی ڕاستی و خودایی بونیەتی، وە ئەوە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی دانراوی مرۆڤ نیە، ئەو شێوازەی کە قورئان هەیەتی لە ئەحکامەکان و ڕووداوەکان و سەربوردەکان و بابەتەکان لە گەڵ ئەوپەری لایەنی ڕەوانبێژی و ئوسلوبی و میسداقیەت و کاریگەربونی و سەرنجڕاکێشانی بەڵگەی خودایی بونیەتی، بۆ تایبەت بۆ گەلێکی نەخوێندەوای وەک عەرەب، وە لە گەڵ ئەوەشدا ڕاست نیە بڵێین بابەتەکانی پچڕپچڕن و پەیوەندییان بە یەکەوە نیە، بەڵکو ئەوپەڕی و گونجاوی تەواوکاری تێدایە، دەتوانی بڵێی هەمووی ڕاڤەی سورەتی فاتحە دەکا، وە دەتوانی بڵێی سورەتی بەقەرە هەمووی ڕاڤەی المغضوب علیهم دەکا، وە سورەتی آل عمران هەمووی ڕاڤەی ( الضالین ) دەکا، وە زۆر تەفسیر هەن گرنگیان بەو بوارە داوە وەک کتابی ( الاساس فی التفسیر) ی سەعید





حەوا وە زۆر کتان نوسراوە باسی گونجان و تەواوکاری نێوان سورەتەکان و وە هەتا ئایەت و وشکان و بگرە پیتەکانیش دەکا.

٨. دەوترێ: موحەمەد کەسێک بوە تورەو میزاجی بوە، وە توشی هیستریا بوە، ئەوەی وتویەتی و وڕێنەیەو خەیاڵاتی تایبەتی کاریگەربونی خۆیەتی.

وەڵام: لە ڕاستیدا ئەو گومانە زۆر پێکەنیناوییە لەبەرچی:

یەکەم: پێغەمبەر کەسێکی ڕووخۆش و لە بەردڵان و تەبیعەت خۆشبوە، تەنانەت باس لەوە نەکراور تەنیا شەڕێکی لە گەڵ کەسێکدا کردبێ، ئایا ئەگەر تونده تەبیعەت و میزاجی با نەدەکرا تا تەمەنی چڵ ساڵی شتێکی وایان لێ گێڕاباوە؟!

دووەم: دەکرێ کەسێکی توشبو بە هیستریان دینێک بێنێ هەموو دوونیا دژایەتی بکا بەڵام بەرنەڵستیان پێنەکرێ.

سێ یەم: دەکرێ کەسێکی شێت دینێک دانێ ژمارە دوو بێ لەسەر ئاستی جیهان وە بەرەو ژمارە یەکەم بون بڕوا.

چوارەم: خێرە ئەدی بۆ کەسێک ناهێنن نەوەک شێت بەڵکو پرۆفیسۆر، عەلامە، وەڵامی ئەم دینە باتەوەو ئەو گرفتەو لێقە بکاتەوە.

پێنجەم: ئەی بۆ ئەگەر کەسێکی شێت و میزاجیە ئەوا پێی قەڵس بون و ئارامتان لێهەڵگیراوەو لەبەری و شەوو ڕۆژتان بە یەکەوە گرێداوە. بە مەسیحی و جولەکەو مولحیدو مارکسی و چەپ و ڕاست خەریکی دژایەتی کردنن؟!

٩. دەوترێ: ئێوە دەڵێن وەحی: قورئان موعجیزەیە بە تایبەت لە ڕووی ڕەوانبێژیەوە، بەڵام ئێمە ئەو ڕەوانبێژیە نابینین.

وەڵام : جۆرەکانی ئیعجاز لە قورئاندا زۆرن ئێمە ئاماژەمان بە هەندێکیان کرد، بەڵام زۆربەی ئەوانەی ڕەخنە لە قورئان دەگرن و بە باسی ئوسلوب و ڕەوانبێژی





دەکەن کە گوایە لە قورئاندا نیە، ئەوانە زۆربەیان لە زمانی عەرەبی کۆڵەوارن، وە لەو زانستانە دەستیان کورتە کە پێویستن بۆ تێگەیشتن لە زمانی عەرەبی و ڕەوانبێژی، بەڵام سێ شت بەڵگەن بۆ ڕەوانبێژی قورئان:

یەکەم: عەرەبەکانی سەردەمی قورئان کە قورئان تەحەدای کردن بەڵام ئەوان وەڵامیان نەبوو لە کاتێکدا ئەوان سوارچاکی ئەو مەیدانە بوون.

دووەم: تەحەدایەکە تا ئیستاش بەردەوامە کە لە تەوەری پێشووتر باسی دکتۆر ئیبراهیم خلیل ی میسریمان کرد کە بۆچی هاوڕێ مولحیدەکەم مسوڵمانبوو؟ کە دوو هەزار نامەی ڕەوانی هەموو ناوەندەکانی مەسیحی ئیلحادی و ئیعلامی کردوە کە جوابی تەحەدای قورئان بدەنەوە بەڵام دواتر ئەوان داوای لێبوردنیان کرد کە ناتوانن، یان بیانوی لاوازیان هێنایەوە.

سێ یەم: زانینی ڕەوانبێژی قورئان بۆ کەسانی پسپۆرە لە زمانی عەرەبی، ئایا ئەوان بەڕاستی وایان وتوە؟ ئەوە جێگای پرسیارە، ئەگەر هەیە پێمام بڵێن.





## ئایا وەحی پێچەوانەی زانستە؟:

خەواندن یان (التنويم المغناطيسى) کە دکتۆر (مسمر) ئەڵمانی لە سەدەی هەژدە دۆزیەوە، یەکێکە لەو بوارانەی کە لە ڕووی زانستیەوە دانی پێدا هێنراوەو سەدان ناوەندو پەیمانگای بۆ دامەزراوە، ئایا ئەو کەسەی تحکم دەکا واتە بڕیار لەسەر خەوێندراوەکە دەدا قسە لەگەڵ ڕوح دەکا؟ یان لە گەڵ جنۆکە؟ یان عەقڵی باطنی؟ هەر کامێک لەوانە بن ، ئەوانە هیچ پەیوەست نین بە لایەنی ماددی مرۆڤە خەوێندراوەکەوە، ئەو خەوێندراوە وەڵامی پرسیارەکان دەداتەوە کە بە مەرجێک هیچ ئاگای لە خۆی نییە، وە پێشتر ئەو شتانەی نەزانیون، بۆیە دۆزینەوەی تەنویمی موغناتیسی گەورەترین بزماری لە تابوتی ئیلحادو مادە پەرستەکان دا، ئەم بوارە بە تەواوی پاڵپشتی ڕاستی وەحی دەکا، لە مەوە زانایان بۆیان دەرکەوتوە کە ڕووح هەیە، وە ئەو ڕووحە جیایە لە لاشە، وە ڕووح بە نەمانی لاشە لە ناو ناچێ.

- لە دوای داهێنانی پەیوەندی تەلەفۆنی و ڕادیۆو تەلەفزیۆن و مۆبایل و تۆڕە کۆمەڵاتیەکان بەو ئەندازە پێشکەوتوییە هیچ گومان بۆ بوونی ڕاستی وەحی نامێنێتەوە.
- لە ژیانی ئاژەڵان وەک مێرو، یان مێشهەنگ، یان ماسی، یان باڵندەکان زیرەکی وادەبینی کە سەرت دەسوڕمێ و ناچاری قەبوڵیشی بکەی، چونکە پێی دەوترێ زانست بە پێی تاقیکردنەوە، ئەمە لە تێگەیشتن لە وحی نزیکماندەکاتەوە.
- مرۆڤە عەبقەری و داهێنەرو خاوەن بەهرەکان لە بیرو و بیرکاری و بوارەکانی تر کە جێگای سەر سوڕمانی مرۆڤن، خەریکی بڕوای پێنەکەین ئەگەر بە چاوی خۆمان نەیبینین، ئەمە وادەکا لە وحی تێبگەین ئاسانتر.





- شاعیری فەرەنسی( موسیە): (من جاری وایە هیچ شتێک ناکەم بەلام وتەیەک بە گوێمدا ئەدرێ منیش دەینوسمەوە بەتەواوی، وەک ئەوە وایە کەسێکی نادیار بانگم کاو ئەو وتانە بخاتە گوێمەوە).
- بەڵگەکانی قورئانی کە لە باسی تەوەری ئیعجازی قورئان باسمان کرد لە سەر ڕاستی قورئان هەموو ئەوانە پشتڕاستی وەحی دەکەنەوە.
- بەڵگەکانی ڕاستی پێغەمبەرایەتی پێغەمبەر پشتڕاستی ڕاستی وەحی دەکەنەوە.

**ئاماژە بە هەندێک لە بەڵگەکانی پێغەمبەرایەتی سەروەرمان دەکەین لەوانە:**

هەواڵدانی کتابەکانی پێش خۆی بە هاتنی پێغەمبەر کە قورئانی پیرۆز ئاماژە بە هەندێکیان دەکا:

- لەو بەڵگانەی کە قورئانی پیرۆز باسی کردوە لە تەورات و ئینجیل و کتابەکانی تریش خوای گەورە دەفەرموێ: مُّحَمَّدٌ رَّسُولُ ٱللَّهِ وَٱلَّذِينَ مَعَهُۥٓ أَشِدَّآءُ عَلَى ٱلْكُفَّارِ رُحَمَآءُ بَيْنَهُمْ تَرَىٰهُمْ رُكَّعًا سُجَّدًا يَبْتَغُونَ فَضْلًا مِّنَ ٱللَّهِ وَرِضْوَٰنًا سِيمَاهُمْ فِى وُجُوهِهِم مِّنْ أَثَرِ ٱلسُّجُودِ ذَٰلِكَ مَثَلُهُمْ فِى ٱلتَّوْرَىٰةِ وَمَثَلُهُمْ فِى ٱلْإِنجِيلِ كَزَرْعٍ أَخْرَجَ شَطْـَٔهُۥ فَـَٔازَرَهُۥ فَٱسْتَغْلَظَ فَٱسْتَوَىٰ عَلَىٰ سُوقِهِۦ يُعْجِبُ ٱلزُّرَّاعَ لِيَغِيظَ بِهِمُ ٱلْكُفَّارَ وَعَدَ ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَعَمِلُوا۟ ٱلصَّٰلِحَٰتِ مِنْهُم مَّغْفِرَةً وَأَجْرًا عَظِيمًۢا (الفتح: ٢٩) موحەممەد(صلى الله عليه وسلم) پێغەمبەری خوایە ئەو (باوەڕدار) انەش کە لەگەڵیدان بەرامبەر بێ باوەڕان توندو تیژن و لە نێوان خۆیاندا بە بەزەیین دەیان بینی (هەمیشە) لە کوڕنوش و سوژدە بردن دان داوای بەهرەو ڕەزامەندی خودا دەکەن نیشانەیان لەناو چاوانیاندا دیارە بەهۆی زۆر سوژدە بردن (یانەوە) ئەوە نموونەیانە لە تەوراتدا ئەوە نموونەشیان لە ئینجیلدا وەك كشتوكاڵێك وایە چەکەرەی دەرکردبێ (سەوز بووبێ) ئینجا





چەکەرەکەی بەهێز کردبێ و قاییم بووبێ جا لەسەر لاسکی خۆی ڕێك وەستابێ (ئەوەندە جوان بێ) جوتیارەکانی سەرسام کردبێ تا بە (زۆر بوونی) هەوەڵانی داخ و مەراق بدا بە کافران خوا بەڵێنی داوە بەوانەیان کە باوەڕیان هێناوەو کردەوەی چاکەیان کردووە بە لێبوردن و پاداشتی گەورە (کە بەهەشت)

لێرەدا خوای گەورە باسی پێغەمبەرو هاوەڵانی کردوە لە تەورات و ئینجیل.

- وە خوای گەورە دەربارەی مزگێنی دانی بە کۆتا پێغەمبەر باسکردوە لە سورەتی ( الصف) وەک دەفەرموێ: وَإِذْ قَالَ عِيسَى ٱبْنُ مَرْيَمَ يَٰبَنِيٓ إِسْرَٰٓءِيلَ إِنِّي رَسُولُ ٱللَّهِ إِلَيْكُم مُّصَدِّقًا لِّمَا بَيْنَ يَدَيَّ مِنَ ٱلتَّوْرَىٰةِ وَمُبَشِّرًۢا بِرَسُولٍ يَأْتِي مِنۢ بَعْدِي ٱسْمُهُۥٓ أَحْمَدُ فَلَمَّا جَآءَهُم بِٱلْبَيِّنَٰتِ قَالُواْ هَٰذَا سِحْرٌ مُّبِينٌ (الصف: ٦) بیریان بخەرەوە، کاتێك عیسای کوری مەریەم بەنەوەی ئیسرائیلی وت: منیش بەڕاستی پێغەمبەری خوام بۆ سەر ئێوە، ڕاستی تەوراتیش دەسەلمێنم کەلە پێش مندا هاتووە، هەروەها مژدەدەریشم بەپێغەمبەرێك کە دوای من دێت و ناوی - ئەحمەد - ە، کەچی کاتێك بە بەڵگە و نیشانەی تێر و تەواوو موعجیزەی ئاشکراوە پێی ڕاگەیاندن، وتیان: ئەمە جادوویەکی ئاشکرایە.

- هەروەک چۆن بەڵێن لە هەموو پێغەمبەران وەرگیراوە کە بڕوا بە پێغەمبەرانی دوای خۆیان بکەن و پشتیوانیان لێبکەن وەک دەفەرموێ: وَإِذْ أَخَذَ ٱللَّهُ مِيثَٰقَ ٱلنَّبِيِّـۧنَ لَمَآ ءَاتَيْتُكُم مِّن كِتَٰبٍ وَحِكْمَةٍ ثُمَّ جَآءَكُمْ رَسُولٌ مُّصَدِّقٌ لِّمَا مَعَكُمْ لَتُؤْمِنُنَّ بِهِۦ وَلَتَنصُرُنَّهُۥ قَالَ ءَأَقْرَرْتُمْ وَأَخَذْتُمْ عَلَىٰ ذَٰلِكُمْ إِصْرِي قَالُوٓاْ أَقْرَرْنَا قَالَ فَٱشْهَدُواْ وَأَنَا۠ مَعَكُم مِّنَ ٱلشَّٰهِدِينَ (آل عمران: ٨١) [بێنەوە بیر] ئەو کاتە خوا پەیمانی بەست دەگەڵ پێغەمبەرەکانا: ئەر من کتێب و زانستی لەکارزانیم بە ئێوە دا و پاشانە کە پێغەمبەرێک هاتە ناوتان کە ئەوانەی لە لای ئێوەی بەڕاست زانی، دەبێ بڕوای پێ بێنن و یاریدەی دەن. ئەوسا گوتی: بەڵێ،





ئەوا وەعۆدەی خۆمان گرت. گوتی: دەسا بە شایەت بن؛ ئەوا منیش دەگەڵتانم.

**دیارە قورئان ڕاسترین کتابی خوایەو باشترین شاهیدە بەڵام بێجگە لە قورئانی پیرۆز هەندێک بەڵگەکانی کتابەکانی تر باسدەکەین:**

١. چیرۆکی (هیرەقل) کە لە سەحیحی بوخاریدا هاتوە بەڵگەیەکی حاشا هەڵنەگرە لە ڕاستی وەحی و خاوەنەکەی چونکە هیرەقل ئەلی کتاب بوە، ئەستێرەناس بوە، وە هاوکات پرسی بە هاووێنەکەشی کردوە کە وەک ئەو بوەوو هاوتای ئەوبوە لە بوسری تنبو و ئەستێرە ناسی وە هەردوکیان دانیان ناوە بەوەی کە ئیستا کاتی ئەوەیە ئەو پێغەمبەرە دەرکەوێ ، وە لە پرسیارەکانی لە ئەبوسوفیان دڵنیا بو کە ئەوە ئەو پێغەمبەرەیە کە ئەو چاوەڕوانی دەکا، وە دواتریش ویستی بڕوای پێبێنێ بەڵام خەڵکەکەی لێنەگەڕا ئەویش نەیویست دەسەڵات و خەڵکەکەی لە دەست بدا.

ئەمەش دەقی فەرمودەکەیە کە لە بوخاریدا هاتوە: بَابٌ : كَيْفَ كَانَ بَدْءُ الْوَحْيِ إِلَى رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ ؟ حَدَّثَنَا أَبُو الْيَمَانِ الْحَكَمُ بْنُ نَافِعٍ ، قَالَ: أَخْبَرَنَا شُعَيْبٌ ، عَنِ الزُّهْرِيِّ ، قَالَ : أَخْبَرَنِي عُبَيْدُ اللَّهِ بْنُ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عُتْبَةَ بْنِ مَسْعُودٍ ، أَنَّ عَبْدَ اللَّهِ بْنَ عَبَّاسٍ ، أَخْبَرَهُ أَنَّ أَبَا سُفْيَانَ بْنَ حَرْبٍ أَخْبَرَهُ ، أَنَّ هِرَقْلَ أَرْسَلَ إِلَيْهِ فِي رَكْبٍ مِنْ قُرَيْشٍ، وَكَانُوا تِجَارًا بِالشَّأْمِ فِي الْمُدَّةِ الَّتِي كَانَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ مَادَّ فِيهَا أَبَا سُفْيَانَ وَكُفَّارَ قُرَيْشٍ، فَأَتَوْهُ وَهُمْ بِإِيلِيَاءَ، فَدَعَاهُمْ فِي مَجْلِسِهِ وَحَوْلَهُ عُظَمَاءُ الرُّومِ، ثُمَّ دَعَاهُمْ، وَدَعَا بِتَرْجُمَانِهِ فَقَالَ : أَيُّكُمْ أَقْرَبُ نَسَبًا بِهَذَا الرَّجُلِ الَّذِي يَزْعُمُ أَنَّهُ نَبِيٌّ ؟ فَقَالَ أَبُو سُفْيَانَ : فَقُلْتُ : أَنَا أَقْرَبُهُمْ نَسَبًا، فَقَالَ : أَدْنُوهُ مِنِّي، وَقَرِّبُوا أَصْحَابَهُ، فَاجْعَلُوهُمْ عِنْدَ ظَهْرِهِ، ثُمَّ قَالَ لِتَرْجُمَانِهِ : قُلْ لَهُمْ إِنِّي سَائِلٌ هَذَا عَنْ هَذَا الرَّجُلِ، فَإِنْ كَذَبَنِي فَكَذِّبُوهُ، فَوَاللَّهِ لَوْلاَ الْحَيَاءُ مِنْ أَنْ يَأْثِرُوا عَلَيَّ كَذِبًا لَكَذَبْتُ عَنْهُ، ثُمَّ كَانَ أَوَّلَ مَا سَأَلَنِي عَنْهُ أَنْ قَالَ : كَيْفَ





نَسَبُهُ فِيكُمْ ؟ قُلْتُ : هُوَ فِينَا ذُو نَسَبٍ. قَالَ : فَهَلْ قَالَ هَذَا الْقَوْلَ مِنْكُمْ أَحَدٌ قَطُّ قَبْلَهُ ؟ قُلْتُ : لاَ.

٢. چیرۆکی نەجاشی پاشای حەبەشە کە لە کاتی وەفاتیدا پێغەمبەری خوا نوێژی جەنازەی بە غائیبی لەسەر کرد.

٣. ئیمان هێنانی وەرەقە کە شارەزای لە تەورات و ئینجیل هەبوو بەڵگەیەکی تر لە سەر پێغەمبەرایەتی پێغەمبەرمان علیه الصلاة والسلام.

٤. بوحەیرای ڕاهیب کە بە مناڵی پێغەمبەری بینی و زانی کە ئەمە پێغەمبەری کۆتاییە، بۆیە بە ئەبو تالیبی وت با جولەکەکان نەیبینن بڕۆ بیپارێزە.

٥. ئیمان هێنانی کۆمەڵێک زانای گەورەی جولەکە لەسەردەمی پەیامی ئیسلامدا.

٦. ئەو وەفدە ٦٠ کەسەی کە دوای هەفتەیەک لە گەڵ پێغەمبەردا موناقەشەیان کرد ئەوان مەسیحی بوون، ئەوان ئامادەبون سەرانە بدەن وەک دانهێنانێک بەڕاست و دروستی پەیامی پێغەمبەر علیه الصلاة والسلام.

٧. سەرکەوتنەکانی بەردەوامی پێغەمبەر لە هەموو قۆناغەکانی ژیانیدا.

٨. ئەو هەموو ڕەوشتە بەرزو بالآیەی کە لە جەنابیاندا هەبوو لە هەموو بوارەکاندا بە بەرزترین ئاست.

٩. خێرای بڵاو بونەوەی پەیامەکەی بە دونیادا لە ماوەی چارەکە سەدەیەکدا.

١٠. دامەزراندی شارەستانیەتێکی سەربەخۆو جیاواز لەوانی تر.

١١. ئەو گۆڕانکاریە ڕیشەییەی کە کردی لە ژیانی مرۆڤایەتیدا.





١٢. توانی بە کەمترین ماوە دواکەوتوترینی مرۆڤەکان بکاتە مامۆستا پێشەنگی مرۆڤایەتی.

١٣. نەبونی نوسین و خوێندنەوە کە ئەمە زانراو بوە لای دۆست و نەیار، بەڵام لە هەمان کاتدا مامۆستای مرۆڤایەتی بوە.

١٤. ئەو هەموو موعجیزە مادیانەی کە لەسەردەستی جەنابیان بەدیهاتون وەخەڵکانێکی زۆر بینیویانەو گێڕاویانەتەوە.

١٥. ئەو قورئانەی کە بەتەحەدا ماوەتەوە هەتا ئێستاش هەر واش دەمێنێتەوە تا دوارۆژ.

١٦. پێغەمبەری خوا هەواڵدەدا بە شکانی فارسەکان دوای چەند ساڵێک لە دوای ئەوەی کە ڕۆمەکان خراپ تێکشکابون: غُلِبَتِ ٱلرُّومُ (الروم: ٢) ڕۆم شکێنران و ژێرکەوتن (فارس زاڵ بوو) بە سەریاندا. فِيٓ أَدۡنَى ٱلۡأَرۡضِ وَهُم مِّنۢ بَعۡدِ غَلَبِهِمۡ سَيَغۡلِبُونَ (الروم: ٣) لە نزيك ترين خاكيان (لە مەککەوە یا لە وڵاتی فارسەوە) وە ڕۆمەکان دوای تێشکانیان لە داهاتوودا سەر دەکەون (بەسەر فارسەکان) دا. فِي بِضۡعِ سِنِينَۗ لِلَّهِ ٱلۡأَمۡرُ مِن قَبۡلُ وَمِنۢ بَعۡدُۚ وَيَوۡمَئِذٖ يَفۡرَحُ ٱلۡمُؤۡمِنُونَ (الروم: ٤) لەماوەی چەند ساڵێکدا (لە نێوان سێ تا نۆ ساڵ) هەموو کاروبار تەنها بە دەست خوایە لە پێش (سەرکەوتن) و لەدوا (سەرکەوتن) وە لەو ڕۆژەدا (ڕۆمەکان سەردەکەون) ئیمانداران دڵخۆش دەبن.

١٧. پێغەمبەر لە ڕێی قورئانەوە مزگێنی سەرکەوتن و خیلافەتی ئیسلامیدا لە کاتێکدا خۆی و هاوەڵانی لە وەزعێکی خراپ و کەم دەسەڵاتیدا دەژیان: وَعَدَ ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ مِنكُمۡ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ لَيَسۡتَخۡلِفَنَّهُمۡ فِي ٱلۡأَرۡضِ كَمَا ٱسۡتَخۡلَفَ ٱلَّذِينَ مِن قَبۡلِهِمۡ وَلَيُمَكِّنَنَّ لَهُمۡ دِينَهُمُ ٱلَّذِي ٱرۡتَضَىٰ لَهُمۡ وَلَيُبَدِّلَنَّهُم مِّنۢ بَعۡدِ خَوۡفِهِمۡ أَمۡنٗاۚ يَعۡبُدُونَنِي





لَا يُشْرِكُونَ بِي شَيْـًٔا وَمَن كَفَرَ بَعْدَ ذَٰلِكَ فَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْفَٰسِقُونَ (النور: ٥٥) خوا بەڵێنی داوە بەو کەسانەتان کە باوەڕیان هێناوە وە کردەوەی چاکەکانیان کردووە کە بێگومان دەیانکاتە جێ نشینی (خەڵکی تر) لە زەوی دا هەروەك ئەوانی (ئیماندارانی) پێش ئەمانی کردە جێ نشین وە ئاینەکەیان بۆ دەچەسپێنێ ئەو (ئاینە) ی کە خوا پێی ڕازی بووە بۆیان وە ترس و بیمیان بۆ دەگۆڕێ بە ئاسایش و ئارامی (لەو کاتەدا ئیتر) هەر من دەپەرستن و هیچ هاوبەشیەکم بۆ بڕیار نادەن وە هەر کەس بێ بڕوا بێ دوا ئەوە (بەدی هاتنی بەڵێنەکان) ئەوە بەڕاستی هەر ئەوانەن دەرچوو لە ڕێگەی خوا.

١٨. پێغەمبەری خوا چۆن دەیزانی خوای گەورە دەیپارێزێ لە گەڵ هەبونی ئەو هەموو ناحەزە زۆرو زەوەندی کە هەیبوو: يَٰٓأَيُّهَا ٱلرَّسُولُ بَلِّغْ مَآ أُنزِلَ إِلَيْكَ مِن رَّبِّكَ وَإِن لَّمْ تَفْعَلْ فَمَا بَلَّغْتَ رِسَالَتَهُۥ وَٱللَّهُ يَعْصِمُكَ مِنَ ٱلنَّاسِ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يَهْدِى ٱلْقَوْمَ ٱلْكَٰفِرِينَ (المائدة: ٦٧) ئەی پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) ڕایگەیەنە(بە خەڵك) ئەوەی هێنراوەتە خوارەوە بۆت لە لایەن پەروەردگارتەوە وە ئەگەر وانەکەی ئەوە ڕاسپێریەکەی خوات ڕانەگەیاندوە و بەجێت نەهێناوە وە خوا تۆ دەپارێزێ لە خەڵکی (کە بت کوژن) بێگومان خوا ڕێنموونی بێ بڕوایان ناکات.

١٩. پێغەمبەری خوا هەواڵی شەهید بونی عومەرو عوسمانی گەیاندبو زۆر پێش شەهیدبونیان: أَنَّ أَنَسَ بْنَ مَالِكٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ حَدَّثَهُمْ أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ صَعِدَ أُحُدًا، وَأَبُو بَكْرٍ، وَعُمَرُ، وَعُثْمَانُ، فَرَجَفَ بِهِمْ، فَقَالَ : " اثْبُتْ أُحُدُ ؛ فَإِنَّمَا عَلَيْكَ نَبِيٌّ، وَصِدِّيقٌ، وَشَهِيدَانِ "رواه البخاری، ٣٦٧٥

٢٠. پێغەمبەری خوا هەواڵی دا بە عوسمان ی کوری عەفان بەو بەڵایەی کە توشی دەبێ: فَقُلْتُ : عَلَى رِسْلِكَ. قَالَ : وَجِئْتُ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَأَخْبَرْتُهُ، فَقَالَ : " ائْذَنْ لَهُ، وَبَشِّرْهُ بِالْجَنَّةِ، مَعَ بَلْوَى تُصِيبُهُ ". قَالَ : فَجِئْتُ، فَقُلْتُ : ادْخُلْ، وَيُبَشِّرُكَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بِالْجَنَّةِ، مَعَ بَلْوَى تُصِيبُكَ. رواه مسلم،٢٤٠٣





ئەبو هوڕەیرە لە فەرمودەیەکی دورو درێژدا باسی ئەوە دەکا کە پێغەمبەری خوا چۆتە ناو باخێک و هاوەڵانی سەردانیان کردوە وەک ئەبوبەکرو عومەرو ئەبوهورەیرەو عوسمان بە هەموان مزگێنی بەهەشتی داوەو ڕێگای داون بێنە ژورەوە لە ڕێی دەرگەوانەکەیە لەو کاتەدا کە ئەبو هورەیرە بوە، کە عوسمان هاتوە فەرمویەتی بابێتە ژورێ و مزگێنی بەهەشتی و پێبدە لە گەڵ ئەو بەڵایەش کە توشی دەبێ، گومانی تیدا نیە کە عوسمان لە شەش ساڵی دووەمی خیلافەتەکەی دوچاری بەڵاو ناخۆشی زۆر بۆوە.

٢١. پێغەمبەری خوا خەبەری داوە کە عومەر توشی ئەو فیتنەو ئاشوبە نایا کە هاوەڵان توشی دەبن هەروەک لە بوخاری مسلم دا هاتوە: عَنْ حُذَيْفَةَ قَالَ : قَالَ عُمَرُ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ : مَنْ يَحْفَظُ حَدِيثًا عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فِي الْفِتْنَةِ ؟ قَالَ حُذَيْفَةُ : أَنَا سَمِعْتُهُ يَقُولُ : " فِتْنَةُ الرَّجُلِ فِي أَهْلِهِ وَمَالِهِ وَجَارِهِ، تُكَفِّرُهَا الصَّلَاةُ وَالصِّيَامُ وَالصَّدَقَةُ ". قَالَ : لَيْسَ أَسْأَلُ عَنْ ذِهِ، إِنَّمَا أَسْأَلُ عَنِ الَّتِي تَمُوجُ كَمَا يَمُوجُ الْبَحْرُ. قَالَ : وَإِنَّ دُونَ ذَلِكَ بَابًا مُغْلَقًا. قَالَ : فَيُفْتَحُ أَوْ يُكْسَرُ ؟ قَالَ : يُكْسَرُ. قَالَ : ذَاكَ أَجْدَرُ أَنْ لَا يُغْلَقَ إِلَى يَوْمِ الْقِيَامَةِ. فَقُلْنَا لِمَسْرُوقٍ : سَلْهُ : أَكَانَ عُمَرُ يَعْلَمُ مَنِ الْبَابُ ؟ فَسَأَلَهُ فَقَالَ : نَعَمْ، كَمَا يَعْلَمُ أَنَّ دُونَ غَدٍ اللَّيْلَةَ. رواه البخاری، ١٨٩٥.

٢٢. پێغەمبەری خوا بە عەماری کوڕی یاسری وت کۆمەڵێک دەتکوژن کە لەڕێدەرچوون : أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ لِعَمَّارٍ : " تَقْتُلُكَ الْفِئَةُ الْبَاغِيَةُ ". رواه مسلم، ٢٩١٦، ئایا پێغەمبەری خوا چۆنی زانی کە عەمار دەکوژرێ ئەگەر موعجیزە و پشتیوانی خوا نەبێ بۆ ئەو

٢٣. پێغەمبەری خوا هەواڵی دا دەربارەی حەسەنی کوڕی عەلی کە فەرموی لەسەر دەستی ئەم کوڕەم خوای گەورە ئاشتەوای دەخاتە نێوان دوو کۆمەڵی گەورەی مسوڵمانان، ئەوە بوو کە حەسەن دەست بەرداری دەسەڵات بوو بۆ موعاویەو شەڕ ڕووی نەدا: " إِنَّ ابْنِي هَذَا سَيِّدٌ، وَلَعَلَّ اللَّهَ أَنْ يُصْلِحَ بِهِ بَيْنَ فِئَتَيْنِ عَظِيمَتَيْنِ مِنَ الْمُسْلِمِينَ ". قَالَ لِي عَلِيُّ بْنُ عَبْدِ اللَّهِ : إِنَّمَا ثَبَتَ لَنَا سَمَاعُ الْحَسَنِ مِنْ أَبِي بَكْرَةَ بِهَذَا الْحَدِيثِ.رواه البخاری،٢٧٠٤





٢٤. له چەندین فەرمودەی سەحیح دا هەواڵی پەیدابونی خەواریجەکان دراوە: أَنَّ عَلِيًّا ذَكَرَ أَهْلَ النَّهْرَوَانِ، فَقَالَ : فِيهِمْ رَجُلٌ مُودَنُ الْيَدِ ، أَوْ مُخْدَجُ الْيَدِ ، أَوْ مَثْدُونُ الْيَدِ، لَوْلَا أَنْ تَبْطَرُوا لَنَبَّأْتُكُمْ مَا وَعَدَ اللَّهُ الَّذِينَ يَقْتُلُونَهُمْ عَلَى لِسَانِ مُحَمَّدٍ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ. قَالَ : قُلْتُ : أَنْتَ سَمِعْتَ هَذَا مِنْهُ ؟ قَالَ : إِي وَرَبِّ الْكَعْبَةِ.حكم الحديث: صحيح

٢٥. له چەندین فەرمودەی سەحیح دا هەواڵی پەیدابونی خەواریجەکان دراوە: أَنَّ عَلِيًّا ذَكَرَ أَهْلَ النَّهْرَوَانِ، فَقَالَ: فِيهِمْ رَجُلٌ مُودَنُ الْيَدِ، أَوْ مُخْدَجُ الْيَدِ، أَوْ مَثْدُونُ الْيَدِ، لَوْلَا أَنْ تَبْطَرُوا لَنَبَّأْتُكُمْ مَا وَعَدَ اللَّهُ الَّذِينَ يَقْتُلُونَهُمْ عَلَى لِسَانِ مُحَمَّدٍ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ. قَالَ : قُلْتُ : أَنْتَ سَمِعْتَ هَذَا مِنْهُ ؟ قَالَ : إِي وَرَبِّ الْكَعْبَةِ.حكم الحديث: صحيح، رواه أبوداود، ٤٧٦٣

٢٦. پێغەمبەری خوا هەواڵی بە کۆتایی پێهاتنی شێوازی دەسەلاتی قەیسەرو ڕۆم دا: أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ : " إِذَا هَلَكَ كِسْرَى فَلَا كِسْرَى بَعْدَهُ، وَإِذَا هَلَكَ قَيْصَرُ فَلَا قَيْصَرَ بَعْدَهُ، وَالَّذِي نَفْسِي بِيَدِهِ لَتُنْفَقَنَّ كُنُوزُهُمَا فِي سَبِيلِ اللَّهِ "،رواه البخاری،٣١٢٠

٢٧. پێغەمبەری خوا هەواڵی داوەو فەرمویەتی خیلافەت سی ساڵە دواتر دەبێتە مەلیکایەتیەکی ددان لەسەر گیرکراو وەک ئەوەی کە بینیمان لە سەردەستی موعاوییە دوای ٣٠ ساڵ لە وەفاتی پێغەمبەر دەسەلاّم بوو بە میراتی: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ : " خِلَافَةُ النُّبُوَّةِ ثَلَاثُونَ سَنَةً، ثُمَّ يُؤْتِي اللَّهُ الْمُلْكَ - أَوْ مُلْكَهُ - مَنْ يَشَاءُ ، رواه أبوداود، ٤٦٤٦

٢٨. پێغەمبەری خوا هەواڵی دا بە فەتحی میسر، ئەمە لە زەمانی عومەردا ڕوویدا لەسەر دەستی عەمری کوری عاس: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ : " إِنَّكُمْ سَتَفْتَحُونَ أَرْضًا يُذْكَرُ فِيهَا الْقِيرَاطُ ، فَاسْتَوْصُوا بِأَهْلِهَا خَيْرًا ؛ فَإِنَّ لَهُمْ ذِمَّةً وَرَحِمًا،... رواه مسلم،٢٥٤٣. دیارە ئەوکات خەڵکی میسر بە زۆری پارەیەکیان بە کار هێناوە کە پێی وتراوە قیرات.





٢٩. مەبەست لە سیلەی رەحم و خزمایەتی ئەوەبوو کاتی خۆی پاشای میسر کەنیزەکی دا بە سارای خێزانی ئیبراهیم ئەویش کردیە خێزانی ئیبراهیم، لەو هاجەرەیە ئیسماعیل پەیدا بوو، وە پێغەمبەری ئێمە نەوەی ئیسماعیل ە وە موقەوقەسی ماریەی قیبتی بە دیاری بۆ پێغەمبەر نارد ئەویش کردیە خێزانی خۆی و ئیبراهیمی لێبوو، جا بۆیە خەڵکی میسر دووجار لە گەڵ پێغەمبەردا پەیوەندی و خزمایەتیان بوە.

٣٠. پێغەمبەر هەواڵی داوە بەوەی خەڵکی نەشیاوو ناشایستە بیناو ڤێلا بەرز دەکەنەوەو شانازی پێوە دەکەن: وَأَنْ تَرَى الْحُفَاةَ الْعُرَاةَ الْعَالَةَ رِعَاءَ الشَّاءِ يَتَطَاوَلُونَ فِي الْبُنْيَانِ رواه البخاري، ٨

٣١. پێغەمبەری خوا هەواڵی داوە بە پەیدا بونی ئافرەتانی ڕووت و شورتە کە قمچیان پێ یە وەک کلکی مانگا پێی لە خەڵک دەدەن: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ : " صِنْفَانِ مِنْ أَهْلِ النَّارِ لَمْ أَرَهُمَا ؛ قَوْمٌ مَعَهُمْ سِيَاطٌ كَأَذْنَابِ الْبَقَرِ يَضْرِبُونَ بِهَا النَّاسَ، وَنِسَاءٌ كَاسِيَاتٌ عَارِيَاتٌ، مُمِيلَاتٌ مَائِلَاتٌ، رُءُوسُهُنَّ كَأَسْنِمَةِ الْبُخْتِ الْمَائِلَةِ، لَا يَدْخُلْنَ الْجَنَّةَ، وَلَا يَجِدْنَ رِيحَهَا، وَإِنَّ رِيحَهَا لَيُوجَدُ مِنْ مَسِيرَةِ كَذَا وَكَذَا ".رواه مسلم ٢١٢٨

وە نمونەی تریشمان زۆرن بگرە بە سەدانن هەموو ئەوانە دەبنە بەڵگەی ڕاستی وەحی خوایی بۆ مرۆڤایەتی.

جیا لەوانەش زۆربەی مرۆڤایەتی بروایان بە دینی ئاسمانی هەیە، وە هەموو شوێنەوارەکان بەڵگەی ڕاستی دین و پەرستگا پشتڕاست دەکەنەوە،

وە دین باشترین هاندەرو پاڵنەری مرۆڤایەتی بوە بۆ کاری خێر، تەنها ئەوکاتانە نەبێ کە بە دەمارگیری و نەزانی و خۆسەپێنی بەکار هێنرابێ.



تەوەری هەشتەم:

## کۆکردنەوەی قورئان و ڕەواندنەوەی گومانەکان لەسەری

کۆکردنەوەی قورئان و ڕەواندنەوەی گومان لەسەری یەکێکە لەو بوارانەی کە ناحەزانی دین ویستویانە گومانی لەسەر پەیدا بکەن کۆکردنەوەی قورئان بوە، بەڵام بەڵگەکانیان ئەوەندە لاوازە بەرگەی لێکۆڵینەوەی زانستیانە ناگرێ، وە زۆربەی ئەوانەی کە لەو بوارەدا ئیشیان کردوە یان مەسیحی یان جولەکە بوون یان شاگردەکانیان بوون لە مولحیدەکان، وە کەمینەیەکیش هەیە لە وانەی خۆیان بە ئازادو لیبڕاڵ دەزانن دەڵێن ئێمە لە قەناعەتی خۆمانەوە لێکۆڵینەوەمان لەسەر کردوە، بەڵام سەرچاوەی یەکەمی ئەوان بۆ ڕەخنەگرتن لە قورئان پشتیان بە سەرچاوەکانی موستەشریق و مولحیدەکان بەستوە، بەلام جولەکەو مەسیحیەکان هەوڵیان داوە سود لە ڕیوایەتە ئیسلامیەکان وەربگرن، بە تایبەت ئەو سەرچاوانەی کە لاوازن، یان ئەگەر ڕیوایەتەکانیش ڕاستبن هەوڵیانداوە تەفسیری هەڵەی بۆ بکەن و بە هەڵە بەکاری بێنن، ئەو کتابە تایبەت کراوە بۆ تێگەیشتن لە قورئانی پیرۆز، بەلام بە پوختی، بۆیە هەوڵدەدەم بە کورتی و پوختی گومانەکان بڕەوێنینەوە لە سەر کۆکردنەوەی قورئانی پیرۆز:

**گومانی یەکەم**: ئەم قورئانە موحەمەد لە بوحەیڕاو وەرەقەو کەسێکی یەمانی فێری بوەو لەوانی وەرگرتوە.

**وەلاّم**: قورئان ئاماژە بەو گومانە دەکا کە دەفەرموێ: وَقَالَ ٱلَّذِينَ كَفَرُوٓاْ إِنْ هَٰذَآ إِلَّآ إِفْكٌ ٱفْتَرَىٰهُ وَأَعَانَهُۥ عَلَيْهِ قَوْمٌ ءَاخَرُونَ فَقَدْ جَآءُو ظُلْمًا وَزُورًا (الفرقان: ٤) ئەوانەی کە بێ بڕوا بوون دەیان وت بێگومان ئەم (قورئانە) هیچ نیە جگە لە درۆیەکی گەورە کە موحەممەدە (صلى الله عليه وسلم) هەڵی بەستووە وە کەسانی تر بۆ ئەو (هەڵبەستنە) یارمەتییان داوە ئەوە بەڕاستی ئەوانە ستەم و بوختانێکی گەورەیان کردووە .



وە دەفەرموێ: وَقَالُوٓاْ أَسَٰطِيرُ ٱلۡأَوَّلِينَ ٱكۡتَتَبَهَا فَهِيَ تُمۡلَىٰ عَلَيۡهِ بُكۡرَةٗ وَأَصِيلٗا (الفرقان: ٥) وە(بێ بڕوایان) دەیان وت (ئەم قورئانە) بەسەرهات و داستانی پێشووەکانە (موحەممەد (صلى الله عليه وسلم)) داوای کردووە بۆی بنوسن ئینجا دەخوێندرێتەوە بەسەریدا بە بەیانیان و ئێواراندا .

وە دەفەرموێ: وَلَقَدۡ نَعۡلَمُ أَنَّهُمۡ يَقُولُونَ إِنَّمَا يُعَلِّمُهُۥ بَشَرٞۗ لِّسَانُ ٱلَّذِي يُلۡحِدُونَ إِلَيۡهِ أَعۡجَمِيّٞ وَهَٰذَا لِسَانٌ عَرَبِيّٞ مُّبِينٌ (النحل: ١٠٣) سوێند بە خوا بێگومان ئێمە دەزانین کە ئەوانە دەڵێن هەر ئادەمی یە (ئەم قورئانەی) فێری دەکات کەچی زمانی ئەو کەسەی ئەوەی دەدەنە پاڵ عەجەمی یە و ئەم (قورئانە)ش بە زمانی عەرەبی پاراوو ڕوونە.

بەڵام ئەو گومانە زۆر ئاسانە وەڵام دانەوەی

**یەکەم**: پێغەمبەری خوا یەکجار بوحەیرای بینیبو لە شام بە مناڵی، چۆن دەکرێ بە یەکجار بە منالی ئەو قوڕئانە وەرگیرابێ.

**دووەم**: بۆچی پێغەمبەر نزیکەی ٣٠ ساڵ دوای بوحەیرا باسی قوڕئانی کرد؟!.
**سێیەم**: بۆچی بوحەیرا ئەمەی نەدەدا پاڵ خۆی و شانازی پێوە بکا، بۆچی ڕێگا دەدا ئەو شانازییە بۆ کەسێکی تر بێ؟! دەربارەی وەرەقەی کوری نەوفل و گەنجە یەمانیەکە هەمان ئەم وەڵامانە بۆ ئەوانیش ڕاستن، ئەو کەسەی کە ئەوان دەڵێن قوڕئانی فێری موحەمەد کردوە کابرایەکی ڕۆمی بوە، کەچی ئەم قوڕئانە عەرەبییەکی ڕەوانە.

**گومانی دووەم**: موحەمەد خۆی خوێندەوار بوەو قوڕئانی نوسیوەتەوە .

وەڵام: قورئان لە مەکە باسی نەخوێندەواری پێغەمبەری کردوە ئەگەر وا نیە ئەی بۆ عەرەبەکانی سەردەمی خۆی بۆ جارێکیش نەیانوت ئەوە وا نییە، موحەمەدمان بینی دەینوسی دەیخوێندەوە: وَمَا كُنتَ تَتۡلُواْ مِن قَبۡلِهِۦ مِن كِتَٰبٖ وَلَا





تَخُطُّهُۥ بِيَمِينِكَ إِذًا لَّٱرْتَابَ ٱلْمُبْطِلُونَ (العنكبوت: ﴿٤٨﴾) وە تۆ (ئەی موحەممەد(صلی الله علیه وسلم)) پێش ئەم (قورئانە) هیچ کتێبێکت نەدەخوێندەوە وە بە دەستی ڕاستت نەت نوسیووە (ئەگەر وابوایە) ئەو کاتە ناڕاستەکان (بێ بڕوایان) دەکەوتنە گومانەوە.

ئەوجار بۆچی موحەممەد قورئانی نەدا پاڵ خۆیی و ئەو گەورەیی و شانازییە بۆ خۆی تۆمار بکا؟، ئەی بۆچی پێغەمبەری خوا سەرکۆنەی خۆی دەکا لە قورئان، ئەی بۆچی بۆ جارێکیش ئوسلوبی قورئان لە گەڵ ئوسلوبی فەرمودە وێک ناچن، باشە چ کەسێک هەیە بتوانێ بە دوو ئوسلوبی تەواو جیاواز بنوسێ و وێک نەچن؟ کەچی ئەوە بە ئاشکرا لە قورئان و فەرمودەدا دەبینین.

**گومانی سێیەم**: دەڵێن قورئان لە شیعری جاهیلی وەرگیراوە وەک ئومەیە ی کوڕی سەلت( امیة بن الصلت) ئیمرئو القیس( إمرؤ القیس).

**وەڵام**: ئەمەش ڕاست نیە چونکە شیعری عەربی تەواو جیاوازە لە ئوسلوبی قورئان.

وە بۆچی ئەوانە کە هێندە زانا بوون پێغەمبەرایەتیان نەدایە پاڵ خۆیان؟

ئومەییەی کوری سەلت لە سەردەمی پێغەمبەردا هەبو، وە باسی هاتنی پێغەمبەر و بەهەشت و دۆزرەخی دەکرد، بەڵام کاتێک پێغەمبەر پەیدابوو لە حەسودی ئیمانی نەهێنا.

وە ئەو پیاوە ئەگەر لە پەنای پێغەمبەردا نەبێ کەس باسیشی ناکا، ئەدی کوا دینەکەی کوا کاریگەریەکەی، کوا شوێنکەوتەکانی؟ سەیرە ڕۆژهەڵاتناس و مولحیدەکان بە تۆبزی دەیانەوێ ئەو پیاوە بودەڵەیە گەورەکەن بەڵام بۆیان گەورە نابێ و کەس گوێ یان بۆ ناگرێ.







وە هەموو کەسیش دەزانێ پێغەمبەر شاعیر نەبوە، هەم قورئان باسی ئەو بابەتەی کردوە، هەم عەرەبیش ئەمەیان زانیوە، هەم دیاریشە کە لە قورئان و سونەتدا شیعر نیە، بێجگە لە چەند دەقێکی کەم کە هەمووی ناگاتە ١٠-١٢ بەیت کە جاری وابوە شاعیری عەرەب لە یەک مەجلیسدا دەیان بەیتی شیعر وتوە.

**گومانی چوارەم:** دەڵێن پێغەمبەر قورئانی لە جولەکەو مەسیح وەرگرتوە.

وەڵام: ئەم گومانە (جولدزیهر ١٨٥٠-١٩٢١م وە تسدال، ماسیە، ئەندریە، لامنزو شاخت هەمویان ئەوەیان وتوە، بەڵام ئایا ئەوە ڕاستە؟ بێگومان نەخەیر:

- گومان لەوەدا نیە کە لە زۆر شوێن وێکچون هەیە لە نێوان قورئان و کتابی پیرۆزدا، ئەوە مانای ئەوە نیە کە قورئان لە کتابی جولەکەو مەسیحی وەرگیرابێ، مانای ئەوەیە کە هەردوکیان ڕاستن و یەکسەرچاوەن، دەنا ئایا کەی قورئان لە جولەکەو مەسیحی وەرگیرا، ئەی بۆ ئەوەندە ئوسلوبیان جیاوازە؟
- دیارە ئەو گومانە زۆر دورە لە ڕاستی کە قورئان لەوان وەربگیرێ، بەڵام قورئان هاتوە پشتیوانی لە کتابە ئاسمانیەکان بکا، وە لە هەمویان زیاتر لە تەورات و ئینجیل نزیکترە، بەڵام شتی زۆریشی تێدا لە گەڵ هی ئەوان دژو ناکۆکە: نَزَّلَ عَلَيْكَ ٱلْكِتَٰبَ بِٱلْحَقِّ مُصَدِّقًا لِّمَا بَيْنَ يَدَيْهِ وَأَنزَلَ ٱلتَّوْرَىٰةَ وَٱلْإِنجِيلَ(آل عمران: ٣) ناردوویەتیە خوارەوە بۆت قورئان بەڕاستی و دروستی، بەڕاست دانەری هەموو ئەو(کتێب) انەیە لەپێشیدا بوون وە تەورات و ئینجیلی ناردە خوارەوە، مِن قَبْلُ هُدًى لِّلنَّاسِ وَأَنزَلَ ٱلْفُرْقَانَ إِنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ بِـَٔايَٰتِ ٱللَّهِ لَهُمْ عَذَابٌ شَدِيدٌ وَٱللَّهُ عَزِيزٌ ذُو ٱنتِقَامٍ (آل عمران: ٤) لەپێش قورئاندا بەڕێنموونیی خەڵکی وە ناردیە خوارەوە فورقان(واتە: جیاکەرەوەی ڕاست و ناڕاست مەبەست پێی قورئانە) بێگومان ئەوانەی کە بێ بڕوابوون بە





ئایەتەکانی خوا بۆیان هەیە (لە قیامەت دا) سزای سەخت، وە خوا بالاّ دەست و بەتوانایە خاوەنی تۆڵەو سزایە.

- وە قورئان لە گرنگترین شتەکاندا دژی جولەکەو مەسیحیەکانە کە یەکتاپەرستیە: لَّقَدْ كَفَرَ ٱلَّذِينَ قَالُوٓاْ إِنَّ ٱللَّهَ هُوَ ٱلْمَسِيحُ ٱبْنُ مَرْيَمَ قُلْ فَمَن يَمْلِكُ مِنَ ٱللَّهِ شَيْـًٔا إِنْ أَرَادَ أَن يُهْلِكَ ٱلْمَسِيحَ ٱبْنَ مَرْيَمَ وَأُمَّهُۥ وَمَن فِى ٱلْأَرْضِ جَمِيعًا وَلِلَّهِ مُلْكُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ وَمَا بَيْنَهُمَا يَخْلُقُ مَا يَشَآءُ وَٱللَّهُ عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ قَدِيرٌ (المائدة: ١٧) وَقَالَتِ ٱلْيَهُودُ وَٱلنَّصَٰرَىٰ نَحْنُ أَبْنَٰٓؤُاْ ٱللَّهِ وَأَحِبَّٰٓؤُهُۥ قُلْ فَلِمَ يُعَذِّبُكُم بِذُنُوبِكُم بَلْ أَنتُم بَشَرٌ مِّمَّنْ خَلَقَ يَغْفِرُ لِمَن يَشَآءُ وَيُعَذِّبُ مَن يَشَآءُ وَلِلَّهِ مُلْكُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ وَمَا بَيْنَهُمَا وَإِلَيْهِ ٱلْمَصِيرُ (المائدة: ١٨)

- لَقَدْ كَفَرَ ٱلَّذِينَ قَالُوٓاْ إِنَّ ٱللَّهَ هُوَ ٱلْمَسِيحُ ٱبْنُ مَرْيَمَ وَقَالَ ٱلْمَسِيحُ يَٰبَنِىٓ إِسْرَٰٓءِيلَ ٱعْبُدُواْ ٱللَّهَ رَبِّى وَرَبَّكُمْ إِنَّهُۥ مَن يُشْرِكْ بِٱللَّهِ فَقَدْ حَرَّمَ ٱللَّهُ عَلَيْهِ ٱلْجَنَّةَ وَمَأْوَىٰهُ ٱلنَّارُ وَمَا لِلظَّٰلِمِينَ مِنْ أَنصَارٍ (المائدة: ٧٢) لَّقَدْ كَفَرَ ٱلَّذِينَ قَالُوٓاْ إِنَّ ٱللَّهَ ثَالِثُ ثَلَٰثَةٍ وَمَا مِنْ إِلَٰهٍ إِلَّآ إِلَٰهٌ وَٰحِدٌ وَإِن لَّمْ يَنتَهُواْ عَمَّا يَقُولُونَ لَيَمَسَّنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ مِنْهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ (المائدة: ٧٣) وَقَالَتِ ٱلْيَهُودُ عُزَيْرٌ ٱبْنُ ٱللَّهِ وَقَالَتِ ٱلنَّصَٰرَى ٱلْمَسِيحُ ٱبْنُ ٱللَّهِ ذَٰلِكَ قَوْلُهُم بِأَفْوَٰهِهِمْ يُضَٰهِـُٔونَ قَوْلَ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ مِن قَبْلُ قَٰتَلَهُمُ ٱللَّهُ أَنَّىٰ يُؤْفَكُونَ (التوبة: ٣٠)

- ئەگەر تەماشا بکەین لە بابەتی زۆر گرنگ قورئان لە گەڵ کتابی پیرۆز دژ بە یەکن بۆ نمونە قورئان بە ڕاشکاوی دەڵێ ئەوەی کەفالەو تەربیەی مەریەمی کردوە زەکەریا بوە نەوەک یوسف ی نەجار کە دەسگیرانی بوە.





- قورڕئان دەڵێ عیسا نەکوژراوە، بەڵکو بەرزکراوەتەوە بەڵام ئەوان وا ناڵێن دەربارەی داود قورئان دەڵێ چاکترین بەندەیە بەڵام کتابی پیرۆز دەڵێ تەماعی خراپەکاری لە خێزانی ئۆریای سەبتی کردوەو وە کردوشیەتی.
- قورئان دەڵێ سولەیمان چاکترین بەندەیە کەچی کتابی پیرۆز دەڵێ بو بە بت پەرست.
- قورڕئان دەفەرموێ پێغەمبەر لوت دوو کچەکانی ئیمانیان پێ هێنا، وە خوای گەورە ئەوانی نەجات دا لە سزا، بەلام کتابی پیرۆز دەڵێ لەگەڵ باوکیان زینایان کردوە بۆیە ئەگەر خاڵە ناکۆکیە جەوهەریەکان باس کەین تەواو نابێ، کەواتە بانگەشەی وەرگرتنی قورڕئان لە تەوارات و ئینجیل درۆیەکی شاخدارە ئەوانەی کە باسمان کردن هەر چەند نمونەیەک بونە لەوانەی کە وتراون و دەوترێن دەربارەی قورڕئان بەڵام هەموویان بێ بنەمان و بڵقی سەرئاون.





## گومان لەسەر کۆکردنەوەی قورئانی پیرۆز (جمع القرآن)

کۆکردنەوەی قورئان مەبەست پێی چەند واتایەکە:

یەکەم: بە مانای لە بەرکردن و پاراستنیەتی لە دڵی پێغەمبەردا علیه الصلاة والسلام وەک خوای گەورە دەفەرموێ: إِنَّ عَلَيْنَا جَمْعَهُۥ وَقُرْءَانَهُۥ (القيامة: ﴿١٧﴾) بە ڕاستی (وەك بەڵێنمان داوە) بێگومان لەسەر ئێمەیە کۆکردنەوەی لە سنگتداو خوێندنەوەی.

دووەم: بە واتای نوسینەوەی لە پەڕاو و موسحەفدا، کە ئەمەش کراوە لەسەردەمی دابەزینی قورئانی پیرۆزدا.

سێیەم: بە واتای کۆکردنەوە و نوسینەوە و پاراستنی هەموو قورئان لە سینەو پەڕاوەکاندا کە ئەمە سێ جار ڕویداوە جاری یەکەم لە سەردەمی سەروەرمان علیه الصلاة والسلام جاری دووەم لە سەردەمی ئەبوبەکردا جاری سێ یەم لە سەردەمی عوسمانی کوری عەفان رەزای خوا لە هەموو هاوەڵان بێ.





**کۆکردنەوەی قورئان و پاراستنی لەسەردەمی پێغەمبەردا (علیه الصلاة والسلام)**

١. پێغەمبەری خوا کەسێکی نەخوێندەوار بوە، هەروەک گەلەکەشی زۆربەی نە خوێندەوار بوە بە شایەتی پەروەردگار: هُوَ ٱلَّذِي بَعَثَ فِي ٱلْأُمِّيِّـۧنَ رَسُولٗا مِّنۡهُمۡ يَتۡلُواْ عَلَيۡهِمۡ ءَايَٰتِهِۦ وَيُزَكِّيهِمۡ وَيُعَلِّمُهُمُ ٱلۡكِتَٰبَ وَٱلۡحِكۡمَةَ وَإِن كَانُواْ مِن قَبۡلُ لَفِي ضَلَٰلٖ مُّبِينٖ (الجمعة: ٢) خوا ئەو زاتەیە کە ناردوویەتی لە ناو نەخوێندەواراندا (عەرەبەکاندا) پێغەمبەرێك لە خۆیان دەخوێنێتەوە بە سەریاندا نیشانەکانی خوا پاکیان دەکاتەوە وە قورئان و فەرموودەی (پڕ سوود) یان فێر دەکات هەرچەند ئەوان لە مەوپێش لە گومڕایەکی ئاشکرادا بوون. بۆیە پێغەمبەری گەلەکەشی پشتیان بە لەبەرکردن بەستوە بۆ پاراستنی زانیاریەکان و شیعرو نەسەب و مێژوویان.

٢. پێغەمبەری خوا زۆر گرنگی بە لەبەرکردن و داوەو پێیەوە سەرقاڵ بوە خوای گەورەش شایەتی ئەمەی بۆ دەدا: لَا تُحَرِّكۡ بِهِۦ لِسَانَكَ لِتَعۡجَلَ بِهِۦٓ (القيامة: ١٦) زمانت مەجوڵێنە بە خوێندنەوەی سرووش تا پەلەی تیا بکەیت. وە دەفەرموێ: فَتَعَٰلَى ٱللَّهُ ٱلۡمَلِكُ ٱلۡحَقُّۗ وَلَا تَعۡجَلۡ بِٱلۡقُرۡءَانِ مِن قَبۡلِ أَن يُقۡضَىٰٓ إِلَيۡكَ وَحۡيُهُۥۖ وَقُل رَّبِّ زِدۡنِي عِلۡمٗا (طه: ١١٤) ئینجا بەرزو بڵندە ئەو خوایە کە دەسەڵات دارێکی (پادشایەکی) حەق و ڕاستە پەلە مەکە لە (خوێندنی) قورئاندا لەپێش ئەوەی سرووش کردنەکەی بۆت تەواو بێت وە بڵێ ئەی پەروەردگارم زانست و زانیاریم زیاد بکە. وە خوای گەورەش بەڵێنی پێداوە کە لەبیری نەچێتەوە مەگەر خۆی بیەوێ خۆشی نایەوێ: سَنُقۡرِئُكَ فَلَا تَنسَىٰٓ (الأعلى: ٦) ئەی موحەممەد(صلى الله عليه وسلم) قورئانت بەسەردا دەخوێنینەوەو هەرگیز بیرت ناچێتەوە. إِلَّا مَا شَآءَ ٱللَّهُۚ إِنَّهُۥ يَعۡلَمُ ٱلۡجَهۡرَ وَمَا يَخۡفَىٰ (الأعلى: ٧) مەگەر ئەوەی کە خوا بیەوێت بێگومان ئەو بە هەموو شتێکی ئاشکرا و پەنهان ئاگادارە.





٣. خوای گەورە بەڵێنی پاراستنی قورئانی پیرۆزی داوە وەک دەفەرموێ: إِنَّا نَحۡنُ نَزَّلۡنَا ٱلذِّكۡرَ وَإِنَّا لَهُۥ لَحَٰفِظُونَ (الحجر: ٩) بێگومان هەر ئێمە قورئانمان ناردۆتە خوارەوە و بەڕاستی هەر ئێمەش دەی پارێزین.

٤. جبریل سەلامی خوای لێبێ ساڵانە لە گەڵ پێغەمبەر قورئانی وتۆتەوە لە ڕەمەزانەکاندا، وە کۆتا ساڵ دوو جار لە گەڵ جبریل دا پێغەمبەری خوا قورئانی وتۆتەوە: و عن فَاطِمَةَ عَلَيْهَا السَّلَامُ : أَسَرَّ إِلَيَّ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَنَّ جِبْرِيلَ كَانَ يُعَارِضُنِي بِالْقُرْآنِ كُلَّ سَنَةٍ، وَإِنَّهُ عَارَضَنِي الْعَامَ مَرَّتَيْنِ، وَلَا أُرَاهُ إِلَّا حَضَرَ أَجَلِي. رواه البخاری

لە فاتیمەوە سەلامی خوای لێبێ کە دەڵێ: پێغەمبەری خودا (علیه الصلاة والسلام) بە نەهێنی پێی وتم کە جبریل هەمو ساڵ قورئانم لەگەڵ دەڵێتەوە وە جبریل ئەم ساڵ دوو جار قورئانی لەگەڵ گوتومەتەوە، وادەزانم کە ئەمە نیشانەی نزیک کەوتنەوەی مردنمە،

٥. عەرەب بە سروشی خۆیان زاکیرەیان بە هێزبوە و تێکەڵاو نەبون بە فەلسەفەو ئایدیای ئالۆز تاوەکو لە بەر بواری هزری ئاگایان لە لەبەرکردن نەمێنێ.

٦. ئەوانەی لەسەردەمی پێغەمبەردا قورئانیان لەبەردابو ژمارەیان زۆر بوە چ لە مەککە چ لە مەدینە لەوانە: ئەبوبەکر، عومەر، عوسمان، علی، عبد الله کوری مەسعود، عبد الله کوری عەباس، ئەبو دەردا، تەڵحە، سەعد، ئەبو عوبیدە، عبد الرحمن کوری عەوف، حوزەیفە، ئەبو هورەیرە، سالم، عبد الله کوری عومەر، عبد الله کوری عەمری کوری عاس، عائشە. حەفسە...

وە زۆری تریش ڕەزای خوایان لێبێ، نابێ لە قسەی ئەنەس هەڵە تێبگەین کە دەڵێ پێغەمبەری خوا وەفاتی کرد بێجگە لە چوار کەس کەسی تر قورئانی کۆ نەکردبۆوە: عَنْ أَنَسٍ ، قَالَ : مَاتَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، وَلَمْ يَجْمَعِ الْقُرْآنَ غَيْرُ أَرْبَعَةٍ ؛ أَبُو الدَّرْدَاءِ، وَمُعَاذُ بْنُ جَبَلٍ، وَزَيْدُ بْنُ ثَابِتٍ، وَأَبُو زَيْدٍ. قَالَ : وَنَحْنُ وَرِثْنَاهُ.





چونکە مەبەست لە کۆکردنەوە نوسینەوە بوە، ئەمە بێجگە لە وە ئەنەس خۆی مەدینەیی بوە لە ١٣ ساڵی مەکە بێئاگایە، وە خۆشی کە پێغەمبەر هاتوە بۆ مەدینە تەمەنی دەساڵ بوە، وە ئەمە تەنیا بە پێی زانیاری خۆی قسەی کردوە ئاگاداری تەواوی هاوەڵان نەبوە.

وەریوایەتی ترمـان هەیە بـاس لە کەســــانی تریش دەکـا کە قورئـانیـان کۆکردۆتەوە: " خُذُوا الْقُرْآنَ مِنْ أَرْبَعَةٍ ؛ مِنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ مَسْعُودٍ - فَبَدَأَ بِهِ - وَسَالِمٍ - مَوْلَى أَبِي حُذَيْفَةَ - وَمُعَاذِ بْنِ جَبَلٍ، وَأُبَيِّ بْنِ كَعْبٍ ، رواه البخاري ٣٨٠٨ .

دەبینی لەم ریوایەتە سەحیحەدا ناوی عبد الله کوری مەسعودیش هەیە، وە ناوی سالم ش هەیە کەواتە ئەوە بەڵگەیە کە ریوایەتەکەی ئەنەس مانای حەسری لێوەرناگیرێ، نوسینەوەی قورئان لەسەردەمی پێغەمبەری خوادا علیه الصلاة والسلام تەواو نوسراوەتەوە.

وێرای لە بەرکردنیشی بە پێی ئەم بەڵگانە:

١. فەرمانی پێغەمبەری خوا بە نوسینەوەی.

٢. بونی کاتب وەحی زۆر زیاتر لەوانەی کە باسمانکرد.

٣. نوسینەوەی قورئان لەم کەل و پەلانەدا: أَنَّ زَيْدَ بْنَ ثَابِتٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ قَالَ: أَرْسَـــلَ إِلَيَّ أَبُو بَكْرٍ مَقْتَلَ أَهْلِ الْيَمَامَةِ فَإِذَا عُمَرُ بْنُ الْخَطَّابِ عِنْدَهُ، قَالَ أَبُو بَكْرٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ : إِنَّ عُمَرَ أَتَانِي، فَقَالَ : إِنَّ الْقَتْلَ قَدِ اسْـــتَحَرَّ يَوْمَ الْيَمَامَةِ بِقُرَّاءِ الْقُرْآنِ، وَإِنِّي أَخْشَى أَنْ يَسْـتَحِرَّ الْقَتْلُ بِالْقُرَّاءِ بِالْمَوَاطِنِ فَيَذْهَبَ كَثِيرٌ مِنَ الْقُرْآنِ، وَإِنِّي أَرَى أَنْ تَأْمُرَ بِجَمْعِ الْقُرْآنِ. قُلْتُ لِعُمَرَ : كَيْفَ تَفْعَلُ شَــيْئًا لَمْ يَفْعَلْهُ رَسُــولُ اللَّهِ صَــلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَـــلَّمَ ؟ قَالَ عُمَرُ : هَذَا وَاللَّهِ خَيْرٌ. فَلَمْ يَزَلْ عُمَرُ يُرَاجِعُنِي حَتَّى شَرَحَ اللَّهُ صَـــدْرِي لِذَلِكَ، وَرَأَيْتُ فِي ذَلِكَ الَّذِي رَأَى عُمَرُ. قَالَ زَيْدٌ : قَالَ أَبُو بَكْرٍ : إِنَّكَ رَجُلٌ شَــابٌّ عَاقِلٌ لَا نَتَّهِمُكَ، وَقَدْ كُنْتَ تَكْتُبُ الْوَحْيَ لِرَسُــولِ اللَّهِ صَــلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَـلَّمَ، فَتَتَبَّعِ الْقُرْآنَ فَاجْمَعْهُ، فَوَاللَّهِ لَوْ كَلَّفُونِي نَقْلَ جَبَلٍ مِنَ الْجِبَالِ مَا كَانَ أَثْقَلَ عَلَيَّ مِمَّا أَمَرَنِي بِهِ مِنْ جَمْعِ الْقُرْآنِ. قُلْتُ : كَيْفَ تَفْعَلُونَ شَيْئًا لَمْ يَفْعَلْهُ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ ؟ قَالَ : هُوَ وَاللَّهِ خَيْرٌ. فَلَمْ يَزَلْ أَبُو بَكْرٍ يُرَاجِعُنِي حَتَّى شَرَحَ اللَّهُ صَـــدْرِي لِلَّذِي شَرَحَ لَهُ





صَـدْرَ أَبِي بَكْرٍ، وَعُمَرَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا، فَتَتَبَّعْتُ الْقُرْآنَ أَجْمَعُهُ مِنَ الْعُسُـبِ وَاللِّخَافِ، وَصُدُورِ الرِّجَالِ حَتَّى وَجَدْتُ آخِرَ سُـورَةِ التَّوْبَةِ مَعَ أَبِي خُزَيْمَةَ الْأَنْصَارِيِّ لَمْ أَجِدْهَا مَعَ أَحَدٍ غَيْرِهِ : { لَقَدْ جَاءَكُمْ رَسُـولٌ مِنْ أَنْفُسِكُمْ عَزِيزٌ عَلَيْهِ مَا عَنِتُّمْ } ، حَتَّى خَاتِمَةِ بَرَاءَةَ، فَكَانَتِ الصُّــحُفُ عِنْدَ أَبِي بَكْرٍ حَتَّى تَوَفَّاهُ اللَّهُ، ثُمَّ عِنْدَ عُمَرَ حَيَاتَهُ، ثُمَّ عِنْدَ حَفْصَــةَ بِنْتِ عُمَرَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُا، رواه البخاری ،٤٩٨٦

العسب: پێستەی دار خورما

اللخاف: بەردی تەنک

الرقاع: پێستەی حەیوان و گەڵا

قطع الادیم: پێستە

عظام الاکتاف: ئێسکی شان

الاضلاع: ئیسکی پەراسو

صدور الرجال: سنگی پیاوان

کەواتە ئەو کەل و پەلانەی کە لەوکاتیدا هەبوە قورئانی لەسەر نوسراوەو لە ماڵی پێغەمبەردا پارێزراوە بە تایبەت لە ماڵی حەفسە.





**بۆچی لەسەردەمی پێغەمبەردا کۆنەکراوەتەوە لە موسحەفدا:**

یەکەم: داخوازی نوسینەوەی قورئان لەسەردەمی پێغەمبەردا نەبوە وەک لە دواتر دا هەبوو.

دووەم: پێغەمبەر لە چاوەڕوانی دابەزینی قورئانی پیرۆزدابوو.

سێ یەم: قورئانیش بە یەکجار دانەبەزیوە بەش بەش دابەزیوە.

چوارەم: ڕێکخستنی قورئان بە تەرتیبی دابەزین نەبوە.

پێنجەم: لەو کاتەشدا هاوەڵان زۆربون کە ئەو قورئانەیان لەبەر بوە کە دابەزیوە.

**کۆکردنەوەی قورئان لەسەردەمی ئەبوبەکردا ڕەزای خوای لێبێ:**

ئەبوبەکر لە دوای وەفاتی پێغەمبەر کۆڵی زۆر گران بوە و توشی چەندین ڕووداوی گەورەبوو، بە تایبەتی ڕوداوی کودەتای عەرەبەکان و شەری موسەیلەمەی درۆزن کە لەشەری یەمامە زیاتر لە حەفتا کەس لەوانەی حافیزی قورئانبو شەهیدبوون، بۆیە عومەر هەستی بەو مەترسیە گەورەکردو بە ئەبوبەکری وت کە هەستن بە کۆکردنەوەی قورئانی پیرۆز، ئەبوبەکریش دوو دڵبوو لە بەرئەوەی کارێکی گەورەبوو وەپێغەمبەریش نەیکردبوو، بەڵام دواتر ئەبوبەکر قەناعەتی بۆ دروستبوو وە ئەویش بانگی زەیدی کوری سابتی ئەنساری کرد کە گەنج بوو ، قورئانی لەبەردابو، زۆر وریاو موتەقی بو، توانیبوی بە ١٧ ڕۆژ فیری زمانی عیبری جولەکە ببێ، لە کاتێک ئەم هەواڵەیان پێدا شۆکبوو، وە وتی چۆن کارێک بکەم پێغەمبەری خوا نەیکردوە؟!، بەڵام دوایە ئەویش قەناعەتی هات و بە چاوەدێری ڕاستەوخۆی خودی خەلیفەو ئیمامی عومەر لیژنەیەکی چوار کەسی پێکهات بە سەرۆکایەتی زەید رەزای خوا لە هەموویان بێ.





ئەمە دەقی ئەو ریوایەتەیە کە لە بوخاریدا هاتوە: عنَّ زَيْدَ بْنَ ثَابِتٍ الْأَنْصَارِيَّ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ - وَكَانَ مِمَّنْ يَكْتُبُ الْوَحْيَ - قَالَ : أَرْسَلَ إِلَيَّ أَبُو بَكْرٍ مَقْتَلَ أَهْلِ الْيَمَامَةِ وَعِنْدَهُ عُمَرُ، فَقَالَ أَبُو بَكْرٍ : إِنَّ عُمَرَ أَتَانِي، فَقَالَ : إِنَّ الْقَتْلَ قَدِ اسْتَحَرَّ يَوْمَ الْيَمَامَةِ بِالنَّاسِ، وَإِنِّي أَخْشَى أَنْ يَسْتَحِرَّ الْقَتْلُ بِالْقُرَّاءِ فِي الْمَوَاطِنِ ؛ فَيَذْهَبَ كَثِيرٌ مِنَ الْقُرْآنِ إِلَّا أَنْ تَجْمَعُوهُ، وَإِنِّي لَأَرَى أَنْ تَجْمَعَ الْقُرْآنَ. قَالَ أَبُو بَكْرٍ : قُلْتُ لِعُمَرَ : كَيْفَ أَفْعَلُ شَيْئًا لَمْ يَفْعَلْهُ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ ؟ فَقَالَ عُمَرُ : هُوَ وَاللَّهِ، خَيْرٌ. فَلَمْ يَزَلْ عُمَرُ يُرَاجِعُنِي فِيهِ حَتَّى شَرَحَ اللَّهُ لِذَلِكَ صَدْرِي، وَرَأَيْتُ الَّذِي رَأَى عُمَرُ. قَالَ زَيْدُ بْنُ ثَابِتٍ : وَعُمَرُ عِنْدَهُ جَالِسٌ لَا يَتَكَلَّمُ. فَقَالَ أَبُو بَكْرٍ : إِنَّكَ رَجُلٌ شَابٌّ عَاقِلٌ، وَلَا نَتَّهِمُكَ، كُنْتَ تَكْتُبُ الْوَحْيَ لِرَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، فَتَتَبَّعِ الْقُرْآنَ فَاجْمَعْهُ. فَوَاللَّهِ لَوْ كَلَّفَنِي نَقْلَ جَبَلٍ مِنَ الْجِبَالِ مَا كَانَ أَثْقَلَ عَلَيَّ مِمَّا أَمَرَنِي بِهِ مِنْ جَمْعِ الْقُرْآنِ. قُلْتُ : كَيْفَ تَفْعَلَانِ شَيْئًا لَمْ يَفْعَلْهُ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ ؟ فَقَالَ أَبُو بَكْرٍ : هُوَ وَاللَّهِ خَيْرٌ. فَلَمْ أَزَلْ أُرَاجِعُهُ حَتَّى شَرَحَ اللَّهُ صَدْرِي لِلَّذِي شَرَحَ اللَّهُ لَهُ صَدْرَ أَبِي بَكْرٍ وَعُمَرَ، فَقُمْتُ، فَتَتَبَّعْتُ الْقُرْآنَ أَجْمَعُهُ مِنَ الرِّقَاعِ، وَالْأَكْتَافِ، وَالْعُسُبِ ، وَصُدُورِ الرِّجَالِ حَتَّى وَجَدْتُ مِنْ سُورَةِ التَّوْبَةِ آيَتَيْنِ مَعَ خُزَيْمَةَ الْأَنْصَارِيِّ لَمْ أَجِدْهُمَا مَعَ أَحَدٍ غَيْرِهِ : { لَقَدْ جَاءَكُمْ رَسُولٌ مِنْ أَنْفُسِكُمْ عَزِيزٌ عَلَيْهِ مَا عَنِتُّمْ حَرِيصٌ عَلَيْكُمْ } . إِلَى آخِرِهِمَا، وَكَانَتِ الصُّحُفُ الَّتِي جُمِعَ فِيهَا الْقُرْآنُ عِنْدَ أَبِي بَكْرٍ حَتَّى تَوَفَّاهُ اللَّهُ، ثُمَّ عِنْدَ عُمَرَ حَتَّى تَوَفَّاهُ اللَّهُ، ثُمَّ عِنْدَ حَفْصَةَ بِنْتِ عُمَرَ.رواه البخارئ،٤٦٧٩

**تایبەتمەندی موسحەفی ئەبوبکر:**

یەک: ئەبوبەکر راستەو خۆ لە گەڵ ئیمامی عومەر سەرپەرشتی پرۆژەکەی دەکرد.

دوو: هەموو مەرجەکانی زانستی تێدا بوو، وەک کەسانی شارەزا، بە تەقوا، حافزی قورئان.

سێ: تەنیا لە وانە قورئان وەرگیراوە کە جێگای متمانە بوون.

چوار: دەبێ دوو کەس شایەتی لەسەر نوسینەکە بدا کە فلان کەس نوسیویەتی لە بەر قیرائەتی پێغەمبەر علیه الصلاة والسلام.





ئەو نوسخەیەش کە لە ماڵی پێغەمبەردا بوە واتە لە ماڵی حەفسە لە بەردەستدا بوەو دواتر لە جێگای خۆی دانراوەتەوە.

کەواتە ئەو کۆکردنەوەی ئەبوبکرو هاوەڵان پێی هەستان بەو پەری ئەمانەت و زانستی و متمانەیی بوە، چونکە هێشتا کەمتر لە دوو ساڵە پێغەمبەری خوا وەفاتی کردوە بەڵکو لە وانەیە زۆر لەوە کەمتر بێ چونکە دوای وەفاتی پێغەمبەر ڕاستەو خۆ کودەتاچیەکان ڕاپەڕین، هەر ئەوەش هۆکاری ئەم بڕیارەبوو. وە هێشتا زۆرینەی هاوەڵان زیندون وە زەمانی پادشایەتی و هەڕەشەکردن دەستی پێنەکردوە تا بڵێین لە ترسی ئەوان خەڵک نەوێراوە ڕەخنە بگرێ وە ئەگەر هەڵەیەک ڕوویدابێ دەیان و سەدان لە هاوەڵان زیندون بۆ ئەوەی ڕاستی کەنەوەو ڕەخنە بگرن، کەواتە موسحەفێک دانراو و کۆکرایەوە کە تەئکید کردنەوە بوو لە سەر ئەوەی کە لە پێغەمبەر وەریان گرتبوو لە ماوەی ٢٣ ساڵی پێغەمبەرایەتی.



## کۆکردنەوی قورئان لە زەمانی عوسمانی کوڕی عەفاندا ڕەزای خوای لێبێ:

أَنَّ أَنَسَ بْنَ مَالِكٍ حَدَّثَهُ، أَنَّ حُذَيْفَةَ بْنَ الْيَمَانِ قَدِمَ عَلَى عُثْمَانَ وَكَانَ يُغَازِي أَهْلَ الشَّأْمِ فِي فَتْحِ إِرْمِينِيَةَ وَأَذْرَبِيجَانَ مَعَ أَهْلِ الْعِرَاقِ، فَأَفْزَعَ حُذَيْفَةَ اخْتِلَافُهُمْ فِي الْقِرَاءَةِ، فَقَالَ حُذَيْفَةُ لِعُثْمَانَ : يَا أَمِيرَ الْمُؤْمِنِينَ، أَدْرِكْ هَذِهِ الْأُمَّةَ قَبْلَ أَنْ يَخْتَلِفُوا فِي الْكِتَابِ اخْتِلَافَ الْيَهُودِ، وَالنَّصَارَى. فَأَرْسَلَ عُثْمَانُ إِلَى حَفْصَةَ أَنْ أَرْسِلِي إِلَيْنَا بِالصُّحُفِ نَنْسَخُهَا فِي الْمَصَاحِفِ، ثُمَّ نَرُدُّهَا إِلَيْكِ. فَأَرْسَلَتْ بِهَا حَفْصَةُ إِلَى عُثْمَانَ، فَأَمَرَ زَيْدَ بْنَ ثَابِتٍ، وَعَبْدَ اللَّهِ بْنَ الزُّبَيْرِ، وَسَعِيدَ بْنَ الْعَاصِ، وَعَبْدَ الرَّحْمَنِ بْنَ الْحَارِثِ بْنِ هِشَامٍ، فَنَسَخُوهَا فِي الْمَصَاحِفِ، وَقَالَ عُثْمَانُ لِلرَّهْطِ الْقُرَشِيِّينَ الثَّلَاثَةِ : إِذَا اخْتَلَفْتُمْ أَنْتُمْ وَزَيْدُ بْنُ ثَابِتٍ فِي شَيْءٍ مِنَ الْقُرْآنِ فَاكْتُبُوهُ بِلِسَانِ قُرَيْشٍ ؛ فَإِنَّمَا نَزَلَ بِلِسَانِهِمْ. فَفَعَلُوا حَتَّى إِذَا نَسَخُوا الصُّحُفَ فِي الْمَصَاحِفِ رَدَّ عُثْمَانُ الصُّحُفَ إِلَى حَفْصَةَ، وَأَرْسَلَ إِلَى كُلِّ أُفُقٍ بِمُصْحَفٍ مِمَّا نَسَخُوا، وَأَمَرَ بِمَا سِوَاهُ مِنَ الْقُرْآنِ فِي كُلِّ صَحِيفَةٍ، أَوْ مُصْحَفٍ أَنْ يُحْرَقَ. رواه البخاری ، ٤٩٨٧

**لەم ریوایەتە سەحیحە هۆکاری ئەو هەوڵەی خەلیفە عوسمانمان بۆ ڕووندەبێتەوە کە خیلاف و ناکۆکی بوە لە خوێندنەوەی قورئانی پیرۆز:**

١. لە سەردەمی خیلافەتی عوسماندا دەسەڵاتی ئیسلامی فراوانبوو خەڵکانێکی تازە مسوڵمانبون شارەزاییان بە قیرائەتی قورئان و حەوت پیتەکان نەبوو، وە خەڵکی هەر ناوچەیەک قورئانیان لەو مامۆستایە وەرگرتبوو کە لای ئەوانبو لە هاوەڵانی پێغەمبەر، لە کاتێک ئەوانە بە یەکدەگەیشتن و قورئانیان دەخوێند جیاوازی لە نێوانیاندا هەبوو وە یەکتریان بە هەڵە دادەناو جاروابوو دەبوو بە شەرو ئاژاوە، لە بەر ئەوەی شارەزای جۆرەکانی قیرائەت و جیاوازی پیتەکان نەبوو، هەتا جار وابوو یەکتریان کافر دەکرد، ئەو دەیگوت قورئانی من تەواوە ئەویتر دەیوت قیرائەتی من ڕاسترە لە کاتێکدا هەردووکیان تەواو بوون، بە عوسمانیان وت فریای ئەو ئومەتە بکەوە تا وەک جولەکەو گاور پارچە پارچە نەبون بە هۆی جیاوازیان لە خوێندنەوەی قورئان، عوسمان وتی ئەوە ڕاستە، ئێوە لە لای منن ڕاجیاییتان هەیە لە خوێندنەوەی قورئان ئەدی ئەوانەی دورن دەبێ حاڵیان چۆنبێ؟!هەر بۆیە ڕای هاتە سەر ئەوەی کە جارێکی تر قورئان



کۆبکاتەوە بەڵام نەوەک لە بەر ترسان لە فەوتان بەڵکو لە بەر ئیختلاف و ڕاجیایی لە خوێندنەوەی قورئان.

٢. عوسمان لە کۆتایی ساڵی ٢٤ کۆچی دەستی بەوکارە کرد، ئەو نوسخانەی کە هەبون لای زەیدی کوری سابت و عبد الله ی کوڕی زوبەیرو، سەعیدی کوڕی عاس و عبدالرحمن ی کوڕی حارس بێجگە لە زەیدی کوری سابت ئەوانی تر لە قورەیش بوون، وە ناردیشی بە شوێن ئەو موسحەفەی کە ماڵی حەفسەدابو، ئەو نوسخەی کە نوسیبویانەیەوە لە هەمویان وەرگیرابو.

٣. کاری هەرە گرنگی ئەو لیژنەیە خاڵیکردنی ئەو نوسخەیە بوو لە قیرائاتی تەفسیری کە پێی دەوترێ قیرائاتی شاز، وە ڕێکخستنی ڕەسمی نوسراوی وشەکان و پیتەکان.

٤. هێشتنەوەی تەنیا ئەوەی کە موتەواتر بوو.

٥. ڕیزبەندی لە نێوان سورەت و ئایەتەکاندا.

٦. وە هێشتنەوەی تەنیا ئەو نوسخەیە کە لە زەمانی عوسمان نوسرایەوە و سوتاندنی ئەوەکانی تر.

**لەسەر کۆکردنەوەی قورئان بە شێوەیەکی گشتی کۆمەڵێک گومانی تریش دەوەروژێنرێن لەوانە:**

گومانی یەکەم: مادام قورئان کۆدەکرێتەوە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە دیارە نوقسانی لە قورئاندا هەیە وە بەڵگەشیان بەو فەرمووده هێناوەتەوە کە پێغەمبەری خوا فەرمویەتی: عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا، قَالَتْ : سَمِعَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ رَجُلًا يَقْرَأُ فِي الْمَسْجِدِ، فَقَالَ : " رَحِمَهُ اللَّهُ، لَقَدْ أَذْكَرَنِي كَذَا وَكَذَا آيَةً أَسْقَطْتُهُنَّ مِنْ سُورَةِ كَذَا وَكَذَا رواه البخاري. واتە: لە دوای ئەوەی پێغەمبەری خوا گوێی لە پیاوێک بوو قورئانی دەخوێند لە مزگەوت فەرموی ڕەحمەتی خوا لە





فلاّن کەس بێ فلان ئایەت و فلاّن ئایەتی برخستمەوە لە دوای ئەوەی لە بیرمکردبون.

وەڵام: مەرج نیە کۆکردنەوەی قورئان لە بەرناتەواوی و کەم و کورتی بێ، بەڵکو بۆ دڵنیابونەوەو پاراستنیەتی لە وەی دەستی خیانەتی تێبکەوێ، وە بۆ ئەوەی جیلەکانی دواتر قورئانیان بە تەواوی لە بەردەستدابێ ئەم فەرموودەیە هاوەڵان لە پێغەمبەرەوە فێری ببون و وەریانگرتبوو، وە لە بیر چونەوە بە مانای مەحو ڕەشبونەوە نایا لە زاکیرەو دەماغ جار وایە شتێکت بیر دەچێتەوە بە کەمترین ئاماژە بیرت دەکەوێتەوە، جاری وایە کەسێک سەری ئایەتێکت بۆ بخوێنێ هەموویت بیر دەکەوێتەوە، بێجگە لەوەش هاوەڵان ئەم ئایەتانەیان لە بەرکردوە، جگە لەوەش بە نوسین لە لای چەندین نوسەری وەحی هەبوە، وە لە موسحەفەکەی ماڵەوەو لای هاوەڵانیش هەبوە، ئایا لە بیر چونەوەیەکی وا چ زیانێک دەگەیەنێ؟.

گومانی دووەم: دەڵێن ئەو جیاکردنەوەی کە خوا جیای کردۆتەوە بەڵگەیە لە سەر نەمان و بزربون و لە بیر چونەوەی قورئان(الإستثناء): سَنُقْرِئُكَ فَلَا تَنسَىٰٓ (الأعلى: ٦) ئەی موحەممەد(صلى الله عليه وسلم) قورئانت بەسەردا دەخوێنینەوەو هەرگیز بیرت ناچێتەوە، إِلَّا مَا شَآءَ ٱللَّهُ إِنَّهُۥ يَعْلَمُ ٱلْجَهْرَ وَمَا يَخْفَىٰ (الأعلى: ٧) مەگەر ئەوەی کە خوا بیەوێت بێگومان ئەو بە هەموو شتێکی ئاشکراو پەنهان ئاگادارە.

وەڵام: ئەو جیاکردنەوە(استثناء) جیاکردنەوەیەکی حەقیقی نیە، واتە مەبەست ئەوە نیە کە لە بیر پێغەمبەر ببرێتەوە وە مەبەست ئەوەیە کە خوای گەورە دەسەڵاتی ڕەهای هەیە هەرچی بیەوێ دەیکا هیچ ڕێگریەک نیە بەڵام نایکا، وەک دەفەرموێ: إِنْ هُوَ إِلَّا ذِكْرٌ لِّلْعَٰلَمِينَ (التكوير: ٢٧) لِمَن شَآءَ مِنكُمْ أَن يَسْتَقِيمَ (التكوير: ٢٨) وَمَا تَشَآءُونَ إِلَّآ أَن يَشَآءَ ٱللَّهُ رَبُّ ٱلْعَٰلَمِينَ (التكوير: ٢٩) واتە





خوای گەورە قەت نایەوێ بەندەکانی لە سەر ڕێگای ڕاست نەبن و خۆیان ڕاست نەکەنەوە بە قورئان،

بەڵام خوای گەورە دەیەوێ پێمان بڵێ خوای گەورە دەسەڵاتی ڕەهای هەیە هەرچی بیەوێ دەیکا. وە لە هۆکاری دابەزینەکەش دەردەکەوێ کە لە بیرچونەوە مەبەست نیە، بەڵکو بە پێچەوانەوە مەبەست دڵنیابوونە چۆن؟ چونکە پێغەمبەر زۆر خۆی ناڕەحەت دەکرد بە وتنەوەو لە بەرکردنی قورئان، بۆیە خوای گەورە پێی دەفەرموێ خۆت ناڕەحەت مەکە، ئەگەر بمەوێ لە بیرت بەرمەوە کەس توانای نیە بیرت بخاتەوە، کەواتە ئامانجەکە پێچەوانەیە.

گومانی سێیەم: گوایە هاوەڵان لە کاتی کۆکردنەوەی قورئان ئەوەی حەزیان لێبێ و نەیانویستبێ لایانداوە.

وەڵام: ئەم گومانە پوچە، چونکە هاوەڵان لەوە بە تەقواتربوون کە دەسـكاری قورئـان بکەن. وە ئەوان ئەو ریوایەتـانەیـان لابردوە کە متواتر نەبوەو وەک تەفســیر گوتراوە بۆ قورئـان، چونکە نـاکرێ ئەوانەی کە لە هەموو کەس لە قورئـان شـــارەزاترن هەڵەی وابکەن. وە لە هـاوەڵان هەبوە دوعـای قنوتی لە موســحەفەکەی خۆی داناوە وەک ئوبەییە، ئەوە مانای ئەوە نیە وەک قورئان دایـنـابێ لە موســحەفەکەی خۆی، وەک دوعـا دایـنـاوە بەبەڵگەی ئەوەی لە موسحەفەکەی ماڵی حەفسەو ئەوەکانی تر نەبوە، یان هاوەڵ هەبوە تەفسیری ئایەتی واتە مەئسـوری لای خۆی نوسـیوە ئەوە مانای ئەوە نیە کە قورئانە، وە نمونەی وا زۆرە چونکە ئەمانە کاری شەخسین و وە متواتریش نین.

گومانی چوارەم: دەڵێن هەندێک لە ئایەتەکان لای هەندێک لە هاوەڵان بون ئەوانیش کوژراون و وەفاتیان کردوە، کەواتە زەمان نیە بۆ پاراستی قورئان.





وەڵام: بە بونی پێغەمبەر وجودی زۆربەی هاوەڵانی قورئانخوێن و نوسەرانی وەحی و نوسینەوەی سێ جار وەحی هیچ مەجالێک بۆ ئەو جۆرە گومانە نامێنێ.

گومانی پێنجەم: وە دەڵێن قورئان چۆن دەکرێ ناتەواو نوقسان بێ، دەشکرێ زیادەی تێکەوتبێ بە بەڵگەی ئەوەی کە عبد الله کوری مسعود ئینکاری ئەوەی کردوە کە (معوذتین) واتا سورەتی الفلق و سورەتی الناس قورئان بن.

وەڵام: ئەوە کە لە ئیبن مەسعود نەقڵکراوە کە گوایە فاتیحەو معوذتین قورئان نیە ڕاست نیە ئیمامی نەوەوی دەفەرموێ مسوڵمانان یەکدەنگن لە سەر ئەوەی کە فاتیحەو معوذتین قورئانی پیرۆزن، ئەوەی کە لە ئیبن مەسعودەوە نەقڵکراوە ڕاست نیە کە گوایە ئینکاری فاتیحەو معوذتین کردوە .کەواتە مادام کەسانی پسپۆر دەڵێن نەقڵەکە ڕاست نیە، وە قورئانی بونەکەشی متواترە هیچ گومان نامێنێتەوە وە ئەگەر گریمان قسەکەی ئیبن مەسعود ڕاستیش بێ نابێتە بەڵگە چونکە پێچەوانەی لە خۆی ڕاسترە، وە ئەوانەی لە حیفزیان بەهێزترە پێچەوانەی ئەون وە لە هیچکام لە لیژنەکان ئیبن مەسعودی تیا نەبوە چ ئەوەی کە زەمانی ئەبوبەکر، وە چ لەوەی زەمانی عوسمان کەواتە لەو بە هێزترو پشت پێبەستراوتر هەبون.

وە لەوانەیە ئەو کاتەی ئەوەی وتبێ زانیاری تەواو لەسەر ئەم سورەتانە نەبوە بە تایبەت معوذتین بەڵام دواتر کە بۆی ڕوونبۆتەوە ئینکاری نەکردوە دیارە بەڵگەی زۆر هەیە لەسەر ڕاستی پارێزرانی قورئانی پیرۆز، وە چەندین کتاب لەو بوارەدا نوسراون من ئیکتفا بەو ئەندازەیە دەکەم، دەکرێ ئەگەر پێویستی کرد لە کتابێکی تایبەتدا ئەم بابەیە وەڵام بدرێتەوە وە کراویشە سوپاس بۆ خوا، بە زمانی کوردی نوسراو لەو بوارەدا هەیە.



تەوەری نۆیەم:

## جۆرەکانی تەفسیر و مەنهەجی موفەسیرەکان

یەکێک لەو بابەتانەی کە زۆر گرنگە و پێویستە کە گرنگیدەران بە قورئان لێی شارەزا بن جۆرەکانی تەفسیرو مەنهەجی موفەسیرەکان و ڕاڤەکارانی قورئانی پیرۆزە، چونکە گومان لەوەدا نیە کە موفەسیرەکان هەموویان بە یەک مەنهەج و یەک شێوە قورئانیان تەفسیر نەکردوە، هەر موفەسیرێک زیاتر گرنگی بە لایەنێک یان چەند لایەنێک زیاتر داوە لە لایەنەکانی تر، چونکە پێی وابوە ئەوا زیاتر خزمەت بە قورئانی پیرۆز دەکا، وە ئێمە دەشکرێ سودمەندبین لەو قوتابخانە جیاوازیانەی تەفسیری قورئانی پیرۆز، بەڵام مەرج نیە هەموو بە ئەندازەی یەک بە سود بێ، وە دەشتوانین بڵێین هیچی تەواو لە کەم و کوڕی خاڵی نیە بەڵام کەم و کورتیش ڕێژەییە. ئێمە هەوڵدەدەین بە کورتی و گوشراوی ئاماژە بەچەند ئاداب و پێویستیەکانی تەفسیر و مەنهەجەکان و جۆرەکانی تەفسیر بکەین.

## پێناسەی مەنهەجی ڕاڤەکارانی قورئان

تعریف مناهج المفسرين مەبەست لە(مناهج المفسرين) مەنهەجی موفەسیرەکان چیە؟ مەبەست لە مەنهەجی ڕاڤەکاران (مناهج المفسرين) ئەو پلانە زانستی و بابەتیانەو ڕوونانەیە کە ڕاڤەکاری قورئانی پیرۆز پێیەوە پابەند دەبێ، بە ڕەچاوکردنی ئەو بنچینەو زانیاریانەی کە پێویستن بۆ ئەو بوارە، کەواتە مەنهەجی موفەسیر ئەو مەنهەج و بنچینەو ڕێوو شوێنەیە کە موفەسیر پێیەوە پابەند دەبێ لە کاتی تەفیسرکردنی بۆ قورئانی پیرۆز.

وە کەمیش وا هەیە ڕاڤەکاری قورئان بتوانێ تەواو پابەند بێ بە تەواوی ئەو مەنهەجەی کە دایدەنێ بۆ ڕاڤەکردنی بۆ قورئانی پیرۆز.



**قۆناغەکانی تەفسیر بە چەند قۆناغێکی گرنگدا تێپەریوە و هەر قۆناغەش تایبەتمەندی خۆی هەیەو تەواوکاری ئەوی ترە:**

**قۆناغی یەکەم:**

قۆناغی دروستبون و دامەزران:

ئەم قۆناغە قۆناغێکی بنچینەیی و گرنگ بوە بۆ تەفسیری قورئان وە زۆر بابەتی و زانستی بوە، مەبەستمان لە زانستی و بابەتی ئەو ڕواڵەت و ڕۆتینە نەبوە کە تێیدا شتەکان بە ڕیزبەندی و وردەکاری و پێشەکی ناوەرۆک و کۆتایی و باسی سەرچاوە بێ، بەڵکو مەبەستمان ئەوەیە زانستی تەفسیر لە دایکبو، وە پسپۆری تێدابو، هەمووکەس تەفسیری لێوەرنەدەگیرا، وە زۆر پشت بە ریوایەت دەبەسترا. ئەم قۆناغە هەرسێ سەدە زێڕینەکە دەگرێتەوە، دامەزرێنەری ئەو قۆناغە خودی پێغەمبەری خوا بو علیه أفضل الصلوات وأزکی التسلیمات، هەرچەند پێغەمبەری خوا هەموو قورئانی تەفسیر نەکردوە، چونکە پێویست نە بوە چونکە قورئان بە زمانی ئەوان دابەزیوە کە عەرەب بون بەڵام مانای ئەوە نیە کە پێغەمبەر هیچ تەفسیرێکی قورئانی نەکردوە، بەڵکو پێغەمبەری خوا هەندێک تەفسیری گوفتاری (قولی ) هەبوە، وە بە کردەوەش قورئانی پیرۆزی جێبەجێ کردوە، وە نمونەی تەفسیری گوفتاری لە سەحیحی و بوخاری و سونەنی ترمزی دا هەیە.

لە دوای پێغەمبەری خوا هاوەڵان هەستاون بە پێی پێویست و پرسیارەکانی سەردەمی خۆیان ڕاڤەی قورئانی پیرۆزیان کردوە، وە بە شێک لە تەفسیرەکاندا پارێزراوە، وە لە ناوهاوەڵاندا خەڵکانێک بە ڕاڤەی تەفسیر بە ناوبانگ بون لەوانە:

- ✓ ئەبوبەکر
- ✓ عومەر
- ✓ عوسمان





- علی
- ئیبن مەسعود
- ئیبن عەباس
- ئوبەییەی کوری کەعب
- زەیدی کوری سابت
- ئەبو موسای ئەشعەری
- عبد اللهی کوری زوبەیر
- ئەبو دەرداء

**سێ قوتابخانەی تەفسیر لە زەمانی هاوەڵاندا پەیدابو:**

**قوتابخانەی تەفسیر لە مەککە**: کە لەسەر دەستی زانای ئومەت و تەرجومانی قورئان دامەزرا کە عبد اللهی کوری عەباس بو، لە قوتابیەکانی ئەو قوتابخانەیە: موجاهید، سەعیدی کوری جوبەیر، تاووس، عیکرەمە، عەتای کوری ریباح، جابری بن زەیدی ئەزدی.

**قوتابخانەی تەفسیر لە مەدینە**: لەسەر دەستی ئوبەییەی کوری کەعبی ئەنساری. لە دیارترینی قوتابیانی ئەو قوتابخانە: ئەبولعالییە، رەفیع بن میهران، موحەمەد بن کەعبلقورەزی، سەعیدی کوری موسەییەب، زەیدی کوری ئەسلەم.

**قوتابخانەی تەفسیر لە کوفە**: کە دامەزرا لە سەردەستی هاوەڵی گەورە عبد الله کوری مەسعود، لە دیارترین قویابیەکانی ئەو مەدرەسەیە: عەلقەمەی کوری قەیس، مەسروق، زیری کوری حوبەیش، عبد الله کوری حەبیبی سەلمی، ئەسوەدی کوری یەزیدی نەخەعی، عامری شعبی، حەسەنی بەسری، قەتادەی کوری دەعامەی سدوسی، عوبیدەی سەلمانی





دوای ئەوانە مەدەرەسی تابعی دێ بۆ ڕاڤەی قورئانی پیرۆز، دیارە ئەوانەی کە باسمان کردن لە قوتابییەکانی ئەو سێ مەدرەسەیە تابعی بون دواتر ئەوانە بونە سەرچاوەو مامۆستای تەفسیر بۆ دوای خۆیان، لە چینی سێ یەم لە تەبەقەی تابعی خەڵکانێک دەرکەوتن بە ڕاڤەکاری قورئان لەوانە: یەزیدی کوری هارونی سەلمی، شوعبەی کوری حەجاج، وەکیعی کوری جەراح، سوفیانی کوری عویەیینە، اسماعیلی کوری عبدالرحمن ی سەدی، موقاتیلی کوری سولەیمانی بەلخی، عبد الملیک کوری جورەیج، ئەبوبەبکری کوری ئەبی شەیبە، عبدالرزاق کوری هەمامی سنعانی، ئادەمی کوری ئەبی ئیاس، یەحیای کوری سەلامی بەسری، عەبدی کوری حەمید.

وە لەم قۆناغەشدا نوسینەوەی تەفسیر پەیدابو وەک کۆکردنەوەی قسەی زانایانی تەفسیر بە شێوەی سەربەخۆ لەوانە: تەفسیری موجاهید، تەفسیری ئیبن عەباس بە ریوایەتی علی کوری ئەبی تەلحە، تەفسیری حەسەنی بەسری، تەفسیری قەتادە، تەفسیری سوفیانی سەوری، تەفسیری عبدالرزاق سەنعانی.

لە قۆناغی دەمەرزراندن و پەیدابونی تەفسیر دوو جۆرە تەفسیر سەریان هەڵدا یان دەتوانین بڵێین سێ جۆر تەفسیر سەری هەڵدا:

یەکەم: تەفسیر بە مەئسور.

دووەم: تەفسیر کە لە ناو کتابی حەدیس نوسرابوو.

سێیەم: تەفسیری زمانەوانی.

**قۆناغی دووەم:**

ڕاڤەکردنی تەفسیر:

لە دامەزراندوە بۆ بنچینەداربون من(التأسیس الی التأصیل) ئەم قۆناغە پەیوەندی قۆناغبەندی بە پێش خۆیەوە هەیە، چونکە ئاساییە شتێک دابمەزرێ





هەر لە قۆناغی سەرەتاییدا نامێنێتەوە، بەڵکو پێشکەوتن و جوانکاری و وردەکاری و بنچینەداری بۆ زیاد دەبێ، تا سەردەمی ئیمامی تەبەری دوو ڕاڕەو و مەنهەجی تەفسیر هەبوو: مەنهەج و ڕاڕەوێکی زمانەوانی، وە مەنهەجێکی ئەسەری، التفسير بالمأثور ئیمامی تەبەری توانی هەردوو مەنهەجەکە کۆ بکاتەوە لە تەفسیرەکەیدا. مەنهەجی تەفسیری زمانەوانی وەک ئەخفەش و فەراء ئیجتهاداتی خۆیان تێکەڵی تەفسیری زمانەوانی نەدەکرد مەگەر بە کەمی نەبێ وە تەفسیری وەک سەدی گەورەو عبدالرزاق ئەوانیش بەس ئەسەریان نەقڵ دەکرد، بەڵام ئیمامی تەبەری هەردوو مەنهەجەکەی بەکارهێناو بۆچون و ڕوانگەی خۆشی خستە ناو تەفسیرەکەی کە بەراستی ئەمە قۆناغێکی نوێبو لە تەفسیردا وە گۆڕانکاری گەورەبوو. بۆیە دەتوانین بڵێین ئیمامی تەبەری رائیدی مەنهەجی کۆکەکەرەوە بو لە تەفسیردا.

**قۆناغی سێ یەم:**

پەیدابونی تەفسیری جۆراوجۆر:

لە دوای ئیمامی تەبەری تەفسیر قۆناغێکی نوێ و فراوانی بە خۆیەوە بینی، وە جۆرەها تەفسیر پەیدا بوو ، وە جار واهەیە بابەت و وردەکاری وا خزاوەتە ناو تەفسیر کەهیچ پەیوەندیشی بە تەفسیرەوە نەبوە، وە وای لێهاتوە هەر زانایەک کە تەفسیری کردوە ئەو لایەنەی زاڵکردوە کە خۆی تێیدا شارەزاو پسپۆربوە، بۆ نمونە:

- ئەوانەی لە بواری زمانەوانی و نەحوو سەرف و ڕەوانبێژی شارەزابوون ئەوە ئەو لایەنە زۆر زاڵە لە تەفسیرەکەیدا .
- ئەوانەی لە بواری ژیری و فەلسەفی شارەزا بوون ئەوە ئەو لایەنە تەواو بەسەر تەفسیرەکەیاندا زاڵە
- وە ئەوانەی لە بواری فیقهدا ڕۆچوون بە هەمان شێوە.





- ئەوانەی لایەنی تەسەووفی بەسەریاندا زاڵە بە هەمان شێوە.
- ئەوانەی لە بواری زانستی دەستی باڵایان هەیە تەفسیرێکی زانستی دەنوسن.
- وە بۆ بوارەکانی تریش هەر ڕاستە تەفسیرە جیاوازو جۆراوجۆرەکان هەر لەوە پەیدا بوە.

**قۆناغی چوارەم:**

تەفسیر لە قۆناغی نوێبونەوەدا:

تەفسیر هەتا نزیکەی سەدەی چواردەی کۆچی فراوانی بە خۆوە بینی بەڵام وێکچون زۆر بوو، بەڵام لە سەدەی ڕابردودا دەکرێ ناوی لێبنرێ سەدەی نوێبونەوە بە نیسبەت تەفسیرەوە، مەبەست لە نوێبونەوە هەر جۆرە نوێگەریەک نییە لە تەفسیر بەڵکو مەبەستمان ئەو جۆرە تەفسیرەیە کە خاوەنەکەی پابەندە بە یاساکانی تەفسیرو پابەندە بە روح و ئامانجی شەریعەت.

دەتوانین بڵێین سەردەمی نوێبونەوە بە موحەمەد عەبدەو قوتابییەکەی سەید موحەمەد ڕەشید رەزا دەست پێدەکا، بە راستی دەتوانین بڵێین ئەم دوو کەسە جوڵەو هەستانەوەیەکی باشیان بە تەفسیرکرد، وە لەدوای ئەوان مەدرەسەی ئیخوان خوێندنەوەو تەفسیری جوان و خوێندنەوەی جوانیان بۆ قورئانی پیرۆز کرد بە تایبەت حەسەن بەننا، وە دواتر سەید قوتب کە دواتر باسی دەکەین تەفسیرێکی جۆری (نوعی) بۆ قورئانی پیرۆزکرد، وە نوێگەری زانای کورد سەعید نەورەسی لێکدانەوەیەکی زۆر جوانی زانستی و ئیمانی بۆ قورئانی پیرۆزکرد، وە هەروەها سەعید حەوا، وە تەفسیری محاسن التأویل ی جەمالەدین قاسمی، وەتەفسیری أضواء البیان ی شینقیتی، وە تەفسیری التحریر والتنویری ئیبن عاشور، تا دەگاتە تەفسیری شەعراوی و نابلسی و ...





هەموو ئەوانە دەچنە ناو چوارچێوەی نوێگەری لە تەفسیردا بە جۆرێک لە جۆرەکان، دیارە تەفسیری تر یەکجار زۆرن دواتر لە جۆری ڕاڤەو مەنهەجەکان ئاماژەی پێدەکەین انشاء الله.

## مەرجەکانی تەفسیر

زانایان باس لەوە دەکەن کە هەموو کەس ناتوانێ باس لە تەفسیرو ڕاڤەی قورئانی پیرۆز بکا هەتا ئەو مەرجانەی تێدا نەبن:

١. شارەزای لە قورئانی پیرۆز: بە تێگەیشتنی باش لە وشەکان و ئامانجەکان، هۆکاری دابەزین قیرائات وە ئەوەی کە پێویستە بۆ تێگەیشتن لە قورئان، لە بیرمان نەچێ لەبەربوونی قورئان زۆر هاوکارە بۆ تێگەیشتنی زیاتر لە قورئانی پیرۆز.

٢. ئاگادار بوون لە سونەتی پێغەمبەری ئازیز: چونکە پێغەمبەری خوا هەم بە گوفتار، هەم بە ڕەفتار لێکدانەوەو ڕاڤەی قورئانی پیرۆزی کردوە، مەبەستمان ئەوە نیە کە پێغەمبەر تەفسیری ئایەت بە ئایەتی کردوە، بەڵام ئەوەی پێویستبوبێ باسی کردوەو ڕوونی کردۆتەوە، وە ئەگەر پێغەمبەر نەبێ ئێمە لە بواری کردەیی قورئان تێناگەین، وەک: نوێژ، زەکات، ڕۆژو، حەج، عەمرە، زۆر بواری تر، وە وردەکاریەکانی بیرو باوەڕ بەتایبەت باسی دوا رۆژو دۆزەخ و بەهەشت و قۆناغەکانی ڕۆژی دوایی...

٣، شارەزا بون لە سیرەو ژیانی پێغەمبەر علیه الصلاة والسلام: چونکە بەشێکی بەرچاو لەسەر هاوەڵان و ژیانی ئەوان و پرسیارەکانی ئەو دابەزیوە.

٤. شارەزا بوون لە تەفسیرەکان: کە لە ناویاندا وتەی زانایانی پێشینیان بۆ ئێمە گواستۆتەوە بێگومان بۆ ئێمە زەخیرەیەکی گەورەو پێویستە، هەڵبەتە ئەوە ڕاست نیە ئێمە بۆ هەموو شتێک بگەڕێینەوە بۆ ڕای زانایانی پێشین، بەڵام گومان لەوەدا نیە ئێمە خاوەن زەخیرەیەک و گەنجینەیەکی گەورەین، بەڵام





دەبێ وریا بین هەرچی نوسراوە بە ناوی زانایان و پێشینان هەر هەمووی ڕاست نیە، یان بۆچونی ئەوان موقەدەس نیە، مادام مەرفوع نەبێ بەسەنەدی سەحیحی واتای سەریح بۆ لای پێغەمبەری ئازیز عليه أفضل الصلوات وأتم التسليمات.

٥. شارەزابون لە غەریبی قوڕئان: زۆر فەرهەنگی جوان نوسراون بۆ ڕاڤەکردنی قوڕئان دەتوانین سودیان لێوەربگرین.

٦. شارەزا بون لە زمانی عەرەبی: لە فەرهەنگ و نەحو، صرف ، بەلاغە.

٧. شارەزابون لە (اصول الفقه): چونکە بە هۆی ئوسولی فیقە دەتوانین سوود لەوە وەربگرین کە سەرچاوەکانی شەریعەت کامەن و جۆرەکانی حوکم و بابەتی وشەکان (مباحث الالفاظ) وەک: ئەمر، نەهی، عام ،خاص، مطلق، مقيد، مجمل، مبين، ظاهر، نص، محكم، مفسر، عبارة النص، إشارة النص. إيماء النص، إقتضاء النص، مجتهد، إجتهاد، تقليد...

٨. شارەزابون لە زانستی قوڕئان: لە کۆن و تازەدا کتابی زۆر جوان دەربارەی زانستی قوڕئان نوسراوە دەکرێ سودیان لێوەربگیرێ.

٩. زانستی و مەعەریفەی سەردەمیانە: نابێ لەو پێشکەوتنانە بێئاگابین کە مرۆڤ لەو سەردەمەدا بە دەستی هێناوە، چونکە دەتوانین خزمەتێکی جوانی قوڕئانیان پێبکەین

١٠. ئەو تەفسیرە بابەتیانەی کە لەمڕۆدا نوسراون: چونکە توانیویانە زانیاری جوان دەربارەی ئەو بابەتە تایبەتیە کۆبکەنەوە.

١١. شارەزابوون لە بنچینەکانی تەفسیر: کە زۆر کتابی دەربارە نوسراوە.

١٢. شارەزابون لە مێژووی قوڕئان: چونکە ئەگەر مێژووی قورئان نەزانی ناتوانی لە بەسەرهاتی پێغەمبەران و کەسایەتیەکان تێبگەی.





١٣. شارەزا بون لە بیرو باوەڕی ئیسلامی: هەرچەندە بیروباوەڕی تەواو لە قورئان وەردەگیرێ بەڵام شارەزابوون لەو بوارە کەسی ڕاڤەکار زیاتر تواناداروبە هێزمان دەکا.

١٤. شارەزابون لە مەزاهیبە دینی و فیکریەکان ی کۆن و تازە.

دیارە ئەوانەی کە باسمان کردن هەموویان لە یەک ئاستی گرنگیدا نین بەڵام شارەزابوون لەو بوارانە کەسەکە تەواو ئاگادار دەکا بۆ ئەوەی تەفسیرێکی جوانی سەردەمیانەو وەڵامگۆی پێداویستیەکان و پرس و پرسیارەکانی خەڵک پێشکەش بکا

**سیفەت و ئادابەکانی موفەسیر**

دیارە هەبونی زانست بۆ نوسینەوەی تەفسیر بەس نیە. بەڵکو دەبێ ڕاڤەکاری قورئان خاوەنی چەندین خەسڵەتی جوان و ئاکاری بەرزبێ بۆ ئەوەی خوێنەر لە بەر خراپی کەسایەتی ڕاڤەکارەکە لە خوێندنەوەی تەفسیرەکەی یان تەفسیر بە گشتی ڕانەکا، کەسی وایە ڕاڤەی قورئانی کردوە هیچ لە مەقاسیدی شەریعەت نازانێ، یان تبدیع ی زانایانی ئومەتی کردوە، یان سوکایەتی بە نەیارو بۆچونە جیاوازیەکانی خۆیکردوە، جا بۆیە ئەو جۆرە تەفسیرە لە جیاتی ئەوەی هۆکاری هیدایەت بێ خەڵک گومڕا دەکا، لە جیاتی ئەوەی قورئان لای خەڵک خۆشەویست کا خەڵک لە قورئان بێزار دەکا، لە جیاتی ئەوەی وا نیشان بدا کە قورئان کتابی فریادڕەس و ڕزگاریکارە لە پەرتەوازەیی و شڵەژان و دواکەوتن ئەو بە هۆی ئەو دڵە پڕحیقدەی کە هەیەتی و بە هۆی زمانە زبرەکەی کە ڕەحم بەکەس ناکا هێندەی تر خەڵک دەخاتە گێژاوی پەرتەوازەی دواکەوتن و سەر لێشێوان.





بۆیە کۆمەڵێک خەسڵەت و ئادابی جوان هەیە زانایان دەفەرمون دەبێ ڕاڤەکاری قورئان پێیوە پابەند بێ بۆ ئەوەی تەفسیرەکەی سودی تەواو بە خوێنەر ببەخشێ:

١. سەلامەتی لە بیرو باوەڕ: ناکرێ کەسێک لە دین و دینداریدا تۆمەتبارو تاوانبار بێ وڕاڤەی قورئان بۆ خەڵک بکا، لەمڕۆدا نمونەی لەو جۆرەمان زۆرە لە علمانی و مولحیدو دین فرۆشەکان، خوێنەر خۆی دەزانێ کە لەم جۆرە کەسانە زۆرن پێویست ناکا ناو بێنین .

٢. دڵسۆز لە کارو کردەوەدا.

٣. کەسەکە بڕوای بە سونەت هەبێ و پێیەوە پابەند بێ: کەسێک ڕەفزی سونەت بکا بە گشتی متمانەی پێناکرێ کە قورئان بتوانێ تەفسیر بکا، ئێمەش ناڵێین تێبینیمان لە سەر سونەت و تەفسیری مەئسور نیە، بەڵام ئەوە مانای ئەوە نیە سونەت هەمووی ڕەتکەینەوە، من تەحەدا دەکەم قورئانیەک یەک نوێژم بە بێ سونەت بۆ بکا یان زەکاتی شەرعی بدا، یان حەج بکا

٤. دەبێ لە روی فیکرەوە ساغ و سەلامەت بێ و تێگەیشتنی لە ئیسلام دروست بێ، زۆر کەس هەیە زمانی عەرەبی دەزانێ بەڵام تێگەیشتنی بۆ ئیسلام نادروستە .

٥. نابێ بکەوێتە ژێر کاریگەری گروپە سەرلێشێواو لادەرەکان لە ڕاستە شەقامی ئیسلام.

٦. دەبێ جێگای متمانە بێ لای مسوڵمانان بەتایبەت ئەهلی دین و زانست.

٧. کەسێک نەبێ شوێن کەوتەی مادەو دونیایی بێ، مانای ئەوە نیە دونیای نەبێ، دەڵێین با دونیایی نەبێ، لە سەر مادە سازش لە سەر دین و دینداری نەکا.





٨.  کار بە قورئان و ئەحکام و ڕێنماییەکانی بکا بە پێی توانا.

٩. بە پێی توانا خۆی دووربگرێ لە تاوانی گەورە و بچوک.

١٠.  دەبێ گرنگی بەو بەهرانە بدا کە خوای گەورە پێیداوەو لەخزمەت تەفسیرو خزمەتی قورئان بەکاریان بێنێ.

١١. دەبێ خۆی دووربگرێ لەو شتانەی کە دەبنە هۆکاری تێ نەگەیشتن لە قورئانی پیرۆز، جا ئەمە زۆر شت دەگرێتەوە مادی و مەعنەوی.

١٢. وریایی و ئاگایی لە سەردەمی خۆی و ئەفکارو گروپە لادەرو دژە دین و میللەت.

١٣. ژیان لە ناو جەوی قورئان، بە زۆر خوێندنەوەو پێکاریگەربون و شەونوێژ پێکردن و دیراسەی بەردەوام

١٤. قورئان تەنیا بە زمانەوانی تەفسیر ناکرێ بۆیە شارەزایی مانا شەرعیەکان و عورفیەکان لە پێش بوارە زمانەوانیەکەن

١٥. دەکرێ خوێنەر بزانێ لە میانەی خوێندنەوەی تەفسیرەکەی ئەو کەسە لە چ سەردەمێکدا ژیاوە، واتە کەسەکە ویستویەتی تەفسیرەکەی بۆ قورئان وەڵامگۆی پرس و پرسیارو کێشەکانی سەردەمی خۆی بێ.

١٦. قورئان زۆرێکی چیرۆک و سەربوردەیە، بۆیە شارەزا بون لە مێژوو زۆر هاوکارە بۆ تێگەیشتن لە قورئانی پیرۆز.

١٧. دەکرێ ڕاڤەکاری قورئان لە هەموو جۆرە تەفسیرەکان بە پێی خۆی بەهرەمەندبێ بە بێ ئەوەی بکەوێتە ژێر کاریگەری یەکێکیان بە گشتی و هەمە لایەنە.





## مەدرەسەکانی تەفسیر

ئێمە دەبینین بۆ تەفسیری قورئانی پیرۆز چەندین مەدرەسە هەیە کەوایان کردوە بە شـــێوازی جۆراو جۆر لە قورئـانی پیرۆز بەهرەمەنـد بین، کە هەر بە خێرایی ئاماژە بە سەرەکی ترینی ئەو مەدرەسانە دەکەین ناچینە ناو وردەکاری و تـایبەتمەنـدی و ئەرێنی و نەرێنیـان، ئەمە بۆ خوێنەری بەڕێز جێـدەهێڵم، چونکە ئەم تەوەرە کورتە ناتوانێ ماف بەم بوارە فراوانە بدا:

**یەکەم تەفسیری قورئان بە قورئان**: گومان لەوەدا نیە کە قورئانی پیرۆز وتەی خوای گەورەیە بە وشەو بە واتاوە، وە موتەواتیرە، وە هیچ دژبەیەک و ناڕاستیەکی تێدا نیە، بۆیە ئەم جۆرە تەفسیرە ناچێتە ناو بازنەی مەدرەسەکانی تەفسیر بەڵام ویستم بۆ بەرەکەت لە سەرەتا دایبێنم، کە دیارە ڕاسترین جۆری تەفسیری قورئانی پیرۆزە، بۆیە دەبینین بابەتێک لە شوێنێک باسکراوە لە چەندین شوێنی تر بە ئامانجی ترو ئوسلوبی تر دووبارە دەبێتەوە، چ باسی بیروباوەڕبێ، چ باسی پێغەمبەران بێ، چ باسی پەرستشەکان بێ، چ باسی قیەم و بەها باڵاکان بێ، چ باسی ئەحکام بێ، چ باسی حەزارەت و ژیانی خراپ و چاکەکان بێ .

دەبینین باسی موسا لە زۆر شوێنی قورئاندا هاتوە هەم لە سورەتی مەکی هەم لە سورەتی مەدەنی، لە قۆناغی مەکی کە هێشتا جولەکەیان لە گەڵدا ناژین بەلام بۆ ئەوەی ئامادەگی فیکری و زانستی و روحیان بەرامبەر ئەو گروپە هەبێ لە ژیانی پێغەمبەرداو لە ژیانی مێژوی ئیسلامیداو هەتا ئێستاشی لەگەڵدابێ سەرسەخترین نەیاری ئەم دینەن، وە لە قۆناغی مەدینەشدا کە باسیان کراوە بۆ ئەوەیە مسوڵمانان بە کردەیی چۆن بتوانن ڕووبەڕوویان ببنەوەو بە چۆکیان دابێنن وەک پێغەمبەری ئیسلام و ئەبوبەکرو عومەرو چەندین سەرکردەی وەک سەلاحەدین کردیان. بێجگە لەوەش قورئانی پیرۆز جاری وایە ڕاستەو خۆ ئایەتەکان تەفسیر دەکات بۆ وێنە: إِنَّ ٱلْإِنسَـٰنَ خُلِقَ هَلُوعًا (المعارج: ١٩) بێگومان





ئادەمی دروست کراوە بە چاو چنۆکێکی تەنگەتیلکە. وشەی(هلوع) خۆی ڕوونیدەکاتەوەو دەفەرموێ: إِذَا مَسَّهُ ٱلشَّرُّ جَزُوعًا (المعارج: ﴿٢٠﴾) کە ناخۆشی یەکی تووش ببێ هاوارو ناڵە دەست پێ دەکات. وَإِذَا مَسَّهُ ٱلْخَيْرُ مَنُوعًا (المعارج: ﴿٢١﴾) کە سامانیش ڕووی تێ بکات ئەی گرێتەوە لە خەڵکی. وەک لە شوێنێکی تردا وەسفی بەندە ڕاستەقینەکانی دەکاو دەفەرموێ: قُلْ أَؤُنَبِّئُكُم بِخَيْرٍ مِّن ذَٰلِكُمْ لِلَّذِينَ ٱتَّقَوْا۟ عِندَ رَبِّهِمْ جَنَّـٰتٌ تَجْرِى مِن تَحْتِهَا ٱلْأَنْهَـٰرُ خَـٰلِدِينَ فِيهَا وَأَزْوَٰجٌ مُّطَهَّرَةٌ وَرِضْوَٰنٌ مِّنَ ٱللَّهِ وَٱللَّهُ بَصِيرٌۢ بِٱلْعِبَادِ (آل عمران: ﴿١٥﴾) بڵێ: خەبەرتان بدەمێ بەباشتر لەمانەتان بۆ ئەوانەی کە پارێزیان کرد لای پەروەردگاریان چەند بەهەشتێک هەیە کە بەژێر درەختەکانیاندا دەڕوات ڕووبارەکان بەئێجگاری تێدا دەمێننەوە، وە(بۆیان هەیە) ژنانی پاکیزە، وە ڕەزامەندی لە خواوە، وە خوا بینایە بە بەندەکان.

ئەوجار بەبێ واوی عەتف تەفسیری وشەو مانای(العباد) دەکاو دەفەرموێ: ٱلَّذِينَ يَقُولُونَ رَبَّنَآ إِنَّنَآ ءَامَنَّا فَٱغْفِرْ لَنَا ذُنُوبَنَا وَقِنَا عَذَابَ ٱلنَّارِ (آل عمران: ﴿١٦﴾) لە خوا ترسان ئەوانەی کە دەڵێن ئەی پەروەردگارمان بەڕاستی ئێمە بڕوامان هێنا دەی خۆش ببە لە گوناهەکانمان وە بمان پارێزە لە سزای ئاگری دۆزەخ. ٱلصَّـٰبِرِينَ وَٱلصَّـٰدِقِينَ وَٱلْقَـٰنِتِينَ وَٱلْمُنفِقِينَ وَٱلْمُسْتَغْفِرِينَ بِٱلْأَسْحَارِ (آل عمران: ﴿١٧﴾) ئەوانە بریتین لە ئارام گران و ڕاستگۆیان و فەرمانبەران و دارایی بەخت کەران و ئەوانەی کە داوای لێ خۆشبوون دەکەن لە پێش بەیانیان دا.

وە نمونەی ئەوامان زۆرە لە قورئانی پیرۆز ئەوە بێجگە لەوەی هەمووی بەیەک دەچێ لە ڕووی ئیعجازو لە جێی و بەهێزی و ڕەوانبێژی و کاریگەری و جوانیدا.

**دووەم تەفسیری قورئان بە سونەت**: ئەمە جۆری دووەمی تەفسیرە، چونکە پێغەمبەری خوا بە گوفتارو ڕەفتار قورئانی پیرۆزی ڕوونکردۆتەوە، ئەگەر





تەشریفیان نەبا نەماندەزانی چۆن نوێژبکەین یان زەکات و ڕۆژو حەج و دروشمەکانی دین جێبەجێ بکەین، بۆیە نابێ گومان لە وە بکەین کە پێغەمبەر یەکەم موفەسیری قورئانی پیرۆز بوەو ئەرکی ڕوو کردنەوەی قورئانی پێ سپێردراوە، وەک خوای گەورە دەفەرموێ: وَأَنزَلْنَآ إِلَيْكَ ٱلذِّكْرَ لِتُبَيِّنَ لِلنَّاسِ مَا نُزِّلَ إِلَيْهِمْ وَلَعَلَّهُمْ يَتَفَكَّرُونَ (النحل: ﴿٤٤﴾)

**سێیەم تەفسیر بە ریوایەت یان تەفسیر بە مەئسور**: ئەم جۆرە هەردوو جۆرەکەی تریش دەگرێتەوە، بەڵێ کۆمەڵێک تەفسیرمان هەن بەوە ناسراوون وەک:

- ✓ تەفسری تەبەری: جامع البيان عن تأويل آى القرآن
- ✓ تەفسیری ئیبن کەسیر: تفسير القرآن العظيم
- ✓ تەفسیری سیوتی: الدر المنثور...

دەتوانرێ لە میانەی ئەو تەفسیرانە تەفسیری قورئان بە قورئان و قورئان بە سونەت و قورئان بە راڤەی هاوەڵان و شوێنکەوتوان دەست بخەین، وە هەروەها دەتوانرێ بواری رەئی و تێرامان لە م تەفسیرانە وەرگرین ئەمە زۆر جوان لە کاتی موناقەشەی بابەتەکان هەست پێدەکەین کە چەند توانیویانە رەئی و بۆچونی خۆیان بڵێن.

مەدرەسەی سێیەم تەفسیر بە ڕەئی دیارە مەبەست لەوە نیە کە بە بۆچونی خۆی ڕاڤەی قورئان بکاو گوێ بە دەلیلەکانی تر نەدا، بەڵکو مەبەست ئەوەیە تا ڕاددەیەکی باش بیری خۆی تێدا بەکارهێناوەو تەواو بیری لێکردۆتەوەو هەوڵی داوە شتی جوان دەست بخات، نمونەی ئەم تەفسیرانە وەک:

- ✓ التفسير الكبير / للامام الرازي
- ✓ روح المعانى /للآلوسى
- ✓ التحرير والتنوير/ لإبن عاشور...





ئەم تەفسیرانە دەشتوانین ناویان بنێین تەفسیرە گشتگیرەکان، چونکە ریوایەتی تێدا، رەئی و کەلام و فەلسەفەو تەسەووف و زمانەوانی و فقە و بەیان و زۆر شتی تریش،

**مەدرەسەی چوارەم تەفسیری بەیانی و نە حوي**: ئەم جۆرە لە تەفسیر زیاتر گرنگی بە لایەنی نەحوی زمانەوانی ڕەوانبێژی دەداوەک تەفسیری:

- ✓ تفسير الجلالين
- ✓ تفسير البيضاوي
- ✓ تفسير النسفي
- ✓ تفسير الكشاف
- ✓ تفسير البحر المحيط/ لأبي حيان الاندلسي...

وە ئەم بابەتانە لە زۆر لە تەفسیرەکان باسکراون بەڵام ئەوانە زیاتر گرنگیان بەو لایەنە داوە، هەڵبەتە تەفسیری کشاف کەمێک کەمتر لەوانی تر.

**مەدرەسەی پێنجەم مەدرەسەی فیقهی**: ئەم جۆرە تەفسیرە زیاتر بوارە فقهیەکان ڕووندەکاتەوە وەک:

- ✓ الجامع لأحكام القرآن /للقرطبي المالكي
- ✓ أحكام القرآن /لإن العربي المالكي
- ✓ أحكام القرآن/ لجصاص الحنفي
- ✓ فتح القدير / للشوكاني...

تە فسیری تریش زۆرن بەڵام ئەو دووانە زۆر گرنگیان بە لایەنی فیقهی داوە دەنا شتی تریشیان باسکردوە.

**مەدرەسەی شەشەم تەفسیری ئیشاری**: تەفسیری ئیشاری ئەم جۆرە لە تەفسیر زۆر گرنگی بەلایەنی تەسەوف و تەزکیە دەدات، لە دیارترینی ئەو تەفسیرانە:





تفسير لطائف الاشارات/ للقشيري ...

که زۆربەی کات دەیەوێ شتێکی تر بە ئێمە بڵێ جیا لە ڕواڵەتی ئایەتەکە، مەرج نیە ئەمە هەموو کات ڕاست بێ، شتی زۆر جوانی تێدا بەڵام شتی ناواقعی و ناڕاستیشی زۆر تێدا.

**مەدرەسەی حەوتەم مەدرەسەی عەقائیدی و کەلامی**: مەبەست لەو تەفسیرانەیە کە خاوەنەکانیان تەمسیلی مەزهەبی کەلامی دەکا بۆ نمونە:

- ✓ تفسير الماتريدي المسمى بتأويلات أهل السنة
- ✓ مفاتيح الغيب کە زۆر تەمسیلی عەقیدەی ئەشعەری و ئەهلی تەئویل دەکا
- ✓ تفسير تنزيه القرآن عن المطاعن /قازی عبد الجبار المعتزلی، کە ئەم تەفسیرە تەواو تەمسیلی عەقیدەی موعتەزیلە دەکا
- ✓ تفسير الكشاف کە نوێنەرایەتی مەزهەبی موعتەزیلە دەکا

**مەدرەسەی هەشتەم مەدرەسەی شیعە:** کە دیارە مەزهەبی شیعە خاوەنی تەفسیری زۆرە لە کۆن و تازەدا، هەم تەفسیری ریوائی، هەم تەفسیر بە رەئی، هەم تەفسیری زمانەوانی و بەلاغی، هەم ئیشاری و تەسەوفی، هەم زانستی و کەلامی

## مەدرەسەی تەفسیری هاوچەرخ

لە سەدەی ڕابردو هەتا ئێستا مەدرەسەی تریش بۆ تەفسیر پەیدا بوە کە گرنگی خۆیان هەیەو دەبێ لێیان ئاگادار بین چونکە بەواقعی هاوچەرخ و شێوازی زانسیانەو نوێگەراییانە ڕاڤەی قورئانی پیرۆزیان کردوە دەتوانین ئاماژە بە هەندێک لە تەفسیرە هاوچەرخەکان بکەین لەوانە:





- التحرير والتنوير/ لإبن عاشور ، تەفسیرێکی گەورەی گشتکیرە زۆر جێگای سود لێبینینە، وە ئیبن عاشور بە نوێکەرەوەی زانستی مەقاسید دادەنرێ لە سەردەمی نوێدا، بەڵام هەموو کەس لێی سودمەند نابێ مەگەر ئەوانەی تەواو لە زانستە ئیسلامیەکان شارەزابێ چونکە زۆر تەفەنونی تێدا کردوە.

- محاسن التأويل/ لمحمد جمال الدين القاسمى/ بەهەمان شێوە تەفسیریکی گشتگیرە و زۆر جێگای سود لێوەرگرتنە.

- صفوة التفاسير/ لمحمد على الصابونى، تەفسیرێکە تەنیا سێ بەرگە بەڵام زۆر پڕ زانستە گرنگی بە ناساندنی سورەت و ئامانجەکان و موناسەبە و سەبەب نزول و نەحو بەلاغە داوە، بۆیە لە زۆر زانکۆو مەعهەد کراوەتە مەنهەج لەبەر پوختی و گرنگی.

- تفسير المنار/ نوسراوی محمد رەشید رەزایە، کە تەواوی قورئانی تەفسیر نەکردوەو هەتا بەشێک لە سورەتی یوسفی تەفسیر کردوە بەڵام تەواوی نەکردوە، بەڵام بەراستی تەفسیرێکە وردەکاری زۆری تێداکراوە کە تێیدا بەشێوەی سەرەکی تەفسیری مامۆستاکەی محمد عەبدە دەگوازێتەوە، بەڵام لە بەر ئەوەی قەناعەتی زۆری بە بۆچونەکانی هەبوە وەک تەفسیرێک مامەڵەی لە گەڵدا دەکرێ، کە بەراستی تەفسیرێکی ئەدەبی و زانستی و کۆمەڵایەتییە.

- تفسير المراغى/ لأحمد مصطفى المراغى: تەفسیرێکی زۆر زانستی و جوانە لێکدانەوەی وشەکان، مانای پوختەکەی، دواتر بە درێژی دواتر ئیرشادات و ڕێنوێنیە گشتیەکان.

- أيسر التفاسير/ لأبى بكر الجزائيرى: ئەویش هەر لە سەر شێوازی تەفسیری المراغى یە بەڵام پاندە بە مەنهەجی ئەوەی ناویان لێناوە سەلەف.





- تسیر الکریم الرحمن /عبد الرحمن بن ناصر السعدی: کە پێشەکیەکی زۆر جوان و درێژی نوسیوە بۆ تێگەیشتن لە قورئانی پیرۆز، وە تەفسیرێکی پوخت و خاوێنی کردوە و زۆر جێگای سودوەرگرتنە بە تایبەت بۆ ئەوانەی تازە دەیانەوێ فێری تەفسیربن، دیارە تەفسیری أیسر التفاسیریش هەمان تایبەتمەندی هەیە بۆ ئەوانەی کە تازە تەفسیر دەخوێننەوە.
- تفسیر الشعراوی/لمحمد متولی الشعراوی: بەراستی تەفسیرێکی زۆر پڕ وردەکاری و خەواتیرە وەک بۆخۆی وای پێدەڵێ، تەفسیرەکەی ویش هەمە لایەنە بەڵام دەتوانین بڵێین زۆر ویستویەتی تەواو ژیری خۆی تێدا بەکار بێنێ بۆ تێگەیشتن لە ئایەتەکان
- الکنز الثمین/ لإبن عثیمین: تەفسیرێکی زۆر پر وردەکارییە، لەتائیفی زۆری تێدا لە کۆتایی هەر بابەتێک سودەکان کۆدەکاتەوە کە زیاتر لە ٤٥ هەزار سودی نوسیوە هەڵبەتە دووبارە بونەوە لەو تەفسیرەدا زۆرە.
- التفسیر المنیر/ لوهبة الزحیلی، ئەویش یەکێکە لەو تەفسیرە گشتگیرانە کە جێگای سود لێوەرگرتنە، لەم تەفسیرەدا مانای زمانەوانی، ئیعراب، ڕەوانبێژی، ئەحکام، پوخت کردنەوە، گونجان هەموو ئەو بابەتانە بە رونی دەبینی.
- تفسیر النابلسی/ لمحمد راتب النابلسی/ تەفسیرێکی زۆر زانستیە بەتایبەت لە بابەتی زانستی سەردەم زۆر جێگای سودە بەراستی لەتائیفی زۆر جوانی تێدا.
- فی ظلال القرآن/ لسید قطب: من دەتوانم بڵێم تەفسیرێکی تایبەتە لە جۆری خۆی تا ئێستا لەو ئوسلوبە وێنەی نیە، وە زۆر مەنهەجی حەرەکییە، وەزۆر کاریگەرە، زەوقی ئەدەبی و ئیمان و شانازیکردن و تەحەدا تەواو دەست لە ملانی یەکن لەو تەفسیرەدا، وە مانای وا نیە هیچ کەم و کوری





تێدا نیە بەڵام سەید توانیویەتی فیکرەو مەزهەب و ئایدیاکانی سەردەمی خۆی تەواو بناسێنێ و وەڵامیان بداتەوە. وە لە هەمان کاتدا تەفسیرێکی بابەتیە چونکە هەوڵی داوە ئەو بابەتانەی پەیوەستن بە یەکەوە لە پەنا یەک باسیان دەکا، وە تەفسیرێکی مەقاسیدیە چونکە لە سەرەتا هەوڵدەدا ئامانجە گشتیەکانی سورەتەکە باس بکا، بە داخەوە ئەم تەفسیرە بە ناحەق زۆر دژایەتی دەکرێ و قسەیی پێ دەوترێ، بەڵام ( عندالله تجتمع الخصوم) با لە خزمەتی خوا ئەو هەق و حیسابە بکرێ.

دیارە تەفسیر یەکجار زۆرن وەک ئەوەی سید تەنتاوی، ئەوەی تەهماز ئەوەی محمود حجازی وە مواهب الرحمن مامۆستای مودەریسی بەڵام ناکرێ هەموویان بوترێن، ئەوەی من باسیان دەکەم هەڵسەنگاندن نیە بە قەدەر ئەوەی کە ئاگادار بونە لێ یان بۆ سود وەرگرتن، زۆر جار براو خوشکان پێمان دەڵێن چ تەفسیرێک بخوێنینەوە با ئەوەی باسمانکرد ڕێنمایی بێ بۆ ئەوان،

## التفسير الحداثي

تەفسیری حەداسی یان علمانی بۆ قوڕئانی پیرۆز ئەم مەدرەسە دەتوانین بڵێین لە دیارترینی موحەمەد شەحرور ، ئەراکۆن، ونەسر حامد ئەبو زەیدو ... دیارە ئەو مەدرەسەیەش ئەرێنی و نەرێنی تێدایە، بەڵام زۆربەی کات لایەنی سلبی نەرێنیان زاڵە بەسەر لایەنی ئیجابی ئەرێنی، بۆیە ئەو کەسەی کتاب و تەفسیری ئەو جۆرە کەسانە دەخوێنێتەوە دەبێ زۆر وریا بێ چونکە ئەو کەسایەتیانە دەیانەوێ:

- ✓ ڕابردو بە هەموو شێوەیەک پشتگوێ خەن و چاویان تەنیا لەسەر ئێستا بێ، ئەمە ڕاستی تێدا بەڵام مێژوی قورئان مەنهەج و دینە نەوەک وەک محمد شحرور دەڵێ تەنیا بۆ پەند لێوەرگرتنە نەوەک ئەحکام لێوەرگرتن.





- ✓ دەیانەوێ بە یەکجاری پشت لە تەفسیری پێشینان بکەین.
- ✓ دەیانەوێ هەموو شتێک لە چوارچێوەی زانست و ژیری ڕاڤە بکەن هەتا قوڕئانیش.
- ✓ دەیانەوێ قودسیەت لە دین بستێننەوە.
- ✓ دەیانەوي مەشروعی فەرمودە بە تەواى پشتگوێ بخەن.
- ✓ دەیانەوێ تەقدیسی مرۆڤ و عەقڵی مرۆڤ بکەن.
- ✓ کار گەیوەتە ئەوەی کە بڵێن قورئان ڕەنگدانەوەی سەردەمی خۆیەتی.
- ✓ هەندێکیان دەڵێن قورئان وتەی خوا نیە، بەڵکو وتەی محمدە خوای گەورە پشتیوانی و تەئییدی دەکات...

وە زۆر شتی تریش کە ئەوانەی باسمانکرد هەندێکیانن، من لە گەڵ ئەوەشدا کە موتابعەی هەندێکیانم کردوە شتی جوانیشیان نوسیوەو وتوە نابێ بێ ئینساف بین عەرەب دەڵێ(الانصاف خیر الاوصاف).

## تەفسیرە کوردیەکان

دیارە ئێمە بە زوبانی شیرینی کوردی کۆمەڵێک تەفسیرمان هەیە کە بەراستی دەوری گرنگیان هەبوە لە هۆشیاکردنەوەی گەلی کورد نابێ دەوریان بە کەم بزانین، هەندێکیان دەگەڕێنەوە بۆ سەدەی ڕابردو وەک تەفسیری:

- ✓ مەلای گەورەی کۆییە
- ✓ تەفسیری خاڵ
- ✓ تەفسیری مامۆستا عوسمان
- ✓ تەفسیری نامی
- ✓ تەفسیری ڕامان
- ✓ تەفسیری هەژار





وە دواتریش کۆمەڵێک تەفسیری تر هاتنە کایەوە وەک تەفسیری مامۆستا علی باپیر کە خەریکە هەمووی بەچاپ دەگا کە نزیکەی ٣٠ بەرگە، تەفسیری ڕەوان، مەلا محمد گەلاڵی پوختەی تەفسیر محمد بامۆکی، دیارە تەفسیری تریش زۆرن.

ئێمە دەبێ جیاوازی لە نێوان تەرجومەو تەفسیردا بکەین لەئێستادا تەرجومەی زۆر پەیدا بوون بەڵام ئەوانە ناتوانن تەواو ڕاڤەی قوڕئان بکەن بەڵام سودیان لێدەبینرێ بەڵام ناتوانرێ لە ڕێی ئەو تەرجومانەوە تەواو بەهرەمەند بین لە قورئان،

تەفسیرە دیارەکەی تەفسیری مەلای گەورە: تەفسیری کوردی لە کەلامی خوداوەندی ئەم تەفسیرە ١٠ بەرگە هەرچەندە بە زوبانی ئەوکات نوسراوە بەڵام هەتابڵێی تەفسیرێکی بەهێزو پڕماناو پوختە، وە نوسەر هەتا ئەوپەر ئازادو ئازا بوە زۆر ئاگاداری سەردەمی خۆی بوە بۆچونەکانی خۆی بە روونی وتوە رەخنەی لە زانایانی کۆن و مەلای سەردەمی خۆی زۆر بە باشی گرتوە زۆر بە فیکرەی موعتەزتلەو زانستی نوێ کاریگەر بوە زۆر جوان ئایەتەکانی بە یەکەوە بەستۆتەوە تا ئێستا چەندین ریسالەی ماستەرو دکتۆرای لە سەر هاتۆتەوەو هێشتا زۆریشی ماوە سودی لێوەربگیرێ.

تەفسیری مامۆستا عوسمان: تەفسیری قورئانی پیرۆز تەفسیرێکی گشتگیرییە خوێندنەوەی خۆش و کاریگەرە هەست دەکەی کاریگەری فی ظلال ی تەواو بەسەرەوە هەیە بەڕاستی لە کاتی خۆی وە ئێستاش دەوری باشی هەبو وە هەیە.

تەفسیری نامی: مامۆستا عبد الكريمی مودەریس لە شەش بەرگا چەندین جار چاپ کراوە زۆر ڕوونە لایەنی فیقهی تەواو گرنگی پێداوە زۆر پابەند بوە بە بۆچونی زۆربەی موفەسیرەکان زۆر رەچاوی یان دەتوانین بڵێین بە تەواوی رەچاوی مەزهەبی شافعی کردووە لە بواری فیقهیدا.





تەفسیری خاڵ: ئەم تەفسیرە چەند جوزئێکی چاپ کراوە و هەمووی تەواو نەکراوە بەداخەوە، تەفسیرێکی تەواو زانستی و عەقلانی و کوردیەکی زۆر رەوانە وە ئایەتەکان زۆر بە وردی بەیەکەوە دەبەستێتەوە زۆر جێگای تێرامان و سود لێوەرگرتنە.

تەفسیری رەوان: تەفسیرێکی گشتگیرییە سەرەباسەکانی داناون و وردەکاری تێدا کردوە، کوردیەکی ڕەوانە.

تەفسیری رامان: مامۆستا ئەحمەد کاکە محمود تەفسیرێکی مام ناوەند زۆر پوخت و خاوێن و بێ زیادە، زمانێکی خۆشی هەیە،

تەفسیری قورئانی پیرۆز: مامۆستا علی باپیر تەفسیرێکی وردو درێژ لە تەفسیرە هەمەلایەن و گشتگیرەکانە زۆر زانستی عەقڵی تەرجیحدان ڕەنگدانەوەی واقعی ئێستای ئایدیا و مەزاهب و بۆچونە جیاوازەکان وردەکاری زۆری لە هەندێک بابەتی پێویست کردوە ڕاڤە کردنی وشە ، رستەکە، بە پوختی، دواتر بە درێژی، دواتر بە جیا باسکردنی بابەتە پێویستەکان تەفسیرێکی بابەتیانە تەفسیرێکی مەقاسیدیانە بە بۆچونی خۆم لە هەموو تەفسیرە کوردیەکان فراوانترە بەڵام ئەگەر پوختتر بکرێتەوەو هەندێک شتی دووبارەی لێ لاببردرێ زۆر بە سودتر دەبێ خوای گەورە پاداشتی هەموویان بداتەوەو بۆیان بکاتە توێشوی قیامەتیان ئەم تەوەرە کەمێک بوو لەسەر جۆرەکانی تەفسیرو مەنهەجی ڕاڤەکاران بە هیوای نزای بە خێرو سود بینین و ڕاستکردنەوەی هەڵەکان.





## کۆتایی

لەم تەوەرانەی کە وەک پێشەکیەک نوسیومە بۆ تێگەیشتن لە ماناو مەبەستی قورئانی پیرۆز بەم فیکرەو مەبەستانە گەیشتم:

- ❖ پایەو پێگەی قوڕئانی پیرۆز بێکۆتاییە.
- ❖ گرنگی زیاتر بدرێ بە تێگەیشتن لە قورئانی پیرۆز، لە ئێستادا زیاتر لە سەر جوان خوێندنەوەی قورئان و لە بەرکردنی کار دەکرێ.
- ❖ دەبێ زۆر گرنگی بدرێ بە ئامانجە گشتی و تایبەتیەکانی قوڕئانی پیرۆز.
- ❖ دەبێ هەوڵ بدرێ قوڕئان بخرێتە بواری جێبەجێکردن و فریادڕەس بێ بۆ مرۆڤی ئەم سەردەمە.
- ❖ دەبێ ئێمە ئەوە بزانین کە قوڕئان زیاتر لە شێوەی بنچینەو کولیاتە، نابێ ئەمە فەرامۆش کەین.
- ❖ قوڕئان یەکەم سەرچاوەو بەرنامەی بێ چەندوچونی ژیانە، بەڵام سەرچاوەکانی تر وانین.
- ❖ دەبێ لە کاتی تێکگیرانی قوڕئان لە گەڵ هەر سەرچاوەیەکی تر گومانمان نەبێ لە ڕاستی و دروستی قوڕئان، وە بێ دوودڵی دەستبەرداری سەرچاوەکانی تر دەبین، مادام پێکەوە ناکۆک و دژ بەیەک بن.
- ❖ تەفسیری قوڕئان بە کۆتا نەگەیشتوە هێشتا مانای زۆر هەڵدەگرێ بە تایبەت لە بواری زانستی و مامەڵە بە هەموو بوارەکانییەوە.
- ❖ قوڕئان لە بواری بیرو باوەڕو بەندایەتی و ئەخلاق خاڵی لەسەر پیت داناوە، کاری ئێمە لێرەدا جوان جێبەجێکردن و خزمەت کردنییەتی، وە بەو هۆکاو ئامرازانەی کە لە بەردەستماندان زیاتر فەلسەفەو لایەنە زانستیەکان و جوانیەکانی بەدەر بخەین.
- ❖ بۆ بابەتە زانستیە ڕووتەکان گەڕانەوە بۆ سەرچاوەی پێشینان هەڵەیەو ستەمە لە قوڕئانی پیرۆز.





- ❖ به پاک و پیرۆز دانانی ڕاڤەی زانایانی پێشوو ستەمێکی گەورەیە لەم پێشینە بەڕێزانە بێجگە لە ڕاڤەی خوا بۆ قورئان و ڕاڤەی پێغەمبەری پێشەوامان بە سونەت و سیرەتی سەحیح و سەریح.
- ❖ دەبێ ئاگادار بین لە مەدرەسە جیاوازەکانی قورئانی پیرۆز دەکرێ سود لە هەموویان وەربگرین.
- ❖ گومان لەسەر قورئان زۆر دەوەروژێنرێ لە لایەن جولەکەو گاورو شاگردە مولحیدەکانیانەوە، دەبێ بەدەستێک تارمایی و تەپ و تۆزی گومانەکانی ئەوان بسڕینەوە، بە دەستەکەیتر بەسەرو گوێلاکیاندا بکێشین و ڕەخنەی جیدیان لێبگرین، چونکە دەرکەوتوە بە کردەوەیی سیکۆلارزم و ئیلحاد بێخێرترین و داوەشاوترین پەیرەوی هەبوەو زۆرترین زیانی بە مرۆڤایەتی بە گشتی و مسوڵمان بە تایبەتی و گەلی کورد بەتایبەتیتر گەیاندوە.
- ❖ من هەوڵم داوە بە سودوەرگرتن لەسەرچاوکان و بیرکردنەوەی خۆم ئەوەی پێم باشبوە پێشکەشی خوێنەری کوردی مسوڵمانی بکەم، وەە دڵنیاشیم بێ کەم و کوڕی نییە، بۆیە ئەوەی کە ڕاستە سوپاسی خوای لەسەر دەکەم، ئەوەش کە هەڵەیە لێی پەشیمانم، وە سوپاسی هەر کەسێک دەکەم هەڵەکانم بۆ دەکا بە دیاری و بۆمی دەنێرێ.

وآخر دعوانا أن الحمد لله رب العالمين






سەرچاوەکان دوای قورئانی پیرۆز

- صحيح البخارى
- صحيح مسلم
- سنن أبوداود
- سنن الترمذى
- مسند أحمد
- نبوة محمد من الشک الى اليقين/ دکتور فسضل السامرائى
- براهين النبوة/ سامى عامرى
- مناهل العرفان فى علوم القرآن/ للزرقانى
- الرسول/ سعيد حوى
- مختار الصحاح / لأبي بكر الرازي
- تلخيص الذهب من لسان العرب/ لمحمد حسين الحسين الجلالي
- المصباح المنير / للفيومي
- مفردات ألفاظ القرآن/ للراغب الاصفهاني
- المعجم الوسيط / لجنة من العلماء
- قاموس المعاني
- مدخل الى دراسة الاعجاز العلمى/ زغلول راغب م٩مد النجار
- الاعجاز العلمى فى القرآن والسنة/ نايف منير فارس
- موسوعة الاسلام كما يتجلى فى كياب الله / على باپير







- إعجاز القرآن البيانى/ صلاح عبد الفتاح الخالدى
- آفاق الاعجاز الرفمى فى القرآن الكريم/ عبد الدائم الكحيل
- الاعجاز العددى فى القرآن الكريم/سعيد صلاح الفيومى
- المصباح المنير : احمد بن محمد بن على الفيومى
- تلخيص الذهب من لسان العرب/ محمد حسين الحسينى الجلالى
- مفردات ألفاظ القرآن /للراغب الاصفهانى
- المعجم الوسيط/ لجنة من العلماء
- مناهج المفسرين/ الدكتوّر مساعد مسلم آل جعفر تعريف الدارسين بمناهج المفسرين/ الدكتوّر صلاح عبد الفتاح الخاليدى
- التفسير والمفسرون فى العصر الحديث/ عبد القادر محمد صالح
- مناهل العرفان / للزرقانى
- إتقان البرهان فى علوم القرآن / فضل حسن عباس
- مجلة ديالى/ العدد الثالث والخمسون /أيوب إبراهيم






## پێڕست





